کاوەی بەیات

# خۆرهەڵاتی کوردستان
# لە
# بەڵگەنامەکانی وەزارەتی ناوخۆی ئێراندا

تایبەت بە یەکەمین جەنگی جیهانی
ڕێکخراوی بەڵگەنامە نیشتمانییەکانی ئێران
ناوەندی لێکۆڵینەوە
1381 - هەتاوی

وەرگێڕانی
مستەفا غەفوور



# خۆرهەڵاتی کوردستان

# لە

## بەڵگەنامەکانی وەزارەتی ناوخۆی ئێراندا

## تایبەت بە یەکەمین جەنگی جیهانی

## ئۆرگانی بەڵگەنامە نیشتمانییەکانی ئێران

## ناوەندی لێکۆڵینەوە ـ ١٣٨١ هەتاوی

کاوەی بەیات

# خۆرهەڵاتی کوردستان
# لە
## بەڵگەنامەکانی وەزارەتی ناوخۆی ئێراندا
## تایبەت بە یەکەمین جەنگی جیهانی
## ئۆرگانی بەڵگەنامە نیشتمانییەکانی ئێران
## ناوەندی لێکۆڵینەوە ـ ١٣٨١ هەتاوی

وەرگێڕانی

مستەفا غەفوور




هەولێر - ٢٠١٣



**خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوەی**

● **خۆرهەڵاتی کوردستان لە** **بەڵگەنامەکانی وەزارەتی ناوخۆی ئێراندا، تایبەت بە یەکەمین جەنگی جیهانی، ئۆرگانی بەڵگەنامە نیشتمانییەکانی ئێران، ناوەندی لێکۆڵینەوە ـ ١٣٨١ هەتاوی.**

● **کاوەی بەیات**

● **وەرگێرانی: مستەفا غەفوور**

● نەخشەسازی ناوەوە و بەرگ: **رێدار جەعفەر**

● نرخ: (٤٠٠٠) دینار

● چاپی یەکەم: لەگەڵ چەند بەڵگەنامەی تر ٢٠١٣

● تیراژ: ٥٠٠ دانە

● چاپخانە: **موکریانی (هەولێر)**

● **لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (٢٣٢) ساڵی(٢٠١٣)ی پێ دراوە.**

**زنجیرەی کتێب (٧٤٧)**



**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com

**ئیمەیل:** info@mukiryani.com

مستەفا غەفوور: Mustafa.ghafour@gmail

# ناوەڕۆکی بابەتەکان

## بۆ ڕێڕوونی:

خوێنەری بەڕێز، ئەم کتێبەی لەبەر دەستت دایە، کۆمەڵێك نامەی فەرمین کە لە جەنگی یەکەمی جیهانی دا، لە نێوان حکومەتی ناوەندی ئەوسای ئێران و ویلایەتەکانی ئێراندا، بە **تێلگراف** ئاڵوگۆڕ کراون. بەشێك لەو نامانە تایبەتن بە ڕۆژهەڵاتی کوردستان، کە ئەو کاتە چەند ویلایەتێکی ئێران بووە. ئامادەکاری ئەم کتێبە، ئەو نامانەی لە بەشی بەڵگەنامەکانی ڕۆژئاوای ئێراندا پۆلێن کردووە. بەندەش دوای گەڕان بە ناو دەقە فارسییەکەدا و وردبوونەوە لە نامەکان، بۆم دەرکەوت ئەو نامانەی تایبەتن بە ویلایەتەکانی باکوور، باشوور و ڕۆژهەڵاتی ئێران، شتێکی ئەوتۆیان بۆ خوێنەری کورد تێدا نییە جێگای سەرنج بێت و لە ڕووی مێژوویی و سیاسیشەوە بۆ کورد بێ بایەخن، لەبەرئەوە تەنیا ئەو نامانەم کردووە بەکوردی، کە تایبەتن بە ویلایەتی ڕۆژئاوای ئێران واتە خۆرهەڵاتی کوردستان، کە بە حکومەتی کرماشان، حکومەتی کوردستان، حکومەتی هەمەدان و حکومەتی گەڕووس ناوییان هاتووە. دیارە ئەو کاتە هاوشێوەی سیستمی ئیمپراتۆری عوسمانی یا ئیمپراتۆرییەکانی تر، هەر ویلایەتێك ئیدارەیەکی خۆبەڕیوەبەری هەبووە و، تەنیا لە هێندێك بواری گشتیدا وەك، ئابووری، بەرگری و فێرکردن.....هتد پەیوەست بوون بە حکومەتی ناوەندی.

خوێنەر لە خوێندنەوەی بەڵگەنامەکاندا، لە زۆر شوێن دا ڕستەی نابەجێ و ناڕێك، لە ڕووی ڕەوانی و ماناوە بەدی دەکات. لە ڕاستیدا، جگە لە زمانی پیاهەڵدانی لە ڕادەبەدەر، ئەو بەڵگەنامانە بە زمانێکی فارسی نزیکەی یەك سەدە لەمەوبەر نووسراون و لەو تێلگرافە ڕەمزیانەی ئەو سەردەمە وەرگیراون، کە تاکە ڕایەڵکەی پەیوەندی و ئاڵوگۆڕی نووسراوە فەرمی و نهێنی ئۆرگانەکانی دەوڵەتی ئێران بوون. بۆیە وەك ئامادەکاری بەڵگەنامەکانیش ئاماژەی پێکردووە، لە زۆر شوێن واژە و دەستە واژەکان نەتوانراوە بخوێنرێنەوە و زۆر زاراوە هەن بە مانای جیاواز لە مانای ئەمڕۆ بەکار هاتوون وەك: استعداد، اتصالا، عجالتا و... هیتر. جگەلەوە، ئەو بەڵگەنامانە تێلگرافن بە زمانی مۆرس ئاڵوگۆڕ کراون، کە ئامادەکار دەقە سەرەکییەکانی بە هیچ شێوەیەك لە دووتوێی فارسییەکەدا نەخستۆتە ڕوو، ئەمەش بۆ

کتێبی بەڵگەنامەیی نەك هەر پێویستە بەڵکو نەبوونیان بە کەم و کوڕی دادەنرێ، بەڵام لەبەرئەوەی لە ئۆرگانێکی فەرمی سەر بە وەزارەتی ناوخۆی دەوڵەتی ئێرانەوە دەرچوون، هەڵەو کەموکوڕییان لە بەرپرسیارییەتی ئەو ئۆرگانەدایە، نەك وەرگێڕ یا ئامادەکار. هەر بۆیە منیش نەمتوانیوە دەقی سەرەکی ئەو نامانە لە پاشکۆی ئەم وەرگێڕاوە کوردییەدا پۆلێن بکەم.

جگەلەوەی لە رووی رستە سازییەوە، زۆر رستەیان تێدایە هەڵەن، زمانەکەشیان زمانی ئەشراف، زمانی ئەرستۆکرات، واتە زمانی پاڕانەوە، ریا و پیاهەڵدانە، لەبەر ئەوە زۆر لە زاراوەکانی لێکچوو، هاومانا و، زۆرجار بە پێی فەرهەنگی ئەمڕۆ بێ مانان، لەو شوێنەی کارناکەنە سەر مانا و ئەمانەتی وەرگێڕان، وەرگێڕ ناچار دەکەن وازیان لێبێنێ یا ئەگەر کرا وەك خۆی بەکاریان بێنێتەوە. دواتر بۆ بە هەڵە تێنەگەیشتن لە مانای دەقەکان، بێ گوێدانە رێنووسی فارسی بەڵگەنامەکان، لە شوێنی پێویست، وێرگوڵ، خاڵی کۆتاییم داناوە، کە رەنگە بە پێی پرنسیپی وەرگێڕانی بەڵگەنامە کارێکی هەڵە بێت، بەڵام من ئەم سنوور بەزاندنەم پێ باشترە بووە لەوەی بە مانایەکی چەواشەوە بیانکەمە کوردی... بەکورتی هەوڵم داوە بە دیوێکدا، رەنگدانەوەی زمانەکە کە فارسی کۆنە، لە وەرگێڕاوە کوردییەکەدا بپارێزم، بە دیوەکەی تریشدا ئەوەندەی بۆم کرابێ بە مانایەکی روونەوە پێشکەش بە خوێنەری بکەم. دڵنیام هەردوو لایەنەکانی ئەم بەڵگەنامانە واتە شێواز و مانا، بۆ بواری لێکۆڵینەوەی پەیوەندیدار بەکەڵکن. لە کۆتاییدا کارەکەم بێ کەموکوڕی نییە و، خۆشحاڵیش دەبم هەرکەسێك هەستی بە هەر کەموکورییەك کرد، بە رەخنە گرتن، نووسراو یا بیسراو، فەرمی و نافەرمی ئاگادارم بکاتەوە، چونکە من ویستومە خزمەت بکەم و، دەشزانم هەزاران کتێب لەم وڵاتەی ئێمە وەرگێڕدراون، هەم خیانەت بە دەقەکەیان کراوە، هەم زمانی وەرگێڕانیان سەقەتە، کە دوور نییە خزمەتەکەیان ئەگەر بە خیانەت لە ئەمانەت لە قەڵەم نەدرێ، بەفیڕۆچووە.

رەنگە خۆپەرستانە بێ، ئەگەر بڵێم درێغی مەکەن لە رخنە گرتنتان، چونکە خزمەت کردنە بە بەندە ئینجا بە زمانی کوردی و بواری وەرگێڕان. پێش وەخت سوپاستان دەکەم و هیوادارم شایستەی ئەو خزمەتە بم.

**مستەفا غەفوور**

# بەناوی خوای گەورەو میهرەبان

## پێش وتە:

ڕەنگە زێدەڕۆیی نەبێ ئەگەر بڵێین: کاریگەری زیانبەخشی جەنگی یەکەمی جیهانی لەسەر ئێران، کەمتر نەبووە لە کاریگەری زیانبەخشی ئەو جەنگە، لەسەر ئەوروپا. نزیکەی شەش ساڵی ڕەبەق، ئێران گۆڕەپانی تەراتێنی هێزەکانی رووسیا بوو، کە ئەمەش وێڕای نەبوونی شوێنەواری حکومەتی ناوەندی لە ویلایەتەکان، گرفتەکانی کردووە بە دووهێندە.

بە داخەوە لەمەڕ جەنگی یەکەمی جیهانی، کە تێکڕای پەیوەندی و رایەڵکەکانی وڵاتی پچڕاندبوو، وەك پێویست لێکۆڵینەوە نەکراوە، هەر لەبەرئەوەشە وێناکردنێکی ورد بۆ ئەوسالأنە، لەبەر دەست دانییە. بۆیە پێویستە لە تاوتوێکردنی مێژووی هاوچەرخدا، سەبارەت بەم بەشەی مێژووی ئێران لە جەنگی یەکەمی جیهانی دا، پێداچوونەوەیەکی نوێ ئەنجام بدرێ و، مێژووی دیپلۆماسی، سیاسی، کۆمەڵایەتی و ئابووری ئەو سەردەمە، تاوتوێ بکرێ. چونکە زۆربەی دیاردەکانی دواتر، لەوانە سەرهەڵدانی دیکتاتۆری پەهلەوی، پتر دەرئەنجامی ئەو سەردەمەن.

توێژەری بەڕێز و خۆشەویست **کاوەی بەیات**، لە کتێبی **(ئێران و جەنگی یەکەمی جیهانی)** دا، کە چاپی دووەمی لەبەردەستی خوێنەران دایە، بە بڵاوکردنەوەی بەشێك لە بەڵگەنامەکانی ڕێکخراوی بەڵگەنامە نیشتمانییەکانی ئێران، هەوڵی داوە سەرنجی مێژوونووسان و توێژەران ئاڕاستەی ئەو قۆناغە بکات. بە هیواین بەم ئامانجە بگەین و هەمووان کەڵکی لێوەربگرن.

**سید حەسەن شەهرستانی**

**سەرۆکی ئۆرگانی**

**بەڵگەنامە نیشتمانییەکانی ئێران**

## پێشەکی چاپی یەکەمی فارسی:

ئۆرگانی بەڵگەنامە نیشتمانییەکانی ئێران کە بە پێی یاسا، ئەرکی پاراستنی بەڵگەنامە مێژووییەکانی وڵاتی لە ئەستۆدایە، لە ساڵی **١٣٥٤** دا کۆمەڵێك بەڵگەنامەی کەڵەکراو و پارێزراوی وەزارەتی ناوخۆی وەرگرت. کاری لێکجیاکردنەوە، شوناسایی، هەروەها قۆناغەکانی ستریلیزە و چاککردنەوەی ئەو بەڵگەنامانە، کە هەر لە هەمان ساڵدا دەستی پێکرد، بە هەوڵی شێلگیر و بەردەوامی کاربەدەستانی ئەو بوارە، لە ساڵی **١٣٥٩** کۆتایی هات. ئەم کۆمەڵە بەڵگەنامەیە، کە لە ژێر ناونیشانی، **ئێران و جەنگی یەکەمی جیهانی، بەڵگەنامەکانی وەزارەتی ناوخۆ**، دەخرێتە روو، لە ناو (**٩٦٥٠٨** نەوەت و شەش هەزار و پێنسەت و هەشت) بەڵگەنامەی وەزارەتی ناوخۆدا هەڵبژێردراون، کە هەموویان لە رێکخراوی بەڵگەنامە نیشتمانییەکانی ئێراندا پارێزراون.

یەکەمین و دوایین کۆمەڵەی ئەو بەڵگەنامانە، کە لە بارەی گۆڕانکارییەکانی جەنگی یەکەمی جیهانی دا لە ئێران بڵاوکراونەتەوە، **کتێبی سەوز**[١] بوو.

ئەم کتێبە بەشێکە لە بەڵگەنامەکانی وەزارەتی دەرەوەی ئێران، کە بریتین لە دانووسان و نووسراوەکانی نێوان دەوڵەتی پایەبەرزی ئێران و دەوڵەتانی بیانی، کە هەر لە دەسپێکی جەنگی نێودەوڵەتییەوە لە ساڵی **١٣٣٢**ی هیجری، بەرامبەر بە **١٩١٤** ی زایینی، ئاڵوگۆڕ کراون و لە ساڵی **١٣٣٦** ی قەمەری، لە تاران بڵاوکرانەوە. بە شێك لەو راپۆرتانەی، کە وەزارەتی ناوخۆی — وڵاتەکەی تر- لەمەڕ گۆڕانکاری سیاسی تاران و ویلایەتەکان دەستی دەکەوت، لەلایەن بەرێوەبەرایەتی چاپەمەنی ئەو وەزارەتە، رادەستی چاپەمەنی و رۆژنامەکانی وڵات دەکرا. رۆژنامە گرینگ و نیمچە فەرمییەکانی وڵات لە ساڵەکانی دوای مەشروتییەت، وەك رۆژنامەی **رەعد، ستارەی ئێران و ئێران** و... هیتر، هێندێك لاپەڕەی خۆیان لە ژێر

---

١ - ئەو کتێبە بەم شێوەی خوارەوە چاپکراوەتەوە: کتێبی سەوز بە هەوڵی رەزاقولی نیزام، مافی بڵاوکردنەوەی مێژووی ئێران، تاران ١٣٦٣. لە بەشەکانی دواتری ئەم پێشەکییە ئاماژە بە بەڵگەنامەکانی ناو ئەو کتێبە دەکەم.

ناونیشانی **هەواڵەکانی ناوخۆ** بۆ ئەو راپۆرتانە تەرخان دەکرد. ئەم جۆرە راپۆرتانە کە بە یەکسانی و هاوکات لە چەند رۆژنامەدا بڵاودەکرانەوە، پێویستە لە گروپی بەڵگەنامە فەرمییەکانی وەزارەتی ناوخۆدا ئەژمار بکرێن. بایەخی ئەو راپۆرتانەی لە ستوونی **هەواڵەکانی ناوخۆی** رۆژنامەکان دا بڵاوکراونەتەوە، کاتێك دەردەکەوێ کە دەبینین، بەدەگمەن دەقی سەرەکی ئەم راپۆرتانە، لە بەڵگەنامەکانی وەزارەتی ناوخۆدا ماون و ئەگەری ئەوە هەیە، تەنیا دەقی بەجێماوی ئەو راپۆتانە هەر ئەوانە بن کە لە رۆژنامەکاندا بڵاوکراونەتەوە[1].

لەو قۆناغانەدا ئیدارەی وەزارەتی ناوخۆ بۆ پێڕاگەیشتن بە کاروباری وڵات، بۆ شەش بەڕێوەبەرایەتی دابەش کرابوو، **رۆژهەڵات، رۆژئاوا، باکوور، باشوور**، ناوەند و **کابینە**. ئێمەش بۆ خستنە رووی روونتر و وردتری ئەو بەڵگەنامانەی جەنگی یەکەمی جیهانی، ئەم دابەشکردنەمان لە بەرچاو گرتووە و ئەو بەڵگەنامانەی مەبەستمان بوون، بە گشتی بە پێی چوار ناوەندی **باکوور، رۆژئاوا، رۆژهەڵات** و **باشوور**، پۆلێنمان کردن، دواتر هەر بەشێکمان بەپێی ریزبەندی کات خستە روو[2]. بەشێکیش تەرخان کراوە بۆ **ئاگاداری و بەڵگەنامە پەرشوبڵاوەکان**.

بۆ روونتر کردنەوەی بەها و بۆنەی بەڵگەنامەکانی ئەم کۆمەڵەیە، سەرەتا بە کورتی قۆناغە سەرەکییەکانی گۆڕانکاری جەنگ لە ئێران شرۆڤەدەکەین، دواتر ئەو بەڵگەنامانەی ناو بەڵگەنامەکانی وەزارەتی ناوخۆ، لە گۆشەنیگای ئەم گۆڕانکارییانەوە هەڵدەسەنگێنن.

---

١- بەشی ناتەواوی ئەم راپۆرتە کە پەیوەندی هەیە بە گۆڕانکارییەکانی جەنگی یەکەمی جیهانی لە ئێران، موئەریخودەولە سپێهر لە کتێبی ئێران لە جەنگی مەزندا (تاران، چاپخانەی بانکی میلی ئێران ١٣٦٣) بی ئەوەی سەرچاوەکەی دیاری بکا، نووسیویەتی. بۆ تاوتوێکردنی مێژووی ئەو سەردەمە راپۆرتە وەرگیراوەکانی سپێهر بەس نین، پێویستە بۆ دەقە سەرەکییەکانیان بگەڕێنەوە بۆ رۆژنامەکانی ئەو رۆژگارە.

٢- لەم بوارەدا ئەو بەڵگەنامانەمان بەرچاو نەکەوت، کە لە ژێر ناونیشانی بەڕێوەبەرایەتی ناوەند یا کابینە دابن. لەمەڕ بەڵگەنانەکانی تایبەت بە قوم و قەزوین و دابەشکردنیان لە رووی ئیدارییەوە، ناروونییەك هەبوو، چونکە هێندێك جار لە تاوتوێکردنی کارەکانیان، لەوانە بە ئەرکی بەڕێوەبەرایەتی ناوەند ئەژمار دەکرا، وەلێ لە بارەی بۆچوونی ئێمە زۆرجار گەرێنرانەتەوە بۆ بەریوەبەرایەتییەکانی باشوور و باکوور. بۆیە لەم کۆمەڵەیەدا لەگەڵ بەڵگەنامەکانی ئەم بەشە پۆلێن کراون.

کەمێك دوای تاج لەسەرنانی **ئەحمەد شای قاجار** جەنگی یەکەمی جیهانی دەستی پێکرد. ئەم جەنگەش، کە بەرهەمی رکابەری لەمێژینەی زلهێزەکانی ئەوروپا بوو، لە سەر خاکێکی دوور لە ئێران، بۆ هێزە رکابەرەکان دەستی پێکرد. وەلێ زۆری نەخایاند، کە لایەنی جیهانی وەخۆ گرت و کاری کردە سەر گۆڕانکارییەکانی ناوخۆ و پەیوەندییەکانی دەرەوەی وڵاتان. لە سەرەتای جەنگ باکوور و باکووری رۆژئاوای ئێران لە ژێر داگیرکاری رووسیا دابوو. دەوڵەتی رووسیا، ئەو ئاژاوەی شۆڕشی مەشروتییەی کردە بەهانە و بۆ دابڕینی یەکجارەکی باکووری وڵات، چەند هێزێکی رەوانەی ئێران کرد. چەند یەکەیەکی سەربازی عوسمانیش، لە ویلایەتەکانی رۆژئاوا هەبوون. ئەمەش پەیوەندی هەبوو بە داگیرکاری و هەوڵی چەند سەد ساڵەیان، بۆ بەدەستهێنانی ویلایەتەکانی رۆژئاوای ئێران. دەوڵەتی بەریتانیاش ، بە ناوی پاراستنی بەرژەوەندی رەوەندەکانی و پاسەوانی کادیری کونسولگەری خۆی، چەند ساڵێك بوو چەند هێزێکی ناردبوو بۆ باشووری ئێران.

دەوڵەتی رووسیا و بەریتانیا کە لەم جەنگەدا هاوپەیمان بوون، لەبەر پێکدادان لە چەند خاڵێکی ناوچەکە، زۆر پێویستییان بەو هێزە سەربازییە نەبوو و نەیاندەویست هێزەکانی خۆیان لە ئێران بهێڵنەوە، یا لانی کەم لەو کاتەدا زیادیان بکەن. لەو قۆناغەدا هێشتا دەوڵەتی عوسمانی نەهاتبۆ ناو جەنگەکە، تەنانەت رووسەکانیش داوایان لە بەشێك لە هێزەکانی خۆیان کردبوو کە بگەڕێنەوە. زۆر لە ئێرانییەکان، بە هیوا بوون کەڵك لەم گرفتارییەی زلهێزەکان وەربگرن و لەپاڵ ئامادەکردنی پێداویستییەکانی چوونەدەرەوەی تێکڕای هێزە دەرەکییەکان لە وڵات، بەدەر لە دەستێوەردانی رۆژانەی ئەوان، دەست بە چاکسازی بکەن.

وەلێ هێزە سەرەکیەکان واتە ئەڵمان و هاوپەیمانەکانی، سوودیان لەوە وەرگرت کە بە نانەوەی شەڕ لە رۆژهەڵات بە تایبەتی لە ئێران، بە شێك لە هێزەکانی رووسیا و بەریتانیا، لەم ناوچانە تووشی کێشە بکەن و گوشار لەسەر بەرەی سەرەکی خۆیان کەم بکەنەوە. بە لەبەر چاو گرتنی زوڵم و ستەمی لەمێژینەی رووس و ئینگلیز لە ئێران، زەمینەیەکی لەبار هەبوو بۆ ئەم جۆرە هەوڵانەی ئەڵمان و هاوپەیمانەکانی، بە تێوەگلانی عوسمانی لەو جەنگە دژی هاوپەیمانان لە سەرەتای **زیحەجەی ١٣٣٢**، ئەو هەوڵانە رەهەندگەلی تریان وەخۆ گرت. هەر لەو مانگەدا، هێزە سەربازییەکانی عوسمانی، هێرشیان کردە سەر بەشێك لە هێزەکانی رووسیا، کە لە ئازەربایجانەوە دەرۆیشتن بەرەو بەرەی جەنگ لە **وان**، بەم پێیە رووبەڕووبوونەوەی هێزە

دژپێکەکان لە ناو ئێران، راستەوخۆ هاتە ئاراوە و توانای پاراستنی بێلایەنی رووی لە لاوازی کرد. ئەڵمان و عوسمانییەکان، هەوڵی راکێشانی گروپێك لە عەشیرەتەکانی ئێرانیان دا، بە تایبەتی لەناوچەکانی رۆژئاوای وڵات، تا رادەییەکیش سەرکەوتن، لە راکێشانی رای ئەفسەران و کاربەدەستانی پۆلیسی دەوڵەت. رووسیاش ویستی بەهۆی بە هێز کردنی **شوجاعودەولە** کە هاوپەیمانی لە مێژینەی خۆی بوو، دژی هێزەکانی عوسمانی و هاوپەیمانەکانیان لەو ناوچەیە، هێزێك راست بکاتەوە. وەلێ ئەم پرۆژەی ئەوان، سەرکەوتنێکی ئەوتۆی بەدەست نەهێنا و بە تێشکانی هێزەکانی **شوجاعودەولە**، لە سەرەتای مانگی **سەفەری ١٣٣٣**، **تەورێز** کەوتە ژێردەستی هێزەکانی عوسمانی.

بەرەبەرە ئەم جۆرە رووداوانە ناوچەکانی باشووری ئێرانیان گرتەوە. بەهۆی رووبەڕووی یەکتربوونەوەی هێزەکانی بەریتانیا و عوسمانی لە دەوروبەری **بەسرە** لە زستانی هەمان ساڵدا، درێژبوونەوەی رەهەندەکانی ئەم پێکدادانە، بێلایەنی ئێران لە خوزستانیش کەوتە ژێر پێی رووداوی جەنگ. لە لایەکی تر بە چڕتربوونەوەی چالاکی بە کرێگیراو و نێردراوانی ئەڵمان، لە کۆتایی زستانی **١٣٣٣** دا، دەوڵەتی بەریتانیا لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆی، وەك **ئەهواز** و **بوشەهر**، دەستیان کرد بە دەسگیر کردنی گروپێك لە نوێنەرەکانی ئەڵمان. هێندێکیان دەسگیر کران وەك، **لیسترمان** کونسوڵی ئەڵمان لە **بوشەهر** و هێندێکیشیان وەك، **ڤاسمۆس** لەداو نەکەوتن. لە لایەکی تر دەوڵەتی بەریتانیا بەرەبەرە ژمارەی هێزەکانی خۆی لە شوێنی جیاجیای باشووری ئێران پتر کرد.

کەچی سەرەڕای ئەوە، گۆڕەپانی رووبەڕووبوونەوەی هێزە دەرەکییەکان، هێشتا هەر ناوچەکانی رۆژئاوای وڵات بوو. **کرماشان** لە کۆتایی زستانی ساڵی **١٣٣٣** دا وەك پێگەیەکی چالاکییەکانی ئەڵمان لە وڵاتدا، گرنگیی لە رادەبەدەری پەیدا کرد. دەوڵەتی عوسمانی، تەنیا لە بیری وروژاندنی ئێرانییەکاندا نەبوو، دژی هێزەکانی رووسیا و ئینگلیز، بەڵکو چالاکییەکانی لەو دەڤەرە رەنگ و بۆوی داگیرکاری پێوە دیار بوو. دەسوەردانی فەرماندە سەربازییەکانی عوسمانی لە کاروباری ئێران، رووبەڕووی بەرهەڵستی توندی خەڵکی ئێران بۆوە و ئەمجۆرە هەڵسوکەوتەی عوسمانییەکان، لەسەر هاوپەیمانە ئەڵمانییەکەیان زۆر گران کەوت و ئەگەری بە ئامانج گەیشتنی هێزە سەرەکییەکانی لە ئێران دا کەمکردەوە.

لە بەهار و هاوینی ساڵی **١٣٣٣**، چالاکی نێردراوەکانی ئەڵمان لە شارەکانی رۆژئاوای ئێران بە تایبەتی **ئیسفەهان،** پەرەی گرت. **ئیسفەهان**، وەك شارێکی گرنگی ناوەندی ئێران، بایەخێکی تایبەتی پەیدا کرد بۆ پەرەپێدانی چالاکی کاربەدەستانی ئەڵمان، لە ناوچەکانی باشووری وڵات و ناردنی چەندین گروپ بۆ **هیندوستان** و **ئەفغانستان** و وروژاندنی دانیشتوانی ئەوێ. کاربەدەستانی رووس و ئینگلیزیش دەستەوەستان دانەنیشتن، ئەوانیش لە رۆژهەڵاتی ئێران کەوتنە هەنگاونانی پێشگیرانە. لە ناوەڕاستی ساڵی **١٣٣٣** دا پلانێکیان دانا بۆ دروستکردنی ناوەندێکی پارێزراوی هاوبەش لە رۆژهەڵات، کە بەپێی ئەو پلانە، پاراستنی میحوەری **کەچە** تا **بیرجەند** و **سەددە**، کەوتە ئەستۆی هێزەکانی ئینگلیز و لە میحوەری **سەددە**شەوە تا سنووری رووسیا کەوتە ئەستۆی هێزەکانی رووسی. دەوڵەتی بەریتانیا لە ئەگەری سەرهەڵدانی پەشێوی لە نێوان عەشیرەتەکانی سیستان و بلوچستان سەغڵەت بوو، لەبەرئەوە بڕیاری دا هێزێکی سەربازی بنێرێ بۆ ئەو دەڤەرە.

دەتوانین کۆتایی هاوینی ئەو ساڵە، بە خاڵی ئەوپەڕی توانای لایەنگرانی ئەڵمان و عوسمانی دابنێین. لە زۆربەی شارەکانی وڵات،کاربەدەستانی کونسولگەری دەوڵەتانی هاوپەیمان و لایەنگرەکانیان، کەوتنە بەرهێرش و ناچاریان کردن ئەو شوێنانە بەجێبهێڵن. بەڵام ئەم قۆناغەی رووبەڕوبوونەوە هێزە دژبەرەکان بەرەبەرە لە کۆتایی خۆی نزیك دەبۆوە. لە کۆتایی مانگی **شەهریوەر** ناردنی هێزەکانی رووسیا بۆ ئێران دەستی پێکرد. ئەو هێزانەش لە **بەندەر ئەنزەلی** یەوە، هاتنە ناو خاکی ئێران و لە **قەزەوین** جێگیربوون. لە تارانیش وەك زۆربە ویلایەتەکانی تر، رووبەڕووبوونەوەی هێزە سیاسییەکان توندو تیژی بەخۆیەوە بینی. لە سەروبەندی مانگی **موحەڕەمی** ساڵی **١٣٣٣** دا، لە تاران بۆ جیهاد کردن دژی رووس و ئینگلیز، دەنگۆی چوونە ناو ریزی هێزە سەرەکییەکان هاتە ئاراوە. بەڵام رووسەکان دەسپێشخەرییان کرد و لە کۆتایی **زیحەججەی ١٣٣٣** بە شێك لە هێزەکەیان لە **قەزوینەوە** نارد بۆ **تاران** و کارەکەیان یەکلایی کردەوە. چەند رۆژێك واهاتە بەرچاو، کە **پاشای لاو** بە نیازە لەگەڵ گروپێکی گەورە پیاوان و کەسایەتی سیاسی و سەرۆك عەشیرەتەکان و فەرمانگەکانی دەوڵەت، لە تارانەوە بگوازنەوە بۆ **ئیسفەهان**، تا نەکەونە ژێرباری رووس و ئینگلیز. بەڵام ئەم پلانە جێبەجێنەکرا و هێزەکانی رووسیا تا دەوروبەری شاری تاران هاتن، وەلێ نەهاتنە ناوشار. بەشێك لە نوێنەرانی **خولی سێهەمی ئەنجومەن** و گروپێك لە کەسایەتییە

سیاسییەکانی پایتەخت، لەگەڵ سەفیران و نوێنەرانی هێزەسەرەکییەکان، ڕێگەی کوچکردنیان گرتەبەر. لەرزووتای گۆڕانکارییەکانی تاران، داوێنی چەند ویلایەتێکی تریشی گرتەوە. لە **شیراز،** دەستەیەك ئەفسەری پۆلیس و ژمارەیەك کەسایەتی سیاسی ناوچەکە، بەناوی **کۆمیتەی پارێزەرانی سەربەخۆیی،** جڵەوی کاروبارەکانیان گرتە دەست و کونسوڵی بەریتانیا و کاربەدەستانی ئینگلیزی شیرازیان دەسگیر کرد.

لەگەڵ ئەوەشدا وادیار بوو لە **تاران**، بارودۆخەکە لە ژێر کۆنترۆڵی هاوپەیمانان دایە، بەڵام هێشتا هەوڵی دژبەرانی هاوپەیمانان بۆ بە دەستەوە گرتنی جڵەوی کاروبارەکان کۆتایی نەهاتبوو، چونکە کۆمەڵێك پەنابەر لە **قوم** کۆمەڵەیەکیان بە ناوی **کۆمیتەی بەرگری میلی**دامەزراندبوو، هێزێکیان لە یەکە شۆڕشگێرەکانی پۆلیس و گروپی خۆیەخش کۆکردبۆوە. ئەو کۆمیتەیە، پەیوەندی تێلگرافی نێوان تاران و ویلایەتەکانی تری پچڕاندبوو و بە ناوی ناوەندەوە فەرمانی دەردەکرد.

**باراتۆف** فەرماندەی هێزی نێردراوی روسیا، هێزەکانی کرد بە دووبەشەوە: **بەشێکی** بە نیازی داگیر کردنی یەکجارەکی **کرماشان،** نارد بۆ **هەمەدان** و **بەشەکەی تریشی** بە نیازی داگیر کردنی یەکجارەکی ئیسفەهان، رەوانە**ی قوم** کرد.**(٢٦ موحەڕەمی ١٣٣٤)**

لە زنجیرەیەك پێکدادان و شەڕی تاڕادەیەك توند و تیژ لە دەوروبەری تاران، کۆمەڵەی **کۆمیتەی بەرگری میلیان** تێکشکاند و لە ماوەی چەند مانگێکدا، یەك لە دوای یەك **قوم** و **ئیسفەهان** لە لایەك و **سوڵتانئاباد** و **کرماشان** لە لایەکی تر، کەوتنە دەست هێزەکانی رووسیا. لە باشووریش دەوڵەتی بەریتانیا بۆ پتەو کردنی پێگەکانی خۆی کەوتەکار. بە ریتانیاش لەپاڵ بەهێز کردنی لایەنگرانی خۆی لە ناوچەکەدا، ژەنراڵ **سر پیرسی سایکسی** بۆ دروستکردنی هێزێکی خۆجێیی، لە ژێر فەرماندەیی ئەفسەرانی ئینگلیز، رەوانەی ئێران کرد. لە رۆژهەڵاتیش، جگە لە بە هێز کردنی ئەو هێزانەی لە **کەمەربەندی رۆژهەڵاتی ئێران** جێگیر بوون، بەریتانیا بە فەرماندەیی ژەنراڵ **دیر،** بۆ دەمکوت کردنی عەشیرەتەکانی **سیستان** و **بلوچستان** و نیشاندانی توانای سەربازی، چەند چالاکییەکی ئەنجامدا.

بەهاری ساڵی **١٣٣٤**، شایەتی هەرەسهێنانی هەوڵ و پرۆژەکانی لایەنگرانی هێزە سەرەکییەکان بوو لە ئێران. راپەڕینی بەڕێوەبەرایەتی پۆلیسی **فارس،** تێکشکا و لە رۆژهەڵاتیش لە سێ مانگی یەکەمی ئەو ساڵەدا، چەند شەڕێك دژی عەشیرەتەکانی **سیستان** و

**بلوچستان** ئەنجام درا. قۆناغی یەکەمی مێژووی جەنگی یەکەمی جیهانی، کە نزیکەی یەکساڵ درێژەی کێشا، دەتوانین ناوبنێین **قۆناغی فەرمانڕەوایی رووس و ئینگلیز** لە ئێران، چونکە لەو قۆناغەدا سەرەڕای بوونی هێزەکانی هاوپەیمانان لە زۆر شوێنی وڵاتدا، دەوڵەتی ئێران ناچار بوو بەشێك لە داوا و ویستە قورسەکانی ئەوان پەسەند بکات، هاوپەیمانان بۆ چاودێری کاروباری دارایی وڵات، ئەنجومەنێکیان سەپان بە سەر ئێراندا، کە پێکهاتبوو لە نوێنەرانی فەرمی خۆی و دەوڵەتی ئێران بەناوی **کۆمیتەی تێکەڵاو**، پێشنیازیان کرد کە هەریەکەیان بۆ پاراستنی نەزمی ناوچەی خۆی لە ناو وڵات، هێزێکی (**١١،٠٠٠**) یازدە هەزار کەسی دروست بکات. بڕیاردرا رووسیا هێزی قۆزاق لە ئێران لە یەك **بریگادەوە** (واتە یەك تیپ) بکات بە **دیۆیزیۆن** ( واتە یەك لەشکر) و ئینگلیزیش، لە باشوور هێزێك دروست بکات کە دواتر بە ناوی **پۆلیسی باشوور** ناسرا.

لەم قۆناغەدا تەنیا ویلایەتەکانی رۆژئاوای ئێران بوون، کە لە ژێر کاریگەری گۆڕانکارییە بنەڕەتییەکانی بەرەی جەنگ لە **میزۆپۆتامیا**، هەوراز و نشێوەکانی تاقی دەکردەوە. تێشکانی هێزەکانی ئینگلیز لە **کوت** و **عەمارە** بوو بە هۆی زیاد کردنی گوشاری هێزەکانی عوسمانی لە سەر هێزەکانی **باراتۆف** لە رۆژئاوای ئێران. لە گەڵ ئەوەشدا هێزەکانی عوسمانی، لە کۆتایی مانگی **شەعبانی ١٣٣٤**، دوای چەند رۆژ جەنگ، دووبارە کرماشانیان داگیر کرد و دەوڵەتی **نیزامولسەلتەنە**یان سەرلەنوێ لەوێ جێگیر کرد و دوای چەند رۆژ هەمەدانیش لە سەرەتای مانگی **شەوالی ١٣٣٤** کەوتە دەست عوسمانییەکان، وەلێ ئەم رووداوە پێگەی هاوپەیمانانی بە تەواوی لەرزۆك نەکرد. هێزەکانی رووسیا، تا قەدپاڵی چیای **بلاغ سوڵتان** پاشەکشەیان کرد و هەر لەوێ جێگیر بوون. لەگەڵ ئەوشدا پێکدادان تاك و تەرا لێرەولەوێ بەردەوام بوو، وەڵێ هیچ کام لە لایەنەکانی جەنگ بەهۆی گرفتی جبەخانەوە توانای پێشڕەوی پتریان نەبوو. لە ناوخودی وڵاتیش لەبەر قاتی وقڕی و نائومێدی گشتی، بزوتنەوەیەکی بەرچاو سەریهەڵنەدا.

بە پێشرەوی هێزەکانی ئینگلیز، بە فەرماندەیی **ژەنراڵ مۆد** لە بەرەی **میزۆپۆتامیا**، پێگەی هێزەکانی عوسمانی، لە رۆژئاوای ئێران لەرزۆك بوو و هێزەکانی **پاراتۆف** سەرەڕای ساردوسەرمایەکی توند و سەختی رێگا، توانیان دووبارە دەست بە پێشڕەوی بکەنەوە و لە ناوەڕاستی مانگی **جەمادی یەکەمی ١٣٣٥**، **کرماشان** داگیر بکەن. بەڵام بە سەرهەڵدانی

شۆڕشی رووسیا، لە کۆتایی زستانی هەمان ساڵ و ئەو کاریگەرییەی خستییە سەر گۆڕانکارییەکانی ناوچەکە، قۆناغێکی تر دەستی پێکرد.

ئەگەرچی چوونەدەرەوەی هێزەکانی رووسیا لە ئێران، ئاژاوە، نارێکی و تاڵانکردنی زۆر گوندی سەر ڕێگایان لەگەڵدا بوو، وەلیٚ لە درێژخایەندا کاریگەریی گرنگی لە سەر گۆڕانکارییە سیاسییەکانی ئێران دانا. هەرچەندە وتەیەکی ئەوتۆ لەمەڕ بێلایەنی ئێران لە ئارادا نەمابوو، بەڵام جۆش و خرۆشێکی نویٚ، بۆ وەدەستهێنانی مافە لە دەستچووەکان و گەڕاندنەوەی سەربەخۆیی وڵات، هاتە ئاراوە. زۆر کەسایەتی و گرووپی سیاسی وڵات، کە تا ئەو ماوەیە جموجوڵێکی ئەوتۆیان نەبوو، سەرلەنویٚ کەوتنەوە گەڕ و باسی هەڵوەشاندنەوەی پەیمانی **١٩٠٧** و چاوخشاندنەوە بە تێکڕای پەیمانە سەپێنراوەکانی ئەو ساڵانەی دوایی، هاتە گۆڕیٚ. لە باکوری ئێران، **هێزەکانی جەنگەڵ** بەرەبەرە بەهێز دەبوون و لە تارانیش **دژایەتی بیانی** بە شێوەی وەك **کۆمیتەی سزادان،** دامەزران.

دیارە ئەم گۆڕانکارییە هێشتا داوێنی ناوچەکانی باشووری نەگرتبۆوە، کە لەژێردەسەڵاتی بەریتانیادا بوون. رۆژهەڵاتی ئێران ئارام بوو، لە دەڤەری **فارس** لە کۆتایی وەرزی بەهار و سەرەتای هاوینی **١٣٣٥**، پۆلیسی باشوور، دەستیکرد بە سەرکوتکردنی عەشیرەتەکانی رۆژهەڵات و باکووری رۆژهەڵاتی دەڤەری فارس.

دەوڵەتی بەریتانیا، بۆ پڕکردنەوەی جێگای هێزەکانی رووسیا، چەند کارێکی ئەنجامدا. لە لایەك لە کۆتایی مانگی **سەفەری ١٣٣٦** ەوە، تێچووی هێزەکانی قۆزاقی وەئەستۆ گرت و لە کۆتایی **رەبیعولئەولی** هەمان ساڵیش، یەکم بەشی هێزە سەربازییەکانی خۆی، لە **میزۆپۆتامیاوە** برد بۆ **قەسری شیرین**. لە سەرەتای مانگی **رەبیعولسانی ١٣٣٦**، نزیکەی هەموو هێزەکانی رووسی، کرماشانیان بەجێهێشت و تەنیا بە شێکیان بە فەرماندەیی **بچراخۆف،** کە ببوونە کاربەدەستانی بەریتانیا لە رۆژئاوای ئێران مانەوە.

بە هەرەسهێنانی دەسەڵاتی رووسیا، کرنگترین مەترسی کە هەڕەشەی لە پێگەی بەریتانیا دەکرد، توانای هاتنە ناوەوەی هێزەکانی ئەڵمان و عوسمانی بوو لە ڕێگەی **قەفقاز** و باکووری ئێرانەوە و گەیشتنیان بۆ سەر سنووری رۆژئاوای هیند و ئەفغانستان. لە راستیدا دەتوانین بڵێین، لەم قۆناغەدا گۆڕەپانی رووبەڕووبوونەوەی هێزە دژبەرەکان، بەرەبەرە گوازرایەوە بۆ باکووری ئێران و بگرە ئەوپەڕی سنووری باکووری وڵات. لە باکووری ئێران **هێزەکانی جەنگەڵ**

زۆر بەهێز ببوون، تەنانەت لە ناوەڕاستی مانگی **رەبیعولسانی ١٣٣٦**، رێگەیان نەدا شاندی بەریتانیا لەوێوە بەرەو **باکۆ** بڕوا. کاربەستانی سەربازی بەریتانیا، بۆ ئەوەی رێگە لە ئەگەری پێشڕەوی **هێزەکانی جەنگەڵ** بگرن بەرەو **تاران**، هێزەکانی ژێر فەرماندەیی بچراتۆفیان لە **قەزوین** جێگیر کرد. بەڵام ئەو هێزانەی لەوێ بوون بۆ رێگتن لە پێشڕەوی عوسمانییەکان بەس نەبوو. تا پێش ئەم قۆناغە، چالاکی هێزەکانی عوسمانی لە ئێران پتر لە ژێر پەردەی بەرەنگاربوونەوەی هێزە سەربازییەکانی رووسیادا بوو، بەڵام ئێستا ئەم فراوانخوازییە لە ژێر رێنمایی کەسانی وەك **نووری پاشا- برای ئەنوەر پاشا سیمای بەهێزی ئەوسای عوسمانییەکان-** رواڵەتی ئاشکرای (**پان ترکی**) وەخۆگرتووە و باسی (**یەکییەتی نەتەوکانی رۆژهەڵات**) لە ئارادایە. لە بەهاری ساڵی **١٣٣٦**، هێزەکانی عوسمانی لە **ئازەربایجان** پێشڕەویان کرد، لەم شەڕەدا تەنیا یەکەی سەربازی **ئەرمەنی و ئاسوورییەکان**، کە لەلایەن هاوپەیمانانەوە بەهێز دەکران، بەرەنگارییان بوونەوە. دەبێ ئەوەش بگوترێ، کە لەم قۆناغەدا پێشڕەوی عوسمانییەکان بە بەراورد لەگەڵ قۆناغەکانی سەرەتای جەنگ، نەك هەر لەلایەن ئێرانییەکانەوە پێشوازییان لێنەکرا، بەڵکو بوونیان لە ناوسنووری وڵاتدا بە داگیرکاری تەواو ، ستەمکاری و دەسترێژی ئاشکرا، لەقەڵەم دەدرا. لە سەرەتای مانگی **رەمەزانی ١٣٣٦** کاربەدەستانی باڵای ئینگلیز، بڕیاریاندا میحوەری **کرماشان — قەزوین- ئەنزەلی** داگیر بکەن.

لە رۆژهەڵاتی ئێرانیش چوونەدەرەوەی هێزەکانی رووسیا، بوو بەهۆی ئەوەی کاربەدەستانی باڵای ئینگلیز، چەند هێزێك بنێرن جێگای بەتاڵی ئەو بەشەی باکووری (**کەمەربەندی رۆژهەڵات**) پڕ بکەنەوە. لە کاتێکدا ناوچەکانی رۆژهەڵاتی ئێران ئارام بوون، کەچی پێگەی بە بەریتانیا لە **ناوچەی فارس** بەرەبەر لەرزۆك دەبوو. لە سەرەتای مانگی **رجەبی ١٣٣٦** شێواوییەك لە ناو پۆلیسەکانی باشوور سەریهەڵدا. لە تەك ئەم گۆڕانکارییانەدا، کە پەیوەندییان هەبوو لەگەڵ گۆڕانکارییە سیاسییەکانی تاران و هەوڵی دووبارەی ئێرانییەکان بۆ چوونەدەرەوەی هێزە دەرەکییەکان، لە سەرەتای مانگی **شەعبانی ١٣٣٦**دا چەند شەڕێك لە نێوان عەشیرەتەکانی **قەشقایی** و **پۆلیسی باشوور** و یەکە سەربازییەکانی تری ئینگلیز دا رویاندا، کە لە ماوەی چەند رۆژدا لە دەوروبەری **شیراز** بوو بە جەنگێکی سەربازی سەرەکی. راپەڕینی هاوکاتی دەستەیەکی خەڵکی **شیراز** نەیتوانی کاریگەر بێ و ئەم رووبەڕووبوونەوەیە بە ئاکام نەگەیشت. دەرئەنجامێکی دیاری ئەو شەڕە، بێ بایەخ بوونی بەڕێوەبەرایەتی پۆلیسی

باشوور بوو، کە لەو سەروبەندەدا زۆربەی پۆلیسەکانی، یا وازیان لە کارەکەیان هێنابوو، یا دژی ئەفسەرە ئینگلیزییەکان راپەڕیبوون.

لەگەڵ ئەوەشدا، گۆڕەپانی سەرەکی گۆڕانکارییەکان، هێشتا هەر ناوچەکانی باکووری وڵات بوون. لە سەرەتای مانگی **شەوالی ١٣٣٦**، هێزەکانی ئینگلیز بە فەرماندەیی **ژەنراڵ دنسترۆیل،** دوای چەند شەڕ و پێکدادان لەگەڵ **هێزەکانی جەنگەڵ**، **بەندەر ئەنزەلی** یان داگیر کرد و دوای ماوەیەك چوونە ناو **باکۆ**. لە لایەکی تر، لە رۆژهەڵاتی ئێرانیش بەشێك لە هێزە سەربازییەکانی بەریتانیا بە فەرماندەیی **ژەنراڵ ماڵسون** فەرمانیان پێدرا، بۆ پشتیوانی کردنی حکومەتی **عەشق ئابادی** لایەنگری هاوپەیمانان، بڕۆنە ئەو دەڤەرە. لە هاوین و پایزی ئەو ساڵەدا، تاك و تەرا شەڕ لە نێوان هێزەکانی عوسمانی و بەریتانیا لە **قەفقاز** و **ئازەربایجان** روویدا، کە لە هەندێك قۆناغدا هێزەکانی ئینگلیز پاشەکشەیان دەکرد. وەلێ تێکڕای گۆڕانکارییەکانی جەنگ، واتە سەرکەوتنی هاوپەیمانان لە ئەورووپا و تێشکانی هێزەکانی عوسمانی لە **فەلەستین**، کاریانکردە سەر توانای سەربازی هێزەکانی عوسمانی و نەیانتوانی لە ئازەربایجان لە سنووری **قافلانکووه** تێبپەڕن، کە لە سەرەتای مانگی **زیحەجەی ١٣٣٦** گەیشتبوونە ئەو دەڤەرە. لە قەفقازیش پلانەکەیان بۆ رۆیشتن لە سنووری **ئاستار**اوە بۆ ناوچەکانی باکووری ئێران، سەرکەوتنێکی ئەوتۆی بەدەست نەهێنا. جەنگی یەکەمی جیهان، لە قۆناغی کۆتایی خۆی نزیك دەبۆوە. تەنیا هێزەکانی بەریتانیا نەبێ، هێشتا چەند کاری نیوەچڵیان مابوو. لە کۆتایی مانگی **زیحەجەی ١٣٣٦** لە دوای زنجیرە بەرنامەیەکی بەرفراوانی هێزەکانی ئینگلیز، دەستیان کرد بە چاکسازی جادەی **بوشەهر – شیراز** و دوای چەند شەڕێك لیرەو لەوێ، تا ناوەڕاستی مانگی **موحەڕەمی ١٣٣٧، چغادەك** و **چاهکوتاه** و **برازجان** یان، داگیر کرد و دواتر لە کۆتایی مانگی **رەبیعولسانی ١٣٣٧** لەگەڵ داگیر کردنی **کازروون** و گەیشتنی هێزەکانی ئنگلیزی جێگیری **شیراز،** لەو لایەوە جادەکەیان کردەوە کە بە درێژایی جەنگ داخرابوو. بۆ سەرکوت کردنی یەکجارەکی عەشیرەتی **قەشقایی** کە لە دەوروبەری فەیروزئاباد کۆببوونەوە، لە پایزی هەمان ساڵیش دا چەند هەوڵێکی ترش درا.

دەوڵەتی عوسمانی، لە کۆتایی مانگی موحەڕەمی **١٣٣٧** و دەوڵەتی ئەڵمانیش دوای نزیکەی دوو هەفتە، مەرجەکانی کۆتاییهێنانی جەنگیان پەسەند کرد. جەنگی یەکەمی جیهانی کۆتایی هات، بەڵام مانەوەی هێزەکانی بەریتانیا لەناوچەکەدا درێژەی کێشا، چونکە

بەرەنگاربوونەوەی ئەڵمان و عوسمانی، بەرەبەرە گۆڕا بۆبەرەنگاربوونەوەی **بەلشڤیزم** و هەوڵی چەند کاربەدەستی سیاسی پلەبەرزی ئینگلستان، وەك **لۆرد کرزن** کە بە دەرفەتێکی باشی دەزانی بۆ پتەو کردنی پێگەی بەریتانیا لە ئێران، بوو بە هۆی ب مانەوەی سەربازیەردەوام و هێندێك پرسی ئەوتۆی هێنایە گۆڕێ، کە تاوتۆێ کردنیان باسێکی ترە.

ئێستا بە ئاماژەیەکی کورت بە قۆناغە جیاجیاکانی گۆڕانکاری جەنگی یەکەمی جیهانی، باشترە بزانین ئەو بەڵگەنامانەی لە ریزی بەڵگەنامەکانی وەزارەتی ناوخۆدان و لەم کۆمەڵەیەدا کۆکراونەتەوە، کام قۆناغ دەخەنەڕوو و کام قۆناغیان هەڵبواردووە.

بەئەگەری زۆر، یەکەمجار دەبێ سەرنجی ئەوبەڵگانامانە بدرێ، کە باسی بوونی هێزەکانی سوپای عوسمانی دەکات، لە رۆئاوای ئێران لە قۆناغەکانی دەسپێکی جەنگ دا (**باکور ژمارە ا و ٣**). دواتر دەتوانین کاریگەری فەرمانی بانگەوازی گشتی جەنگ بکەین لەلایەن عوسمانییەکانەوە، لەسەر گۆڕانکارییەکانی ناوچەکە (**باکوور ٢**) و جموجوڵیان لە **ئازەربایجان** و **کوردستان** (**باکوور ٤،٦ تا ٨، ١٤، ٢٦، ٢٧، ٢٩،٣١**). تەنانەت ئاماژە بە هەوڵی ئەوان کراوە بۆ هاندانی هەندێك لە پیاوانی **مازندەران** (**باکور ٢٥، ٢٨**). دیارە دەوڵەتی ئێرانیش بێلایەنی رادەگەیەنێ (**ئاگادارییەکان و بەڵگەنامەی تاك و تەرا لێرەو لەوێ**) کە کاریگەرییەکی ئەوتۆی نییە لەسەر کردەوەی هێزەکانی بیانی لەناو خاکی ئێران. لە ناوچە سنوورییەکانیش بارودۆخە ئالۆزە و شێواوی لەناو عەشیرەتەکانی ناوچەکە بەدی دەکرێ (**رۆژئاوا ٤٩، ٦٣، ٦٤**). جگە لە هەوڵ و پلانە تایبەتەکانی عوسمانی (**رۆژئاوا ٨١، ٨٧**) و جموجوڵیان لە ناو عەشیرەتەکانی ناوچەکە (**رۆژئاوا ٩١، ٩٢**)، فاکتەری دەستێوەردانی ئەڵمانیش دەبێتە سەرباری ئەم پرسانە.

لەم قۆناغەدا، لە بارەی دەستێوەردانی دەوڵەتی رووسیا، لە ناوچەی **ئازەربایجان** و ئەو وردە شەڕانەی لە دەروبەری **بەسرە**، لە نێوان هێزەکانی عوسمانی و بەریتانیا هاتە ئاراوە، بەڵگەیەکمان بەرچاو نەکەت (**ئەمە سەرەڕای ئاماژەی والی پشتکوەه بە پرسەکانی بەسرە، رۆژئاوا ٦٠**). لە بارەی هەنگاوەکانی دەوڵەتی بەریتانیا، لەمەڕ بەند کردن و راوەدوونانی نوێنەرانی سیاسی و کاربەدەستانی پایەبەرزی بازرگانی ئەڵمان لە باشووری ئێران، بە تایبەتی رووداوی **ڤاسمۆس**، بەڵگەنامەی بەرچاو و گرنگ لەبەر دەستە (**باشوور ٦ تا ٨، ١٩، ٣٨ تا ٤٤، ٤٧**).

هەروەك ئاماژەمان پێکرد گۆڕەپانی سەرەکی بەرەنگاری یەکتربوونەوەی زلهێزە بیانییەکان، هەر ڕۆژئاوای وڵات بوو. دەوڵەتی رووسیا سەغڵەتە لە چەکدارکردنی عەشیرەتەکان، لە لایەن بەکرێگیراوانی هێزە سەرەکییەکان (**ڕۆژئاوا ٩٢**) و کاربەدەستانی پایەبەرزی **بەلژیکی** بەرێوەبەرایەتی دارایی گومرگی ئێرانیش، راپۆرت دەنووسن لەسەر دابەشکردنی چەك بەسەر عەشیرەتەکاندا (ڕۆژئاوا **٩٢**). کردەوەی ئەڵمانییەکان، لە ناوچەکانی ڕۆژئاوای وڵات ڕەهەندی جیاجیا وەخۆ دەگرێ، هەر لە هاندان و چەکدارکردنی عەشایر و هێزە خۆجێییەکان و بەرەنگاربوونەوەی هێزەکانی رووسیاوە (**ڕۆژئاوا ١٤٠، ١٤٣**) بگرە، تا دەگاتە هەوڵدان بۆ نەهێشتنی ئەو ناکۆکییەی لە نێوان ئێرانییەکان و هێزەکانی عوسمانی دا هەیە (**ڕۆژئاوا ژمارە ٩٥ و ١٣٦**). گاریکەری نەرێنی و تێکدەرانەی دەسدرێژی هێزەکانی عوسمانی بە شێوەیەك بوو، کە ناکۆکی خستە نێوان ئەو دوو هاوپەیمانە، واتە ئەڵمان و عوسمانی (**ڕۆژئاوا ١١٠**). لەبارەی چەند و چۆنیی دەستێوەردانی عوسمانییەکان لە کاروباری ئەو ناوچانەدا، کە ڕێگەی خۆشکرد بۆ پێکدادانی بەرفراوان، راپۆرتگەلی گرنگ و توکمە لەبەردەستە (**ڕۆژئاوا ١٤٥**)، گرفتەکانی حکومەتی خۆجێییش لە کەموکوڕییەکاندا، ڕەنگی داوەتەوە (**ڕۆژئاوا ١٢٠، ١٢١، ١٢٣**).

لەمەڕ کارو چالاکی ئەڵمانییەکان، لە ناوشارەگەورەکانی ناوەندی ئێراندا وەك **ئیسفەهان**، بەڵگەنامەی ئەوتۆ بەرچاو نەکەوت، بەڵام لە رووی ڕەنگدانەوەی ئەو گۆڕانکارییانە لە ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی ئێران، هەوڵی کاربەدەستانی پایەبەرزی رووسی و ئینگلیزی، بۆ ڕێگرتن لە رۆیشتنی نێردراوانی ئەڵمان و عوسمانی بۆ ئەفغانستان و هیندوستان، چەند بەڵگەنامەیەك هەیە (**ڕۆژهەڵات و ٧، ١١**). وەك ئاشکرایە، ئەو بەڵگەنامانەی دەربارەی گۆڕانکارییەکانی جەنگن لە ڕۆژهەڵاتی ئێران لەو قۆناغەدا، پتر باسی نەبوونی هێزێکی سەربازی دەکەن، بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەو شێواوییەی لە ئاکامی ئەو گۆڕانکاریانەوە وەدیهاتوون (**ڕۆژهەڵات ٤، ٥، ١٢ تا ١٤، ٢١، ٢٢**). لەو پرسە گرنگانەی لەو قۆناغەدا سەریانهەڵدا، ناکۆکی نێوان تیرەی **تەیموری و بەرپەری خوراسان** بوو، کە ئەگەری ئەوە هەیە لەگەڵ بێتوانایی کاربەدەستانی ناوچەکە بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشەیە (**ڕۆژهەڵات ١٦- ٢٠**)، ئەجیندای دەرەکی دەستیان تێدا بووبێ (**ڕۆژهەڵات ١٥**). ئەو راپۆرتانەی لەو قۆناغەدا لە **سیستانەوە** گەیشتوون، هەرچەندە پەیوەندی راستەوخۆیان لەگەڵ گۆڕانکارییەکانی جەنگدا نییە، بەڵام لەبەرئەوەی لە

ناو بەڵگەنامەکاندا تەنیا راپۆرتی گۆڕانکارییەکانی ئەو ناوچەیە بوون (**رۆژهەڵات ٣، ٦، ٨ تا ١٠**)، لەگەڵ ئەم کۆمەڵەدا خرانە روو.

بە راپۆرتەکانی ناردنی چەك لەلایەن ئەڵمانییەکانەوە (**رۆژئاوا ٩٢، ٩٦، ١٤٠، ١٤٣**)، درێژە بە باسی گۆڕانکارییەکانی تری وڵات دەدەین. بەڵگەنامەی سەرنج راکیش، لەوانە بەیاننامەی سەرۆك عەشیرەتەکانی کەلهوڕ، لەمەڕ بەرگری کردن لە چوونە پاڵ (ئۆردووی ئیسلامی) عوسمانییەکان و شەڕ دژی رووس و ئینگلیز (**رۆژئاوا ١٢٥**) و چەند ئاگادارینامە لە شاری **کرماشان**، لەسەر یەکییەتی و یەکگرتن لەگەڵ ئەڵمانیا، بڵاوکرابۆوە، کە چەند نموونەیان گەیشتووە (**چەند ئاگادارینامە و بەڵگەنامە لێرەو لەویٚ ٢، ٣، ٤**) و دیارە دەسدرێژی و پێشێلکاری عوسمانییەکان، ئەوەندە پەرەی سەند (**رۆژئاوا ١٢٦ بە تایبەتی راپۆرتی گرنگە بەرێوەبەری پۆلیسی کرماشان ١٤٥**) کە هەم گروپ و حزبە سیاسییەکانی شار (**رۆژئاوا ١٥٥**)، هەم ئەو هوز و ئەو عەشیرەتانەی پێشتر ناکۆکیان هەبوو (**رۆژئاوا ١٥١**)، دژی ئەو دەسدرێژییانە یەکیان گرت. لە قۆناغەکانی دواتری گۆڕانکارییەکانی رۆژئاوا، کە لە کۆتاییدا ئەڵمانییەکان باڵادەست بوون، چەند بەڵگەنامەیەك لێرەو لەویٚ لەبەر دەست دان (**رۆژئاوا ١٥٠ ، ١٥٧**).

لەم نێوەندەدا گۆڕانکارییەکانی باشووریش درێژەیان بە رێڕەوی تایبەتی خۆیان دا. ماوەیەك پێشتر، تەنانەت بەرلەوەی کاربەدەستانی پایەبەرزی ئینگلیز، دەست بکەن بە دەسگیری کاربەدەستانی ئەڵمانی، جەنگی یەکەمی جیهانی کاریگەری لەسەر ناوچەکە دانابوو. **موخبیرولسەڵتەنە هیدایەت**، کە کاربەدەستانی پایەبەرزی ئێرانی پشتیوانیان نەدەکرد (**باشوور ٤**)، دیاربوو لە ناوچەکەدا، لەبەردەم ناکۆکی و وردەشەڕی نێوان **ئەفسەرانی سویدی** پۆلیسی باشوور و کاربەدەستانی پایەبەرزی ئینگلیز و لایەنگرانیان دایە (**باشوور ٢، ٩، ١٠، ١٢، ١٦، ١٧، ٢٥**). لە لایەکی تر هاندانەکانی **ڤاسمۆس** کاریگەر و (**باشوور ٤٦، ٤٧**) و رکابەرییەکان و ئەو وردە شەڕە نەریتی و لە مێژینەی ناوچەکە، توند تر دەبوون (باشوور ٣٦، ٤٢)، راپۆرتەکانی **موقرلدەولە**ش حاکمی بەندەرەکان کە بە لایەنگری ئینگلیزەکان تۆمەتبار بوو، لەو بەڵگە گرنگ و بەنرخانەی ئەم کۆمەڵەیەن (**باشوور ، ١٨، ٣٤، ٣٥**)، چونکە زۆربەی داستانەکانی ئەو گۆڕانکارییانەی ئەو سەردەمە، لە سەرچاوە ناتەباکانی ئەوانن. بەڵگەنامەکانی تری ئەم بەشە، چەند بابەتێکن لەمەڕ دەستێوەردانی سەربازی بەریتانیا و دابەشکردنی بەرەبەرەی هێزەخۆجێییەکان، بە دوو باڵی **ئینگلیز** و **دژە ئینگلیز** (**باشوور ٤٨ تا ٥٣**).

لە بارەی گۆڕانکارییە گرنگەکانی مانگی **موحەڕەمی ١٣٣٤**، کە کارەساتی کۆڕەوی لێکەوتەوە، بەڵگەنامەی بەرچاو بەدی نەکرا. لەمەڕ کۆبوونەوەی سەرەتایی هێزەکانی رووسیا لە **قەزوین** و هێرش کردنیان بۆ سەر **تاران**، چەند بەڵگەنامەی ناراستەوخۆ (**باکوور ٢٣، ٢٤**) و کورتە بەڵگەنامەیەك لەبەردەستدایە. لە سەر دامەزراندنی **کۆمیتەی بەرگری نیشتمانی**یش لە **قوم** چەند بەڵگەنامەیەکی ناراستەوخۆ هەیە (**باشوور ٦٠ تا ٦٢**)، لەمەڕ کاریگەری ئەو دامەزراوەیە لەسەر ویلایەتەکان چەند بەڵگەنامەی سەرنج راکیش لە بەردەستدان (**باشوور ٥٨، رۆژهەلات ٢٣، ٢٤، ٢٥**). لە بارەی هێرشی سەربازی رووسیا هیچ بەڵگەنامەیەکی گرنگ بە جێنەماوە (**باشوور ٥٣**)، چەند راپۆرتی تێلگرافی تر (**رۆژئاوا ١٧٥**) و چەند بابەتێك لەسەر دیلەکانی جەنگ (**رۆژئاوا ١٧٦ تا ١٨١**) و ئاگادارینامەیەك (**ئاگادارینامە و بەڵگەنامە لێرەو لەویٚ ٩**) لەبەردەستن.

لە بارەی گۆڕانکارییەکانی باشوور لەم قۆناغەدا، کە زنجیرەیەك رووداوی وەك، پێکدادانی نێوان عەشیرەتەکانی **دەشت** و **دەشتستان** و هێزەکانی ئینگلیزی نیشتەجێی **بوشەهر** و **کودەتای** بەڕێوەبەرایەتی پۆلیسی **شیراز**، هیچ بەڵگەنامەیەك بەرچاو نەکەوت. سەبارەت بە چۆنییەتی هەرەسهێنانی راپەڕینەکەی پۆلیسی **شیراز**یش هیچ بەڵگەنامەیەك نییە. لەم رووەوە دەتوانین ئاماژە بەچەند بەڵگەنامەی کردەوەکانی حکومەت (**واتە دژی کودەتای شیراز**) بکەین (**باشوور ٦٤، ٦٥، ٦٧**). لە رۆژهەڵاتیش، لە بارەی زنجیرەی شەڕە بەرفراوانەکانی هێزە سەربازییەکانی بەریتانیا، دژی عەشیرەتەکانی **سیستان** و **بلوچستان**، چوکترین نیشانە بەدی ناکریٚ. تەنیا ئاماژە بە شەڕێك کراوە لە **جەمادی دووەمی ١٣٣٤**، لە نێوان **ئینگلیز** و **ئەفغانییەکان**، کە پێدەچیٚ ئەویش درۆ بیٚ (**رۆژهەڵات ٢٨**).

لە بەڵگەنامەکانی باکووردا، سەبارەت بە دەستێوەردانی هێزە سەربازییەکانی رووسیا، لە ماوەی نێوان ساڵی **١٣٣٤** تا سەرەتای ساڵی **١٣٣٥**، لەمەڕ هەوڵی عەشیرەتەکانی **شاهسۆنی ئازەربایجان** و هەوڵەکانیان بۆ رێکخستنەوەی ئەو دەڤەرە (**باکوور ٣٨، ٣٩، ٤٢ تا ٤٤**)، چەند نموونەیەك دەبینرێن. لە **تورکمەن سەحرا**ش چەند هەوڵی هاوشێوە دەدریٚ و چەند وردە شەڕێکیش روودەدەن (**باکوور ٣٧، ٤٠، ٤١**). لە بارەی پەرەپێدانی **رێکخراوی قۆزاقخانە** و پێکهاتە و رەفتاری ئەم هێزە نوێیە، لە ویلایەتەکانی باکوور و باکووری رۆژئاوای ئێران، هەروەها هەڵویستی ئێران لەوبارەیەوە، چەند بەڵگەنامەی سەرنجراکێش لە بەردەستن (**باکوور**

**٦٠، ٦١**). لەمەڕ پێکدادانی ئەو کاتی هێزەکانی رووسیا و عوسمانی، لە ناوچەکانی رۆژئاوای وڵات، هیچ بەڵگەنامەیە بەرچاو نەکەوت، بەڵام لەبارەی داگیرکردنی **کرماشان** لەلایەن هێزەکانی رووسیاوە چەند بەڵگەنامە هەیە (**رۆژئاوا ١٨٢، ١٨٧ تا ١٩٠**).

شۆرشی **١٩١٧** ی رووسیا، کە بوو بەهۆی لاواز بوون و داگیرکاری رووسیا لە ئێران، بە شێوازی نائارامی و ئاژاوە لە زۆر ناوچەی ژێردەستی رووسەکان، رەنگیدایەوە (**باکوور ٥٥، ٥٦، رۆژهەلات ٥٦**). هیندێك لەو بەڵگەنامانەش، باسی جۆرێك جیابوونەوە و سەربەخۆیی رەئی کاربەدەستانی خۆجێیی روسیایان دەکرد لە ئێران. باسی گەڕانەوەی بەشێك لە هێزەکانی رووسیا، لە رێگەی **قەزوینەوە** بۆ رووسیا و گوێنەدانیان بە فەرمانی کاربەدەستانی پایەبەرزی خۆیان، نیشانەی ئەو هەرەسهێنانە بوون، تەنانەت لە دوا قۆناغەکاندا، چەند پێکدادانێك لە نێوان بەلشڤیکەکان و هێزەکانی وەفادار بە رژێمی پێشوو، بەدی دەکرێ (**باکوور ٦٦**). لە رۆژهەڵاتی ئێران، لەگەڵ ئەوەشدا بە شێکی زۆر لە هێزەکانی ئینگلیز، پاراستنی بەشی باکووری **کەمەربەندی رۆژهەڵات** دەگرنە ئەستۆ، کە ماوەیەك پێشتر لە دەست هێزەکانی روسیا دابوو، وەلێ قورسایی سەرەکی پاراستنی نەزمی ناوچەکە و رێگرتن لە بڵاوبوونەوەی ئاژاوە، لە ئەستۆی **قەوامولسەڵتە** والی **خوراسان** دابوو (**رۆژهەڵات ٥٧ تا ٦١**). بەڵام لە رۆژئاوای وڵات بەهۆی بوونی سوپای عوسمانی، دەرفەتێك بۆ گەڕاندنەوەی دەسەڵاتی دەوڵەتی ناوەندی هەڵنەکەوت و هێزەکانی عوسمانی، بەپەلە کەوتنە پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییەی، لە رۆیشتنی هێزەکانی رووسیاوە وەدیهاتبوو. گەڕانەوەی دووبارەی ئەوانە واتە عوسمانییەکان، بە بەراورد لەگەڵ قۆناغەکانی پێشوو، پێشڕەویان لە ناوسنووری ئێراندا (**باکوور ١٥ تا ١٨**) ستەم و دەسدرێژییەکی بەرچاوی لەگەڵ دابوو (**باکوور ٨٦ تا ٨٩، ٩٢ تا ٩٧، ٩٩ تا ١٠١، ١٠٣**). ئینجا زەمینەی داگیرکاری عوسمانییەکان لەباربووە و ئەوان بۆ سەقامگیر کردنی دەسەڵاتی خۆیان بە تەواوی، هەوڵ دەدەن کەسایەتی و تیرە و تایفە بەرچاوەکانی ناوچەکە بۆلای خۆیان رابکێشن (**باکوور ١٠٤، ١٠٦، ١٠٧**)، دیارە ئەم هەوڵانە تەنیا بە **ئازەربایجانەوە** نەدەوەستان، **لە ئیسترابادیش** ئەم هەوڵانە لەئارادابوون (**باکوور ١١٥**).

کەچی لە باشووری ئێران، کە لەو قۆناغەدا **فارس و کرمان** دامەزراندن و بەرفراوان بوونی (**پۆلیسی باشوور**) یان بەخۆوە بینی، دیسانەوە بەڵگەنامەی ئەوتۆ لەبەر دەست دانین. لە ئاستەنگ کردنەکانی هێزی ئینگلیز، تەنیا رەشنووسی چەند راپۆرتێکی وەزارەتی پۆست

و تێلگراف بەجێماون (**باشوور ٦٨، ٧٢**) و لەسەر شەڕە بەربڵاوەکانیان، لە ناوچەکانی ڕۆژهەڵات و باکووری ڕۆژهەڵاتی **فارس، چەند** بەڵگەنامەیەك هەن. هەرچەندە ئەو بەڵگەنامانە، بە بەراورد لەگەڵ بەرفراوانی شەڕەکانی ئینگلیز، کەم و ناتەواون، کەچی باسێکی دڵتەزێنی بێ بەزەیی و دڵڕەقی هێزەکانی پۆلیسی باشوور دەخاتە روو (**باشوور ٧٣ تا ٨٢، ٨٧، ٩٢ تا ٩٤**).

بە نزیك بوونەوەی قۆناغەکانی کۆتایی جەنگ، دیسانەوەی ژمارەی بەڵگەنامە پەیوەندیدارەکان کەم دەبنەوە. ئەوبەڵگەنامانەی پەیوەستن بە ڕۆژئاواوە، جگە لە گەڕانەوەی دەستەیەك پەنابەر (**ڕۆژئاوا ١٨٦**) یا درێژەی بەسەرهاتی **تایفەی باجەلان** لە دوا ساڵەکانی جەنگ (**ڕۆژئاوا ١٩١**)، پتر راپۆرتی گشتین لەسەر ئاژاوە و بێ نەزمی ناوچەکە (**ڕۆژئاوا ١٩٤ تا ١٩٨**). لەبارەی **راپەڕینی جەنگەڵ** یەك لەگەنامە خراوەتە روو (باکوور ٩٠).

لە ئازەربایجان لە قۆناغەکانی سەرەتای جەنگ دا، کۆمەڵێك لە **عەشیرەتەکانی ئاشووری** ناو سنووری عوسمانی هاتنە ناو خاکی ئێران و بوونە پەنابەر (**باکوور ٣٣**)، لەمەڕ **کۆمەڵکوژی** ئەوانە (واتە **ئاشوورییەکان یا ئەرمەنییەکان**)، لە ساڵەکانی جەنگ لە ناوچەکە دا، لەلایەن عوسمانییەکان و لایەنگرانیان، بەڵگەیەك بەرچاو نەکەوت، وەلێ لە بارەی کار و چالاکییەکانیان لە قۆناغەکانی کۆتایی جەنگ بە پشتیوانی هێزەکانی هاوپەیمانان، چەند بەڵگەنامەیەك لە بەردەستن (**باکوور ٧٤، ٧٦، ٨٠، ٨٤، ١٠٢**).

شەڕی هێزەکانی ئینگلیز لەگەڵ عەشیرەتەکانی **قەشقایی** و تیرەو تایفەکانی تری هاوپەیمانیان، لە قۆناغە گرنگ و کۆتاییەکانی جەنگ بوو، کەچی سەرەڕای گرنگیی و رەهەندی بەربڵاوی ئەو شەڕە، بەڵگەنامەی بەرچاو سەبارەت بە چەندی و چۆنی رووداوەکە لە دەست دانییە، دیارە هەر ئەم چەند بەڵگەنامەیەی بە جێماون، لە رووی بابەتەکانیان بۆ روونتر کردنەوەی هەڵویستەکانی حکومەتی ناوەندی، بە بەڵگەنامەی گرنگ دادەنرێن (**باشوور ٩٦ تا ١٠٠**). بەڵگەنامەی گرنگی تر و شیاوی هەڵویستە لەسەر کردنی ئەم قۆناغە، رەشنووسی پرۆژەیەکە، کە دەوڵەتی **صمصامولسەلتەنەی** بەختیاری، لە دوایین ڕۆژەکانی دەسەلاتی خۆی بۆ هەڵوەشاندنەوەی تێکڕای ئەو پەیمان و ئیمتیاز و بەڵێننامەی سەدساڵە، لەگەڵ دەوڵەتی رووسیا ئامادەی کردبوو (**ئاگاداری و چەند بەڵگەنامە لێرەو لەوێ**) مێژووی نووسینی یەکێك

لەو بەڵگەنامانە (**هەمان بەڵگە نامەی ١٦**)ە، تەنانەت دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کاتەی کابینەی دوایی واتە کاتێك کابینەی **وسوقولدەولە** دامەزرا.

جەنگی یەکەمی جیهانی لە ٩ ی سەفەری ١٣٣٧/ ٢٢ی دووی عەقرەبی ١٢٩٧ کۆتایی هات، وەلێ لەبەرئەوەی مانەوەی هێزەکانی بەریتانیا لە ئێران درێژەی کێشا، بە پێویست زانرا بۆ ئاماژە بە پاشکۆی هێندێك لەو گۆڕانکارییانەی سەردەمی جەنگ، سەرنج بدرێتە چەند بەڵگەنامەیەك. لە باشووری ئێران شەڕی هێزە سەربازییەکانی بەریتانیا، بۆ کردنەوەی ڕێگای **بووشەهر- شیراز** بەردەوام بوو، لەو جەنگە بەرفراوانەدا تەنیا دوو راپۆرتی تێلگرافی لە بارەی ڕووداوەکانی **کازرون** کەوتنە بەرچاو (**باشوور ١٠٢، ١٠٣**). لە رۆژهەلاتی ئێران هەنگاوە سەربازییەکانی بەریتانیا، کە لە بنەڕەتدا بە ناوی بەرەنگاربوونەوەی مەترسی وەرێکەوتنی ئەڵمان و عوسمانییەکان بەرەو هیند و ئەفغانستان، دەستی پێکردبوو، بەرەبەرە لایەنی ڕووبەڕووبوونەوەی بەلشڤیزمی وەخۆگرت (**رۆژهەلات ٦٢، ٦٧**) و هەبوونی بەردەوامی هێزی سەربازی ئەوان، لەگەڵ دەستێوەردانیان لە کاروباری ناوخۆ، وەك کاروباری گومرگی وڵات (**رۆژهەلات٦٣، ٦٤**) و چەند کێشەیەکی بۆ بازرگانە ئێرانییەکان هێنایە ئاراوە (**رۆژهەلاتی ٦٦**). لە دەڤەرەکانی باکووری رۆژئاوای ئێران، چەند بەڵگەنامەی سەرنجڕاکێشی رەفتاری بەریتانیا بەرامبەر بە کوردەکانی ناوچەکە دەبینرێن (**١٠٨ تا ١١٠**).

لە میانەی ئەو بابەتانەی لە ناساندنی هەندێك لە بەڵگەنامەکانی ئەم کۆمەڵەیەدا باسکران، ئاماژە بە بڕێك بەڵگە و بەڵگەنامەی بەشی کۆتایی ئەم کۆمەڵەیە کراوە، واتە بەشی (**ئاگادارییەکان و چەند بەڵگەنامەیەك لێرەو لەوێ**)، چەند بابەتی تریش ماون، کە بەکورتی ئاماژەیان پێدەکەین: **بەڵگەنامەی ژمارە ٨** واتە (**یاسای پەیوەست بە دراوی بانکی پاشایەتی ئێران**)، کە تایبەتە بەو کاتەی شاڵاوی خەڵك بۆ گۆڕینەوەی **دراوی** بانك بە **سکەی** چاپ کراو، قەیرانێکی خوڵقاند و بانکی پاشایەتی ناچار بوو سنوورێك بۆ ئەم کارە دابنێ.

لەمەڕ شێوازی چاپەمەنییەکانی وڵات و پاراستنی بێلایەنی و بەرهەڵستی کاربەدەستانی پایەبەرزی رووسی، سەبارەت بەو بابەتانەی لە رۆژنامەکانی تاران دا بڵاوکرابوونەوە، پێشتر چەند بەڵگەنامەیەك بەرچاو کەوتووە (**باکوور ٩ تا ١٣**). لە بەڵگەنامەکانی وەزارەتی پەروەردە و فێرکردنیش دا چەند بەڵگەنامەیەك بەرچاو کەوتوون، کە لە بەشی (**ئاگادارییەکان و چەند بەڵگەنامەیەك لێرەو لەوێ ٥ و ٦**)دا هەن.

له بەڵگەنامەکانی وەزارەتی ناوخۆدا، بەڵگەنامەیکی بێ بەرواریش له بارەی جموجوڵی ئەڵمانییەکان له ئێراندا دەبینرێ، که لەم بەشەدا هاتووە (**ژمارە ٩**). له بەڵگەنامەکانی تری ئەم بەشە، بەڵگەنامەی **ژمارە ١٠** یە، که پرسی کرینی شمەك و خۆراکی هێزە بیانییەکان و کاریگەری لەسەر بارودۆخی گشتی شمەك و خۆراکی ناوچە جیاجیاکانی ئێران، روون دەکاتەوە، که ئەوسا یەکێك بووە له پرسە گرنگەکان.

ئەم کۆمەڵەیە بریتی نییە له هەموو ئەو بەڵگە و بەڵگەنامانەی وەزارەتی ناوخۆ، سەبارەت به تێکڕای ئەو گۆڕانکارییانەی ساڵانی نێوان **١٣٣٢** تا **١٣٣٧**ی هجری قەمەری. پێوەری سەرەکی بۆ هەڵبژاردن لەم کۆمەڵەیەدا، خستنه رووی ئەو بەڵگەنامانه بوون، که به شێوەیەك کاریگەری بوونی سەربازی، یا هەوڵی سیاسی هێزە بیانییەکان له ئێرانی سەردەمی جەنگدا، رون دەکەنەوە. دیارە له چەند روویەکەوە پێویست بوو، لەو هەڵبژاردنەدا تێبینی گشتی تر لەبەرچاو بگیرێ. بۆ نموونه له بەشی بەڵگەنامەکانی رۆژهەڵات دا، راپۆرت و ئەو بەڵگانەی باسی کاریگەری راستەوخۆی بوونی سەربازی و هەوڵ سیاسی هێزە دەرەکییەکان دەکەن، به بەراورد لەگەڵ بەشەکانی تری وڵات کەمترە، لەبەرئەوە بەڵگەنامەکانی ئەم بەشە تارادەیەك گشتی ترن.

لەو خاڵانەی تر که پێویسته سەرنجیان بدرێتێ، پەخشان و شێوەی نووسینی ئەو بەڵگەنامانەیە. زۆربەیان تێلگرافن و ئاوای ئاخاوتنەکەشیان تێلگرافییە. هێندێکیان رەمز بوون و (**وەك دەرکەوتووە**) رەنگە دۆزینەوەی رەمزەکانیان هەڵەی تێدابێ. ژمارەیەکیان وەك زۆربەی راپۆرتی ئەفسەرانی سوێدی بەڕێوەبەرایەتی پۆلیس، هەر ئەوکاتە له دەقە فەرەنسییەکەیانەوە وەرگێڕدراون، به ئەگەری زۆر به پێوەوری ئەمڕۆی وەرگێڕان ئەوەندە رێك و رەوان نین. یەك دوو بەڵگەنامەش ماون، نامەی **زایر خزری تەنگستانی** بۆ **غەزنەفەرولسەڵتەنەی برازجانی** ناردووە (**باشوور ٤٨**)، رواڵەتی دیالەکتی ناوچەیی پێوە دیارە.

هەروەك دەبینین، بەشی سەرەکی ئەم کۆمەڵەیە له کۆمەڵەی بەڵگەنامەکانی وەزارەتی ناوخۆ، پەیوەندییان به گۆڕانکارییەکانی ساڵی یەکەمی جەنگەوە هەیە. ئەو بەڵگەنامانەی له **کتێبی سەوزی** وەزارەتی ناوخۆشدا تۆمار کراون پەیوەندییان به هەمان ساڵەوە هەیە. هەرچەنده چەند بەڵگەنامەیان به جیاوازییەکی کەم له ناو بەڵگەنامەکانی وەزارەت ناوخۆدا

دەبینرێن[1]، وەلێ دەتوانین بڵێین بەڵگەنامەکانی ئەم دوو کۆمەڵەیە تەواوکەری یەکترن. چونکە بەشی سسەرەکی بەڵگەنامەکانی کتێبی سەوز پەیوەستن بە پێشێل کردنی بێلایەنی ئێران لە ناوچەکانی ئازەربایجان و کوردستان، کە بەڵگەنامەکانی وەزارەتی ناوخۆ لەم رووەوە لاوازن. لەبری ئەوە بەشی بەڵگەنامەکانی وەزارەتی ناوخۆ لەمەڕ گۆڕانکارییەکانی کرماشان، بەبەراورد لەگەڵ بەڵگەنامەکانی کتێبی سەوز دەوڵەمەنتر و بە نرخترن.

بەداخەوە هەروەك دەبینین بەڵگەنامەکانی سالآنی دوایی جەنگ، بە لەبەرچاو گرتنی گۆڕانکارییە گرینگەکانی ئەو سەردەمە، زۆر پەرشوبلاو و ناتەواون. تێکڕای کۆمەڵەی بەڵگەنامەکانی وەزارەتی ناوخۆ، کە لە رێکخراوی بەڵگەنامە نیشتمانییەکان پارێزراون، وەیا لانی کەم بەشێکی پەیوەستن بە ساڵەکانی دوای **راپەرینی مەشروتە** تا رووداوەکانی شەهریوەری ئەو راپەڕینە، کە تارادەیەك لە لایەن نووسەرەوە تاوتوێ کراوە، کۆمەڵەیەکی تەواو نییە و زۆربەی کارەسات و رووداوە گرنگەکانی مێژووی ئەو سەردەمەیان تێدا نییە.

بەڵام ئەوەی لەم کۆمەڵە بچوکەی بەڵگەنامەکانی جەنگی یەکەمی جیهانیدا، پتر لە هەر شتێکی تر جێگایان بە تاڵە، ئەو بەڵگەنامانەن کە پەیوەنیدیان بە دەستێوەردان و بوونی سەربازی هێزەکانی رووسیا و ئینگلیزەوە هەیە. ئەم بابەتە لەمەڕ دەستێوەردانی بەریتانیا لەو سەردەمەدا، راستە، بەتایبەتی ئەو هێزەی بەرەبەرە بوو بە تاکە دەسەڵاتی چالاکی وڵات. وێدەچێ هەر بەڵگەنامە و راپۆرتێك کە پەیوەندی بە دەستێوەردانی سیاسی و بوونی سەربازی بەریتانیاوە بووبێ لەناو چووە، یا لە ناو کۆمەڵە پارێزراوەکانی وەزارەتی ناوخۆوە راگوێزراون. ئەمەش خۆی لەخۆیدا هۆشدارییەکی جیدییە بۆ ئێمە، تا بە هەوڵ و دواداچوونی پتر، خەریکی کۆکردنەوەی هەر بەڵگە و بەڵگەنامەیەکی پەیوەندیدار بین و شوێنی ئەم کەموکوڕییە خەماوییە پڕبکەینەوە.

بەڵگە و بەڵگەنامەکانی ناو ئەرشیفی ئەڵمان و عوسمانی و رووسیا و بەریتانیا، لەگەڵ ئەوەشدا بۆ روون کردنەوەی گۆڕانکارییەکانی ناو ئێران لە جەنگی یەکەمی جیهانی دا، زۆر بەکەڵك و پێویست بن، بەڵام هەرگیز ناتوانن جێگای بەڵگەنامە ناوخۆییەکان بگرنەوە. وەك نموونە دەتوانین ئاماژە بەو بەڵگەنامانە بکەین، کە پەیوەستن بە شەڕەکانی پۆلیسی باشوور، لە

---

١- وەك بەڵگەنامەکانی ژمارە ٢٧٢ و ٢٩٨ ی کتێبی سەوز کە بە پێی ژمارەی بەڵگەنامەکانی باشوور ٦ و رۆژئاوا ٨٧ ن.

دەڤەری رۆژهەڵات و باکووری رۆژهەڵاتی فارس لە پاییزی ساڵی **١٣٣٥** دا. لە ناوەڕاستی ئۆکتۆبەری ساڵی **١٩١٧** واتە کۆتایی **زیحەجەی ١٣٣٥**، بە شێکی هێزەکانی پۆلیسی باشوور، بە فەرماندەیی **لیوتینان کۆلۆنێل فرن** هێرشیان کردە سەر گوندی **جوزەم**. شرۆڤەی نووسراوی فەرمی وەزارەتی جەنگی بەریتانیا، بۆ ئەو رووداوە بەم شێوەی خوارەوەیە: (... **لیوتنان کولۆنێل فرن** یش هات تا لە **جوزەم**، کە ناوەندێکی چەتەکان بوو، کۆمەڵێك چەتە بە سزای خۆیان بگەیەنێ. ئەوان سێ پۆلیسی بێ چەکی باشووریان کوشتبوو، کە بۆ کرینی شتومەك رۆیشتبوون بۆ ئەوێ. ناوبراو **قەڵا بەردینەکەی جوزەم** و چەند بورجێکی قەڵایەکەی روخاند)[1]. ئێستا ئەگەر ئەم گێڕانەوەیە لەگەڵ (**روونکردنەوەی رەعیەتەکانی شاری بابەك**) (**باشوور ٩٢**) بەراورد بکەین، نموونەیەکی روونی ئەو جیاوازییە زۆرەی بەڵگەنامە فەرمییەکانی بیانی دەبینین، لەگەڵ ناوەرۆکی بەڵگەنامە ناوخۆییەکانی ئێران، هەروەها چۆنییەتی سەرپۆش کردنی تاوانکاری و دڕندەیی ئەوان لەناو وڵاتدا.

تا بتوانن لەم بوارەدا، خاڵە تاریکەکانی مێژووی هاوچەرخ رووناك بکەینەوە، دەبێ بەهەر شێوەیەك بێ ئەم کەموکوڕییە لە ناوبرێ. دیارە بەردەوام ئەگەری ئەوە هەیە، ئەم جۆرە بەڵگەنامە بزربووانە، لە ناو بەڵگەنامەی شەخسی کاربەدەستانی ئەو کاتەدا بدۆزینەوە و بیانخەینە بەردەست بۆ ئەوەی هەمووان کەڵکی لێوەربگرن[2]. هەروەها بەڵگەنامەکانی وەزارەتی دەرەوەی ئێران، بە بەراورد لەگەڵ بەڵگەنامەکانی وەزارەتی ناوخۆ کەمتر دزراون. ئاشکرایە هێشتا بەشێکی بەڵگەنامەکانی وەزارەتی ناوخۆ تاوتوێ نەکراون. لەگەڵ ئەوەشدا بەڕواڵەت

---

١- ژەنراڵ فریدریك جیمز مابرلی، شەرەکان لە ئێران (راپۆرتەکانی جەنگی یەکەمی جیهانی)، وەرگێڕانی کاوەی بەیات، تاران، ئینتشاراتی رەسا، ١٣٦٩ ل٣٣٧.

٢- وەك نموونە دەتوانین ئاماژە بکەین بە(راپۆرتەکانی پۆلیسی نهێنی سەبارەت بە دەنگۆکانی شار-بە هەوڵی ئیرجی ئەفشار، تاران، ئینتشاراتی تەڵایە، ١٣٦٧)، کەبریتیە لە کۆمەڵەی سێهەمی بیرەوەرییەکان و بەڵگەنامەکانی موستەشارودەولە سادق. ئەو کۆمەڵەیە پێکهاتووە لە چەند راپۆرتێك کە موستەشاودەولە لە کاتی پۆستی وەزیری ناوخۆدا (ساڵەکانی ١٣٣٣ تا ١٣٣٥)، لە پۆلیسی تاران وەریگرتوون و بە پێی یاسا لە ئەرشیفی وەزارەتی ناوخۆدا پارێزراون. چەند راپۆرتی هاوشێوەی، کە هێندێکیان رووداوەکانی ساڵانی پێشوو و دواتری شاری تاران وەخۆ دەگرن، لە بەڵگەنامەکانی وەزارەتی ناوخۆ (رێکخراوی بەڵگەنامە نیشتمانییەکانی ئێران) دا هەن، کە بەداخەوە زۆر ناتەواون.

هەموو بەڵگەنامە کۆنەکانی ئەرشیفی وەزارەتی ناوخۆ لە تاران رادەستی رێکخراوی بەڵگەنامە نیشتمانییەکانی ئێران کراون، و کاری ناساندن و پۆلێن کردنیان کۆتایی هاتووە، بەڵام هێشتا کۆمەڵێکی زۆری ئەو بەڵگە و بەڵگەنامانە لە ئەرشیفی سڕی پارێزگا و فەرمانداریەکانی ناوچەکانی وڵاتدا پارێزراون و لەم ساڵانەی دواییدا، لەلایەن رێکخراوی بەڵگەنامە نیشتمانییەکانەوە، هەوڵی کۆکردنەوەی ئەو بەڵگەنامە پەرش و بڵاوانە دراوە و هیوادارین بە بەردەوامبوونی ئەو هەوڵ و بە دواداچوونە، کاری ناساندن و لێکجیاکردنەوەیان، هەنگاوێکی بنەڕەتی بێت، بۆ کامڵ کردنی بەڵگەنامەکانی وەزارەتی ناوخۆ و بەڵگەنامەی پتر بخرێتە بەردەست توێژەرانی مێژووی هاوچەرخ.

**کاوەی بەیات**

**بەهاری ١٣٦٩**

## پێشەکی چاپی دووەم:

لە ماوەی ئەو یانزە ساڵەی بەسەر چاپی یەکەمی ئەم کۆمەڵە بەڵگە نامەیەدا تێپەڕیوە، ئەو بەڵگەنامانەی پەیوەستن بە جەنگی یەکەمی جیهانی، چەند گوڕانێکیان بەسەدرا هاتووە، سەرەتا بە هۆی ئەکتیڤ بوونی بەشێك لە ناوەندەکانی ئەرشیفی وڵات و دامەزراندنی چەند ناوەندی فەرمی هاوشێوە، ئیتر پانتایی بەڵگەنامە فەرمییەکانی تایبەت بەم رووداوە، لە سنووری بەڵگەنامەکانی ئۆرگانی نیشتمانی بەڵگەنامەکان تێدەپەڕێ. بەڵگەنامەکانی وەزراەتی دەرەوەی ئێران لەو رووە بە سەرنجدانی ئەو راپۆرتانەی لە کەناڵە خۆماڵییەکانەوە گەیشتوون، کۆمەڵێك بەڵگەنامەی گرنگ و بەرچاوی کۆکردۆتەوە، کە کەموزۆر لە چوارچێوەی دامەزراوەی نوییَ **ناوەندی بەڵگەنامەکان و مێژووی دیپلۆماسی** وەزارەتی کاروباری دەرەوە دا، دەستەبەر دەکرێن.

جگە لەوە بە سپاردنی بە شێك لە بەڵگەنامەکانی ئەرشیفی سەرۆك وەزیران، بە **دامەزراوەی توێژینەوەی فەرهەنگی ئێران** پەیوەست بە بونیادی موستەزعەفان، کە ئێستا دامەزراوەی مێژووی هاوچەرخی ئێرانە، واتە ئەو بەڵگەنامانەی پەیوەستن بە گۆڕانکارییەکانی ئێران لە ساڵەکانی کۆتایی جەنگی یەکەمی جیهانی دا، تا سەرەتای دامەزراندنی **زنجیرەی پەهلەوی**، دەتوانین دەستمان بگا بەو راپۆرتە گرنگانەی لە مەڕ ساڵەکانی کۆتایی جەنگ دا لە ئارادان.

گۆڕانکارییەکی گرنگی تر، سپاردنی بەشێکی تری بەڵگەنامەکانی وەزارەتی ناوخۆی وڵاتە، بە ئۆرگانی بەڵگەنامەگەلی نیشتمانی، کە بەشێکیان بە تەواوکەری کۆمەڵەکەی پێشوو دادەنرێن و، لە چاپی دووەمی ئەم کتێبەدا لەبەرچاو گیراون. بەشێکی گرنگی ئەم بەڵگە تازە دەسکەوتوانە (واتە زنجیرەی **ب** وەزارەتی ناوخۆ) پەیوەندییان بە گۆڕانکاری بەشی رۆژئاوای وڵاتەوە هەیە.

گرنگترینیان بریتییە لە: **حەفتا برگە**، نووسراوی ئاڵوگۆڕکراوی نێوان وەزارەتی ناوخۆ و حکومەتی کوردستان (**بە سەرۆکایەتی سەردار محی**)، کە لە رووی راڤەکردنی گۆڕانکارییەکانی ئەو دەڤەرە زۆر گرنگن (بەڵگەنامەی ژمارە: **١، ٣-٧، ٩-١٦، ١٨-٤٧، ٤١١-٤١٨، ٦١، ٦٢، ٦٥، ٦٦، ٧١،٧٠،٦٧، ٧٤،٧٢-٧٨، ٨٤،٨٣،٨٢، ٨٩**)، هەروەها کۆمەڵە نووسراوی ئاڵوگۆڕ کراوی نێوان وەزارەتی ناوخۆ حکومەتی هەمەدان (بە **سەرلەشکری عەباس میرزا**)، ئەوەش لە رووی ئاگاداربوون لە بارودۆخی ئەو دەڤەرە گرنگە، (بەڵگەنامەی ژمارە: **٩٤، ١٠٥، ١١٣، ١١٦، ١٢٢، ١٢٧، ١٢٨، ١٢٩، ١٥٢، ١٥٣، ١٥٤، ١٥٩، ١٦٠، ١٦١، ١٦٣، ١٦٤، ١٦٥، ١٦٦، ١٦٧، ١٦٨**)، چەند راپۆرتێکیش لەمەر **لۆرستان** کە کە پتر پەیوەندیان بە بارودۆخی **پشتکووهەوە** هەیە ( بەڵگەنامەی ژمارە: **١، ٨، ١٨، ٦٩، ٧٣**)، چەند بەڵگە نامەیەکیش لە بارەی **کرماشانە** (بەڵگەنامەی ژمارە: **٥٩، ٧٩، ١١٤، ١٢٧، ١٣٠**)، چەند راپۆرتێکیش لە **گەڕووسەوە** کە پتر ئاماژەن بە گۆڕانکارییەکانی کوردستان (بەڵگەنامەی ژمارە: **١٣٨، ١٦٢**)، دوو راپۆرتیش لەمەڕ **ئەراك** و **قەزوینن** (بەڵگەنامەی **١٨٣، ١٩٣**)، لەم نێوانەدا جگە لە دوو بەڵگەنامەی دوایی، ئەوانی تر هەموویان پەیوەندییان بە رووداوگەلی قۆناغەکانی سەرەتای جەنگەوە هەیە لە رۆژئاوای وڵات.

لە چاپی دووەمی (**ئێران و جەنگی یەکەمی جیهانی**) دا، لەمەڕ شوێنەکانی تری وڵات چەند بەڵگە نامەیەکی تر زیاد کراون، لەوانە چەند بەڵگەنامەیەك لەمەڕ گۆڕانکارییەکانی باشوور، کە گرنکترینیان بریتین لە: کۆمەڵە راپۆرتێك و نووسراوەکانی **موەقرلدەولە**، فەرمانڕەوای بەندەرەکانی باشوور (بەڵگەنامەی ژمارە:**١١، ٢٣، ٢٤، ٢٧، ٢٩، ٣١، ٣٢**)، وە چەند راپۆرتی تر (بەڵگەنامەی ژمارە: **٢٨، ٥٤، ٥٧، ٦٦**).

چەند بەڵگەنامەی زیادکراو بۆ ئەو کۆمەڵە بەڵگەنامانەی تایبەتن بە گۆڕانکارییەکانی رۆژهەڵاتی وڵات، بریتین لە چەند راپۆرت لەمەڕ باشوور (بەڵگەنامەی ژمارە: **٢٧، ٣٢، ٣٩، ٤٠** بەڕێوەبەرایەتی رۆژهەڵات)، **سیستان** (بەڵگەنامەی ژمارە: **٢٩، ٣٣**)، چەند تیلگرافێك (بەڵگەنامەی ژمارە: **٣٤، ٣٧، ٣٨، ٤١، ٤٢**) دەستێوەردانی رووسەکان لە کاروباری ناوخۆی وڵات (بەڵگەنامەی ژمارە: **٣٠، ٣١، ٣٦**). لە کۆتاییدا چەند راپۆرتێك لەمەڕ روون کردنەوەی بایەتێکی تایبەت بە دەستێوەردانی نارەوای ئینگلیزەکان لە کاروباری ناوخۆی وڵات، واتە رووداوی **روکنولوەزارە** ( بەڵگەنامەی ژمارە: **٣٥، ٤٣، ٤٩**).

بەداخەوە لەم کۆمەڵە بەڵگەنامەیە نوێیەدا، سەبارەت بە گۆڕانکارییەکانی ئیدارەی دەڤەری باکوور، کە شوێنی گرنگ و پڕ ڕووداوی وەك **ئستراباد**، **مازندەران**، **گەیلان** و **ئازەربایجان**، لەخۆ دەگرن، بەڵگەنامەیەکی ئەوتۆمان بەرچاو نەکەوت. چەند ڕاپۆرتێك لەبارەی **تەورێز** (بەڵگەنامەی ژمارە: **٤٨**، **٥٠**، **٩٨**)، ڕاپۆرتێکیش لە مەڕ **ورمێ** (بەڵگەنامەی ژمارە: **٤٩**) و دوو ڕاپۆرتیش لە ئیسترابادەوە (بەڵگەنامەی ژمارە: **٥١**، **١٠٥**) کە دوو بەڵگەنامەی تازە بوون لەو بەشە زیادکراوەدا.

لە کۆتاییدا سوپاس و پێزانینم هەیە بۆ سەرپەرشتیارانی بەڕێزی ئۆرگانی بەڵگەنامە نیشتمانییەکانی ئێران، کە لایان لە چاپکردنەوەی ئەم کۆمەڵە بەڵگەنامەیە کردەوە.

**کاوەی بەیات**

**بەهاری ١٣٨١**

# بەڵگەنامەکانی بەڕێوەبەرایەتی بەشی خۆرئاوا:

هاتنی تۆفیق بەگ وەك سەرۆکی یەکیەکی (اتحاد) عوسمانییەکان بۆ بانە و کاریگەری ئەم گۆڕانکارییە لەسەر ئاسایشی ناوچەکە.

بوونی ئەفسەرێکی ئەڵمانی لە قەسری شیرین و، ئەگەری هاتنی چەك وچۆڵی سەربازی و گرووپێکی تری ئەڵمانی بۆ قەسری شیرین و، نیگەرانی نوێنەری سیاسی رووسیا لەم گۆڕانکارییە.

٤٩- **(راپۆرتی سنوورپارێزی زەهاو، ٢٢ و رەبیعولئەوەلی ١٣٣٣)**.....................٩٨

هەوڵی ئیقبال سوڵتان بۆ رێگرتن لە هاتنی صمصام و لەماڵێك بۆ قەسری شیرین، پڕۆپاگەندە بە سوودی عوسمانییەکان و، هاتنی باروبنەی سەربازی ئەڵمانی بۆ ناو ئێران.

٥٠- **(راپۆرتی سنوورپارێزی زەهاو، ٢٥ و رەبیعولئەوەلی ١٣٣٣)**.....................٩٩

نارەزایەتی نوێنەرانی سیاسی ئەڵمان لە قەسری شیرین، سەبارەت بە راپۆرتی نیگەرانی نوێنەری سیاسی رووسیا لە لایەن سنوورپارێزی زەهاو و هەوڵی ئەو بۆ راکێشانی سەرنجی سنوورپارێزانی ئێران، هاتنی بەردەوامی چەکوچۆڵ بۆ ناوئێران و کۆبوونەوەی هێزەکانی عوسمانی لەسەر سنوور.

٥١- **(حکومەتی کوردستان، ٢٥ ی رەبیعولئەولی ١٣٣٣)**.......................١٠٠

راگەیاندنی هاتنی عەلی ئەفەندی و ئەو هێزەی لەگەڵی دایە.

٥٢- **(لە حکومەتی کوردستانەوە بۆ سەرۆك وەزیران، ٢٧ ی رەبیعولئەوەلی ١٣٣٣)..١٠١**

جەخت کردنەوەی دووبارە لەسەر دەست لە کارکێشانەوە و گلەیی لە نەبوون پشتیوانی دەوڵەت لەم قۆناغەی خزمەت کردندا.

٥٣- **(لە حکومەتی کوردستانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ٢٨ ی رەبیعولئەوەلی ١٣٣٣)....١٠٢**

جموجوڵی هێزەکانی قۆزاق لە ناو شار و ئەگەری ئاژاوە.

٥٤- **(لە حکومەتی کوردستانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ٢٨ ی رەبیعولئەوەلی ١٣٣٣)....١٠٣**

چالاکییەکانی عەلی ئەفەندی لە ناو عەشیرەتەکانی گوڵباغی و مەندمی.

٥٥- **(لە حکومەتی کوردستانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ٢٨ ی رەبیعولئەوەلی ١٣٣٣).....١٠٣**

هاتنی مەحمود بەگ، شابەندەرخانە عوسمانی.

٥٦- **(له حکومەتی کوردستانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، یەکەمی ڕەبیعولئاخری ١٣٣٣)...١٠٤**

فەرمانی شابەندەر بۆ لایەنگرانی عوسمانی بۆ پەیوەست بوون بە ئۆردووی ئیسلامی.

٥٧- **(له حکومەتی کوردستانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، یەکەمی ڕەبیعولسانی ١٣٣٣)....١٠٤**

ڕاپۆرتی مەریوان سەبارەت بە گواستنەوەی سەربازەکانی عوسمانی لەو سنوورە.

٥٨- **(له حکومەتی کوردستانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، یەکەمی ڕەبیعولسانی ١٣٣٣)....١٠٥**

جموجوڵی شێخ عەلائەدین لەسەر بانگەشەی شێخ حسامەدین.

٥٩- **(له وەزراەتی ناوخۆوە بۆ حکومەتی کرماشان، یەکەمی ڕەبیعولسانی ١٣٣٣).....١٠٥**

پرسوجۆ لەمەر ئامادەکاری هاتنی وەزیر موختارانی نەمساو ئەڵمان بۆ ئێران.

٦٠- **(له والی پشتکووهەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، یەکەمی ڕەبیعولسانی ١٣٣٣)........١٠٦**

ڕێکخستنی بارودۆخی پشتکووه و، ناردنی هێزە ناوچەییەکان بۆ دەڤەرەکانی باشووری ڕۆژئاوای پشتکووه، کە گۆڕەپانی پێکدادانی هێزەکانی دەرەکییە.

٦١- **(له حکومەتی کوردستانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ٢ ی ڕەبیعولسانی ١٣٣٣)......١٠٧**

ئامادەبوونی شێخ عارف لە ناوشار و، ئەگەری پەیوەست بوونی بە جیهادی عوسمانییەکانەوە.

٦٢- **(له حکومەتی کوردستانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ٣ ی ڕەبیعولسانی ١٣٣٣).......١٠٧**

جموجوڵی شێخ مەعروف و عەلی ئەفەندی بە مەبەستی (جیهاد).

٦٣- **(ڕاپۆرتی سنوورپارێزیی، ٣ ی ڕەبیع ولسانی ١٣٣٣).......................١٠٨**

هەڵویستی صمصام و لەمالکی سنجابی سەبارەت بە هەوڵدانی عوسمانییەکان، چەند و چۆنی کۆبوونەوەی هێزەکانی عوسمانییەکان لە سەر سنوور و پەیوەندییان لەگەڵ سەرۆك عەشیرەتەکانی ناوچەکە، هەوڵدانی کونسوڵی ئەڵمان، پڕۆپاگەندەی بەکرێگیراوانی

عوسمانی و ڕێبازی سەرۆکی بەڕێوەبەرییەتییەکان لەو ناوچەیە، چۆنییەتی جموجوڵی نوێنەری رووس لە قەسری شیرین.

راپۆرتێکی ڕەزاقولی خانی نیزام و لسەڵتەنە لە وەڵامی لێپرسینەوەکانی دەوڵەت سەبارەت بە هەڵوێستی والی پشتکووە لە بارەی جەنگ، هەروەها ئاماژە کردن بە کارتێکدەری ئەمیر موفەخەم والی کرماشان لەو کاتەدا.

٧٤- **لە حکومەتی کوردستانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ١٦ ڕەبیعولسانی ١٣٣٣)....١١٩**

ئاگادارکردنەوەی دەوڵەت لە نیازی مسۆگەری حکومەت، لەسەر سەندنەوەی بەرپرسیارییەتی بە هۆی نەخۆشی و ڕەزامەندی دەوڵەت لەسەر ئەم بابەتە.

٧٥- **(لە وەزارەتی ناوخۆوە بۆ حکومەتی کوردستان، ١٧ ڕەبیع ولسانی ١٣٣٣)....١٢٠**

لە وەڵامی ڕاپۆرتێکی پێشوودا (بەڵگەی ژمارە ٧٢) بەڵێنی ڕاگەیشتن بە کارەکانی فەریدولدەوڵە.

٧٦- **(لە حکومەتی کوردستانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ١٩ ی ڕەبیع و لسانی ١٣٣٣)..........١٢١**

ڕاپۆرتێك سەبارەت بە بە هێز بوونی نەخۆشی و پێویستیی پەسەند کردنی هەرچی زووتری دەست لە کارکێشانەوەی ئەو.

٧٧- **(لە حکومەتی کوردستانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ٢١ ی ڕەبیع ولسانی ١٣٣٣)....... ١٢١**

ڕاپۆرتی هەوڵی ترۆر کردنی حاکم کە بە ئاکام نەگەیشت.

٧٨- **لە وەزارەتی ناوخۆ بۆ حکومەتی کوردستان، ٢٢ ی ڕەبیع ولسانی ١٣٣٣)............١٢٢**

دواخستنی پەسەند کردنی داواکاری دەست لە کار کیشانەوە، بۆ دوای گەڕانەوەی سەرۆك وەزیران لە سەفەری جاجڕود.

٧٩- **(لە وەزارەتی ناوخۆوە بۆ حکومەتی کوردستان، ٢٤ ڕەبیع ولسانی ١٣٣٣)............١٢٢**

جەخت کردنەوە لەسەر ڕێزگرتنی شایستە لە پێشوازی کردنی وەزیر موختارانی ئەڵمان و نەمسا.

٨٠- **(ڕاپۆرتێکی کارگێڕی لە خانەقینەوە، ٢٥ ی ڕەبیع ولسانی ١٣٣٣).................... ١٢٣**

چڕبوونەوەی جموجوڵی عوسمانییەکان لەسەر خاڵە سنوورییەکان و ئامادەبوونی پیاوەکانیان لە ناو عەشیرەتەکانی کەڵهوڕ.

هاتنی وەزیرموختارانی ئەڵمان و نەمسا بۆ کرماشان و گفتگۆی کارگێڕ لەگەڵیان سەبارەت بە هاندان و دەسدرێژی عوسمانییەکان و جەخت کردنەوە لەسەر رێگرتن لەو جۆرە جموجوڵانە.

**٩٨- (لەوەزارەتی کاروباری دەرەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ٢ ی جەمادی دووەمی ١٣٣٣)....١٤٢**

راپۆرتی وەزارەتی دەرەوە سەبارەت بە تێلگرافی بانکی شاهنشاهی لەسەر بوونی چەند کەسێکی ئەڵمانی لەناو شار.

**٩٩- (راپۆرتی سەرۆکی بانکی شاهنشاهی کرماشان، جەمادی دووەمی ١٣٣٣)...........١٤٢**

سەرۆکی بانك رایگەیاندووە ئەگەر ئەو سەت و پەنجا ئەڵمانییەی نیشتەجێی کرماشانن بڵاونەکرێنەوە، چارمان نییە جگە لە داخستنی ئەو لقەی بانك و گەڕانەوە بەرەو هەمەدان.

**١٠٠- (لە وەزارەتی کاروباری دەرەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ٢ ی جەمادی دووەمی ١٣٣٣)....١٤٣**

راگەیاندنی گەیشتنی دوو نامەی تر لە لقی بانکی شاهنشاهی کرماشان و پێویستیی چارەسەری ئەم پرسە.

**١٠١- (نامەی بەڕێوەبەری بانکی شاهنشاهی، جەمادی دووەمی ١٣٣٣)...........١٤٤**

شپرزەبوونی خەڵکی کرماشان لە داخستنی لقی بانکی شاهنشاهی.

**١٠٢- (لە وەزارەتی ناوخۆوە بۆ حکومەتی کرماشان، ٥ ی جەمادی دووەمی ١٣٣٣)......١٤٤**

داوای چارەسەر کردنی ئەو شپرزەیی و ناسەقامگیرییەی لە داخستنی بانك سەرچاوە گرتووە.

**١٠٣- (لە وەزارەتی ناوخۆوە بۆ وەزارەتی دەرەوە، ٥ ی جەمادی دووەمی ١٣٣٣).....١٤٥**

بە وەزارەتی دەرەوەی رادەگەیەنێ، کە فەرمانی چارەسەر کردنی بارودۆخی کرماشان دوای داخستنی بانکی شاهنشاهی دەرچووە.

**١٠٤- (راپۆرتی حکومەتی کرماشان، ٣ ی جەمادی دووەمی ١٣٣٣)...............١٤٥**

پێشرەوی هێزەکانی عوسمانی و عەشایرە لایەنگرەکانیان بەرەو کرند، دەستدرێژیان بۆ سەر خەڵکی و ئەگەری پێشرەوییان بەرەو کرماشان.

**١٠٥- (له وەزارەت ناوخۆوە بۆ حكومەتی هەمەدان، ٣ی جەمادی ئاخر ١٣٣٣)......١٤٧**

جەخت كردنەوە لەسەر رەواندنەوەی نیگەرانی لە بەرشێوەبردنی بانكی شاهنشاهی لە هەمەدان و پاراستنی ئاسایشیان.

**١٠٦- (له وەزارەتی ناوخۆوە بۆ والی پشتكووه، ٧ ی جەمادی دووەمی ١٣٣٣)......١٤٨**

دروستكردنی قەڵای سنووری لەو سەر سنووره و، دابین كردنی تێچووەكەی لەلایەن وەزارەتی داراییيەوە.

**١٠٧- (له والی پشتكووهەوە بۆ وەزارەت ناوخۆ، جەمادی دووەمی ١٣٣٣)..........١٤٨**

وەڵامی نامەی وەزارەتی ناوخۆ (بەڵگەنامەی ژمارە ١٠٦).

**١٠٨- (له وەزارەتی ناوخۆوە بۆ زانایانی دینی كرماشان، ٧ ی جەمادی دووەمی ١٣٣٣)....١٤٩**

جەخت كردنەوەی وەزارەت ناوخۆ، لەسەر ئەركی زانایانی دینی و روحانییەكانی كرماشان، سەبارەت بە رێنوێنی كردنی خەڵكی شار لەم بارودۆخە مەترسیدارەدا.

**١٠٩- (له كارگێڕی كرماشانەوە بۆ وەزارەتی دەرەوە، ٨ ی جەمادی دووەمی ١٣٣٣).......١٥٠**

نارەزایەتی دانیشتوانی شار لە ئەمیر موفەخەمی بەختیاری (والی كرماشان) و پێویستیی ناردنی هێز بۆ رێگرتن لە راپەڕینی خەڵك و جموجوڵی كونسوڵی ئەڵمان.

**١١٠- (له كارگێڕی كرماشانەوە بۆ وەزارەتی دەرەوە، ٨ ی جەمادی دووەمی ١٣٣٣).......١٥١**

یەكگرتن و یەكییەتی خەڵك بۆ بەرەنگاری پێشڕەوی هێزەكانی عوسمانی بەرەو كرماشان و نارەزایەتی شاراوەی كونسوڵی ئەڵمان لەو هەنگاوەی عوسمانییەكان.

**١١١- (له وەزارەتی ناوخۆوە بۆ زانایانی دینیی كرماشان، ٩ ی جەمادی دووەمی ١٣٣٣)...١٥٢**

جەخت كردنەوەی دووبارە لە سەر رێنوینی خەڵك و هەوڵدان بۆ رێگرتن لە هەوڵی ئاژاوەگێڕان.

**١١٢- (له صمصام و لمەمالكی سنجابییەوە بۆ نوێنەرانی كرماشان، ٨ ی جەمادی دووەمی ١٣٣٣).....١٥٣**

سكالا لەسەر هێرشی سەربازی عوسمانییەكان و لایەنگرانیان لە ناوچەكە، بۆ سەر عەشیرەتەكانی سنجابی و ناكاریگەریی نێوبژیوانی كونسوڵی ئەڵمان.

**١١٣- (له حكومەتی هەمەدانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ٩ ی جەمادی دووەمی ١٣٣٣)........١٥٣**

راپۆرتی نەهێشتنی نیگەرانی لە بەشەکانی بانك و هاتنی چەند چەکداری ئەڵمانی .

**١١٤- (لە وەزارەتی ناوخۆوە بۆحکومەتی کرماشان، بێ بەراور)...................١٥٤**

روونکردنەوەی پتر سەبارەت بە چۆنییەتی پێشوازیکردنی وەزیرموختارانی ئەڵمان و نەمسا.

**١١٥- (لە حکومەتی کرماشانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ١٠ ی جەمادی دووەمی ١٣٣٣)......١٥٤**

راپۆرتی ئەمیر موفەخەم لەسەر نامەی حوسێن رەئوف بەگ فەرماندەی هێزەکانی عوسمانی و داوای روونکردنەوەی داوایەکارییەکانی ناوبراو لە دەوڵەت.

**١١٦- (لە وەزارەتی ناوخۆوە بۆ حکومەتی هەمەدان، ١٢ ی جەمادی ئاخر ١٣٣٣)...١٥٥**

فەرمانی چاودێری کردنی (فوخت) ی ئەڵمانی.

**١١٧- (لە حکومەتی کرماشانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ١٣ ی جەمادی دووەمی ١٣٣٣)......١٥٦**

راپۆرتی ئەمیر موفەخەم سەبارەت بە ناکۆکی نێوان عەشایری دەلۆی عوسمانی و سنجابیەکان و هەوڵی ئەو بۆ نەهێشتنی ئەو ناکۆکییانە.

**١١٨- (لە حکومەتی کرماشانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ١٦ ی جەمادی دووەمی ١٣٣٣).....١٥٧**

راپۆرتی ئەمیر موفەخەم سەبارەت بە مانگرتنی صمصام ولمەمالك لە کونسوڵگەری ئەڵمان و، گرفتەکانی چارەسەر کردنی ناکۆکی نێوان سنجابییەکان و عوسمانییەکان.

**١١٩- (لە حکومەتی کرماشانەوە بۆ سەرۆك وەزیران، ١٦ ی جەمادی دووەمی ١٣٣٣).....١٥٨**

داوای تێلگرافی راستەوخۆ بۆ راپۆرتدان لەسەر گۆڕانکارییەکانی ئەو دەڤەرە.

**١٢٠- (لە حکومەتی کرماشانەوە بۆ سەرۆك وەزیران، ١٦ ی جەمادی دووەمی ١٣٣٣).....١٥٨**

بارودۆخی ئاڵۆزی شار و ویلایەت، بێ پارەیی حکومەت کە بۆتە سەربار و داوای چارەسەر کردنی بە پەلەی ئەم پرسانە.

**١٢١- (له حکومەتی کرماشانەوە بۆ میرزا سلێمانی مەیکەدە، جەمادی دووەمی ١٣٣٣)......١٦٠**

جەخت کردنەوەی دووبارەی ئەمیر موفەخەم بۆ جێبەجێ کردنی داوایەکانی.

**١٢٢- (له حکومەتی هەمەدانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ١٦ جەمادی دووەمی ١٣٣٣)........١٦٠**

چەند روونکردنەوەیەك لە وەڵامی ئاگادار کردنی دەوڵەت لە بارودۆخی فوخت، (بەڵگەی ژمارە ١١٦).

**١٢٣- (له وەزارەتی ناوخۆوە بۆ حکومەتی کرماشان، ١٨ جەمادی دووەمی ١٣٣٣).........١٦١**

وەڵامی تێلگرافەکانی ئەم دواییەی ئەمیر موفەخەم و بەڵێنی جێبەجێ کردنی داوایەکانی.

**١٢٤- (له بەڕێوەبەرایەتی پۆلیسەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ٢٤ جەمادی دووەمی ١٣٣٣)......١٦٢**

زیاد بوونی ژمارەی پۆلیسی نیشتەجێ لە کرماشان و هەمەدان و، داوای دەرکردنی چەکی کڕینی دانەوێڵەی پێویستی ئەم گروپە لە لایەن وەزارتی داراییەوە.

**١٢٥- (له سەرۆکانی کەڵهوڕەوە بۆ وەزاتی ناخۆ، ٥ ی رەجەبی ١٣٣٣)..............١٦٢**

داوای روونکردنەوە لە وەزارەتی ناوخۆ، سەبارەت بە دامەزراندنی (ئۆردووی یەکییەتی ئیسلامی) و بەرەنگاربوونەوەی دەستدرێژییەکانی رووس و ئینگلیز.

**١٢٦- (عەریزەی مەجیدخانی سالارلسوڵتان، رەجەبی ١٣٣٣)......................١٦٤**

باسی جموجوڵ و لەشکرکێشی هێزەکانی عوسمانی لە ناوچە سنوورییەکانی ئێران و دەستدرێژییان بۆ سەر تایفەی باجەلان.

**١٢٧- (له حکومەتی کرماشانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ٧ ی رەجەبی ١٣٣٣)..........١٦٦**

پێویستی پێدانی مووچەی دواکەوتووی سوارەکانی ویلایەت و هێزەکانی پۆلیس و رازی بوونی بەڕێوەبەرایەتی پۆلیس بۆ چاودێریی کۆکردنەوی باج.

**١٢٨- (له حکومەتی هەمەدانەوە بۆ وەزارەت ناوخۆ، ٧ ی رەجەبی ١٣٣٣)..........١٦٧**

هەواڵی هاتنی قۆزاقەکانی رووس بۆ هەمەدان و شێواندنی رای گشتی، کاردانەوەی کۆمەڵایەتی عوسمانییەکان لە بەرامبەر ئەم گۆڕانکارییە و ئەگەری سەرهەڵدانی شەڕ لە ناو شار.

١٢٩- **(له حکومەتی هەمەدانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ١٠ رەجەبی ١٣٣٣)..................١٦٩**

راپۆرتی ناردنی چەند قۆزاق بۆ نەغەدە و پێویستیی لێپێچینەوە لێیان.

١٣٠- **(له حکومەتی کرماشانەوە بۆ وەزارەت ناوخۆ، ١١ ی رەجەبی ١٣٣٣)..................١٦٩**

جەخت کردنەوەی دووبارە، لەسەر پێدانی مووچەی دواکەوتووی سوارەکانی ویلایەت و هێزەکانی پۆلیس و پێشکەش کردنی چەند پێشنیار لەم بارەوە.

١٣١- **(له وەزارەتی دەرەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ١٩ ی رەجەبی ١٣٣٣)................١٧٠**

هەوڵەکانی حوسێن رەئوف بەگ فەرماندەی هێزەکانی عوسمانی، بۆ وەدەسهێنانی هاوکاریی سەردار موعەزەم حاکمی گۆران.

١٣٢- **(له کارگێڕی کرماشانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ١٩ ی رەجەب ١٣٣٣)...............١٧١**

نامەیەکی تر سەبارەت بە هەوڵ و هەڕەشەکانی رەئوف بەگ بۆ وەدەستهێنانی هاوکاری سەرکردەکانی گۆران.

١٣٣- **(له وەزارەتی ناوخۆوە بۆ وەزارەتی دەرەوە، ٢١ ی رەجەبی ١٣٣٣)..............١٧٢**

راپۆرتی وەزارەتی ناوخۆ سەبارەت بە توانای بەرەنگاربوونەوەی دەستدرێژی هێزەکانی عوسمانی و، وەرگرتنی رەئی وەزارەتی دەرەوە بۆ هەڵبژاردنی باشترین رێگای بەرەنگاربوونەوە.

١٣٤- **(له سەرۆکایەتی بەڕێوەبەرایەتی پۆلیسی کرماشتانەوە، بۆ بەڕێوەبەرایەتی پۆلیسی ناوەند، ٢ ی شەعبانی ١٣٣٣).......١٧٣**

راپۆرتی مێجەر ئیدوال سەبارەت بە مەرجە پێشنیار کراوەکانی رەئوف بەگ، بۆ پاشەکشە لە شوێنە داگیرکراوەکانی ئێران.

١٣٥- **(له وەزارەتی کاروباری دەرەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ١٥ ی شەعبانی ١٣٣٣).........١٧٤**

بڕیاری خەڵکی کرماشان لەسەر تۆمار کردنی چەکی دەوڵەت و هێنانی هێزەکانی رووس بۆ بەرەنگاربوونەوەی هێزەکانی عوسمانی.

(١)

**(له حکومەتی کوردستانەوە بۆ وەزارەتی دەرەوە ١٣ شەوال ١٣٣٢)**

**بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، لە کوردستانەوە بۆ تاران، ژمارەی تێلگراف ٨٤، بەرواری ناردن ١٣، بەرواری گەیشتن ١٤ ی سنبولە ١٣٣٢.**

کۆپییەی وەزارەتی دەرەوەی بەرێزی، وەزارەتی شکۆمەندی ناوخۆ، هەر شکۆدار بێ. ئەمڕۆ دەنگۆیە کە سەرۆکی ئاسایش، کارگێڕەکەی بە تکای **شابەندەرخانە**[١] لەسەر کار لاداوە. سەرەڕای ئەوەی کە ئەم رووداوە نەزمی ویلایەتی بە تەواوی تێکداوە، لێکجیاکردنەوەی هاولاتی و ناهاولاتی نەهێشتووە، ئیتر ناوخۆی کوردستان خاوەنی نەزم نییە، کاربەدەستانی ئاسایشی خەڵك، هەڕەشە لە هەموو لایەك دەکەن. بە راشکاوی پێتان رادەگەیەنم ئەگەر ئەوە راست بێت، بۆ پاراستنی ئابڕووی خۆم، بێ ئەوەی چاوەڕێی مۆڵەتی دەوڵەت بکەم، دەسبەکار دەبم، لەبەرئەوە بەرپرسیاری پاراستنی ئاسایشی ویلایەتی کوردستان ناتوانم قبوڵ بکەم. تکام وایە تیلگرافێکی پر سۆز بە مەبەستی پشتیوانی کردنی کارگێریی لە رێگەی بەندەوە بۆ بەرێوەبەری ئاسایش بنێری.

سێزدەهەمی سونبولە ژمارە ٢٢، **سەردار محی.**

(٢٩٠٠٠٥٧٩١)

---

١- ناوی بارەگای هێزەکانی عوسمانییە.

## (٢)

**له ویلایەتی لۆڕستانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ ٤ زی حەجەی ١٣٣٢**

**بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، لە بروجەردەوە بۆ تاران، ژمارەی تیلگراف ١٢، بەرواری ناردن ٢، بەرواری گەیشتن ٢عقرب ١٣٣٢**

مەقامی پایە بەرزی وەزارەتی ناوخۆ هەر شکۆداربێ. هەر وەك لەمەوبەر پێمراگەیاندن، بەڕێز جەنابی **ئەمیر جەنگ**[١] والی **پشتکووە** و **پیشکووە**[٢]، لە هیچ جۆرە گیانبەختکردنێك بۆ دەوڵەت درێغی نەکردووە، دوو کوڕی خۆی لەگەڵ سێ هەزار کەس ڕەوانەی **ئالشتر**[٣] کردووە و، کوڕێکی تری لە پشتکووەهەوە لەگەڵ خەڵکێکی زۆر لە لایەن ئەمیرەوە بۆ دابین کردنی نەزمی لۆڕستان دێن، خوا ئاگادارە کە ناوبراو تەنیا بۆ ساتێکیش لەئەرکە دەوڵەتییەکانی غافڵ نەبووە. تکام وایە بڕیارێك دەربکەن، ناوبراو بکرێ بە جێگری والی ویلایەتی لۆڕستان و شمشیرێکی زیوکفتی پێ ببەخشن، تا ببێتە جێگای شانازی و لە پاڵ ئەوەدا فەرمان دەربکەن بکرێ بە والی پشتکووە و پێشکووە، شمشێرەکەی یەکسەر بۆ بنێرن، تا پێی دڵگەرم بێ.

٤ زی حەجە، ژمارە ٩٣١، **ڕەزاقولی خان**٤.

( ٢\٦٥٢٧) .

---

١- لە هێندێك بەڵگەنامەدا (غولامرەزا ئەمیر جەنگ) ە.

٢- دوو شاروچکەی سەر بە (هەمەدانن)

٣- شارۆچکەیەکە سەر بە هەمەدان

٤- مەبەست ڕەزاقولی خانی نیزام ولسەڵتەنەیە.

## (٣)

**(له حکومەتی کوردستانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ٥ زی حەجەی ١٣٣٢)**

**بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، لە کوردستانەوە بۆ تاران، ژمارەی تێلگراف ٦، بەرواری ناردن٣، بەرواری گەیشتن ٣ عقرب ١٣٣٢.**

تاران، مەقامی پایە بەرزی وەزارەتی ناوخۆ، هەر شکۆدار بێ، **شێخەکان** داوای مۆڵەت دەکەن، باری ناوچەکە واپێویست دەکا مۆڵەتیان پێ بدرێ، ئەگەر بە سوزەوە مامەڵەیان لەگەڵ نەکرێ، دەبێتە هۆی رەنجاندیان و دواتر پێش پێگرتنیان دژوار دەبێ. شەوی ٣ ی عەقرەب، ژمارە ٧٤١، **سەردار محی**. (٢\٥٨١٥)

## (٤)

**(له حکومەتی کوردستانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، لە کوردستانەو بۆ تاران، ژمارەی تێلگراف ١٣، بەرواری ناردن ٣، بەرواری گەیشتن ٤ی عەقرەب ١٣٣٢)**

مەقامی پایە بەرزی وەزارەتی ناوخۆ، هەر شکۆدار بێ. ئەمڕۆ بەیانی شێخەکان لەگەڵ چەند خراپکارێك، هەڕەشەیان لە خەڵك کردووە و دوکان و بازاریان داخستووە. حکومەت یەکسەر کەوتە پێش پێگرتنیان و بە زۆری و راوێژ لە ماوەی یەك کاتژمێردا تێکڕای دووکانەکانمان کردەوە و خەڵك بە ئاسوودەیی خەرکی کار و پیشەی خۆیان بوون[١]. و هەڕەشەی جیدی حکومەت، وەئاگای هێنانەوە تا لە سنووری خۆیان تێنەپەڕن و بۆ ئاشتەوایی ناوبژیوانیان نارد، دواتر هەر ئەنجامێکی هەبوو ئاگادارتان دەکەینەوە.

سێهەمی عەقرەب، ژمارە ٧٤٧، **سەردار محی**٢.

(٢\٥٨١٥)

---

١- نەخوێندرایەوە.

٢- والی کرماشان بووە

## (٥)

**(لە وەزارەتی ناوخۆوە بۆ حکومەتی کوردستان، ٩ ی زی حەجەی ١٣٣٢)**

**وەزارەتی ناوخۆ، زۆر بەپەلە، بەرواری ٩ ی زی حەجەی ١٣٣٢**

بۆ حکومەتی کوردستان رەمزدار بکرێ. تێلگرافی ژمارە ٧٤٧ گەیشت، کاری بەرێزتان لەمەڕ هەرەشە و رێگرتن لە خراپکاری بەجێ بوو، وەلێ بە پێی بارودۆخی دوای ئەو هەرەشەیە، لاواندنەوە پێویستە.

(وێدەچێ واژۆی مستوفیلمەمالکی لەسەر بێ)

(٢\٥٨١٥)

## (٦)

**(لە حکومەتی کوردستانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ١٦ زی حەجەی ١٣٣٢)**

**بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران ، لە کوردستانەوە بۆ تاران، ژمارەی تێلگراف ٥٩، بەرواری ناردن ١٤، بەرواری گەیشتن ١٧ عەقرەبی ١٣٣٢.**

مەقامی پایە بەرزی وەزارەتی ناوخۆ، هەر شکۆدار بێ. بە بڕیاری ئەو راپۆرتەی گەیشتووە، **تۆفیق بەگ** ناوێك بە خۆی و ژمارەیەك سەرباز لە لایەن عوسمانییەکانەوە گەیشتۆتە کۆتایی سنووری خاکی خۆیان، واتە دەڤەری **بانە**. عەشیرەتەکانی ئەو ناوە و تەنانەت خەڵکی هەورامان و مەریوانیشی بە بەڵێنی مووچەی زۆر، داوای پشتیوانی لێکردوون، هەروەها دەڵێ: لەبەر ئەوەی ئاسایشتان نییە پەنا بۆ ئێمە بێنن تا لەشکرتان بۆ بنێرین و بتانپارێزین. ئەمڕۆش لە هەمەدانەوە تێلگرافیان کردووە کە **موختار بەگ** جێگری سەفارەتی مەزن، لە کوردستانەوە هاتووە بە رێگەی مەریواندا دەچێت بۆ ناو خاکی عوسمانی، ئەمەش بەڵگەی راستی راپۆرتەکەیە، چونکە لە **هەمەدان** و کرماشانەوە رێگەی راستەوخۆیان هەیە بۆ بەغداد.

ی ١٤عەقرەب، ژمارە ٨٠٣، **سەردار محی.**

(٢\٥٧٠١)

## (٧)

**(لە حکومەتی کوردستانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ٣٠ زی حەجەی ١٣٣٢)**

**بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران ، لە کوردستانەوە بۆ تاران، ژمارەی تێلگراف ٨٢، بەرواری ناردن ١٨، بەرواری گەیشتن ٢٠ی عەقرەب ١٣٣٢.**

تاران مەقامی پایە بەرزی وەزارەتی ناوخۆ، هەرشکۆدار بێ. لەم کاتە دا کە جەنگی نێوان دەوڵەتی عوسمانی و رووس دەستی پێکردوە، بە پێویستی دەزانم سەرنجتان بۆ بایەخی پێگەی کوردستان رابکێشم، چونکە تێکڕای خەڵکی ئەم دەڤەرە بە پێی بروای دینی خۆیان، کاتێك کە سوڵتانی عوسمانی بەشدار جەنگ دەبێ و بە پێی فتوای **شیخولئیسلام ئەسلامبوڵ**، جیهاد کردن بەئەرکی دینی خۆیان دەزانن. جاڕچیانی عوسمانی بە جیدی بانگهێشتی خەڵك دەکەن بۆ جیهاد. بەندە دەبێ داوا لەخەڵکی شار بکەم بێلایەنی خۆیان بپارێزن، چونکە هۆز و تیرە سەرەکییەکانی دەوروبەر زوو هەڵدەخەڵەتێن و بەشداری جەنگ دەکەن و دەبنە هۆی دەردەسەرییەکی زۆر بۆ ئێمە. پێویستە خودی بەندە سەرێکی سەرسنوورەکان بدەم و بە راوێژ و هەڕەشە هۆز و تیرەکان لە رەفتاری هەڵە بگێڕمەوە، بەڵکو بە ویستی خوا بێ لایەنی بە تەواوی بپارێزین و، لەپاڵ ئەو سەفەرەدا دەسەڵاتی ئاژاوەگێڕان کە نزیکەی هەزار کەس دەبن، لەناو بەرم. تکام وایە داواکانی بەندە کە بە تێلگراف پێم راگەیاندون بە پەلە بیگەیەنن، بەڵکو خوابکا لەبەرامبەر سەرکردایەتی دەوڵەت و ویژدانی دەوڵەتخوازی خۆمدا بەرپرسیار نەبم.

**شەوی ١٨ی عەقرەب، ژمارە ٨٦٢، سەردار محی.**

**(٢٩٠٠٠٥٨٠٩)**

**(٨)**

**(لە وەزارەتی ناوخۆوە بۆ ویلایەتی لۆڕستان ٢٠ زی حەججەی ١٣٣٢)**

**وەزارەتی نـاوخۆ، ژمـارەی نووسـراوی تۆمـار کـراو ١٥٠٣٧\٢٥٣٥ بـەرواری ٢٠ زی حەججەی ١٣٣٢**

ویلایەتی پڕ شکۆی بروجەرد و لۆڕستان و عەرەبستان، بە پێی راپۆرتێك کە لە بەڕێوەبەرایەتی پۆلیسەوە پێمان گەیشتووە، سەرۆکی **دارۆغەی بروجەرد** بەردەوام کێشە بۆ بەڕێوەبەرایەتی پۆلیس دروست دەکات، بە هیچ شێوەیەك لە کاروباری پۆلیس دا هاوڕانییە، ئەم پرسەش ئاستەنگێکی گەورەی وەدی هێناوە، لەبەرئەوە داواکارین بەرپرسی دارۆغە بانگ بکرێ و بە جیدی رخنەی لێبگیرێ و، بەڵێن بدا کە ئاکاری خۆی چاك بکات تا لەمەودوا یارمەتی تەواوی کاروباری پۆلیس بدات و، رەفتارێکی ئەوتۆ نەنوێنێ لەو بەڕێوەبەرایەتییەوە سکاڵامان پێبگات و ناوبراو بەرپرسیاری بخرێتە ئەستۆ. (واژۆیەکەی ناخوێندرێتەوە)

بکرێتە نهێنی، (لە پەراوێز)

(٢٩٤٠٠٠٦٥٢)

**(٩)**

**(لە وەزارەتی ناوخۆوە بۆ حکومەتی کوردستان، ٢٥ ی زی حەججەی ١٣٣٢)**

**بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، لە کوردستانەوە بۆ تاران، ژمارەی تێلگراف ١٠٣، بەرواری ناردن شەوی ٢٣، بەرواری گەیشتن ٢٤ عەقرەب ١٣٣٢.**

مەقامی پایە بەرزی وەزارەتی ناوخۆ، هەر شکۆدار بێ. ئەمڕۆ نووسراوێکی شێخ **عەلائەدینی عوسمانی** لە رێگەی موریدێکییەوە بەدەستم گەیشتووە، کە لە سنووری مەریوان و ئەو دەڤەرە جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی بە ئەرکی سەرشان دەزانن، بەڵام خۆی کەسێکە لەگەڵ دزو جەردەکان ئەژمار دەکرێ. نووسیویەتی لەلایەن والی پاشای

موسڵ و موتەسەڕیف پاشای سلیمانی و خودی شێخ و سەرۆك تیرەکانی ئەو دەڤەرە، بانگهێشت کراون بۆ جیهاد و جەختی لەسەر ئەوە کردۆتەوە کە لە ڕێگەی بانەوە بەرەو ئازەربایجان و لەوێشەوە دەڕۆن تا بجەنگن و لەدەرەوەش خەریکی بانگەشەن بۆ جەنگ. لەبەرئەوەی من هاتوچۆیەکی رووکەشم لەگەڵ شێخ دا هەیە، تێبینییەکی نهێنی داوە بەبەندە و جەختی لەسەر ئەوە کردووە، کە دەشپێشخەری کردووە بەهەر شێوازێك یا هەرەشەیەك بێ، ڕێگەی لە هۆز و تیرەکان گرتووە. بە پێی ئەرکی دەوڵەتی خۆم بەردەوام دووبارەم کردۆتەوە کە کوردستان بایەخی پەیدا کردووە و، ئەگەر ڕێگەیان لێنەگیرێ، شیرازەی دەڤەری **مەریوان** بە گشتی تێکدەچێ و دەبێتە هۆی گرفتێکی گەورە بۆ ئێمە. ئەگەر داوا و ویستی بەندە لەبەرچاو نەگیرێ، هیچ پێداگریەکم نییە، تەنیا ئەوەندە نەبێ بە ئەنجومەنی سەرکردایەتی دەوڵەتم ڕاگەیاندووە، کە لە کاتی ڕووداوێکی دڵتەزین دا بەندە بە بەرپسیار نەزانن، هۆز و تیرەکان، یەکیان گرتووە و خەریکی تەراتێنن.

شەوی **٢٣** ی عەقرەب، ژمارە ٨٩٦. **سەردار محی**.

(٢\٥٨٠٩)

## (١٠)

**(له وەزارەتی ناوخۆوە بۆ حکومەتی کوردستان، ٢٦ ی زی حەججەی ١٣٣٢)**

**وەزارەتی ناوخۆ، بەشی نووسینگەی رۆژئاوا ، لە تارانەوە بۆ کوردستان، ژمارەنامەی تۆمار ٦٧٨، ٢٦ زی حەجەی ١٣٣٢.**

حکومەتی پایە بەرزی کوردستان، بە پێی ئەو زانیارییانەی پێمان گەیشتووە، نزیکەی بیست هەزار سەربازی عوسمانی بۆ سنووری بانە و سەقز هاتوون ، لەم بارەیەوە چ راپۆرتێك بە بەرێزتان گەیشتووە؟ لەم رووەوە لێکۆڵینەوەیەکی هەمە لایەنە بکەن و لە نیازی هاتنی ئەوانە تێبگەن و بە وەڵامێك پرسەکەمان پێ رابگەیەنن.

(واژۆی مستوفی لمەمالك)

(پەراوێز:) خیرا کۆدی بۆ دابنرێ.

(٢٩٠٠٠٥٧٨١)

## (١١)

**(له حکومەتی کوردستانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ٢٩ زی حەجەی ١٣٣٢)**

**بەرێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران ، لە کوردستانەوە بۆ تاران، ژمارەی تێلگراف ١١٦، بەرواری ناردن ٢٨، بەرواری گەیشتن ٢٨ ی عەقرەب ١٣٣٢.**

تاران مەقامی پایە بەرزی وەزارەتی ناوخۆ، هەر شکۆدار بێ. شێخ عەبدولحەمید کە یەکێکە لە خراپکاران و بە بڕوای خۆی بە ناوی لایەنگری عوسمانی لەگەڵ **مسیۆ شارل** (پیشکار؟) دارایی، ناراستەوخۆ خەریکی گەندەڵکاری و کۆکردنەوەی یارمەتییە بە ناوی مانگی سوور. ئەمرۆش لایەنگرانی عوسمانی لە جەژنی سەرکەوتنی عوسمانییەکان، بە دەهۆڵ و زۆرنا بە کۆڵان و بازاردا دەگەڕێن و ماڵ بە ماڵ بەسەریان دەکردنەوە. فەرمان دەرکەن کە رێ لێگرتنیان ئەرکی هەر بەشێکە. جەنراڵ کونسولی رووسیا هاتۆتە لای بەندە و دەڵێ ئەگەر

ڕێ لەم جموجوڵەی عوسمانییەکان[1] نەگرن، من بە زەبری هێز ڕێگەیان لێدەگرم. بە کارگێڕی ڕاگەیاندووە و خۆشی ڕاستەوخۆ پەیامی بۆ شابەندەر ناردووە، کە ڕێگە لەم لایەنگرانە بگرن، نەکو ئاژاوەی لێ بکەوێتەوە. پێویستە لە ڕێگە سەفارەوتەوە بەپەلە بە شابەندەر ڕابگەیەندرێ پێش بە ڕووداوەکان بگرێت.

٢٧ ی عەقرب، ژمارە ٩٥٠، **سەردار محی.**

(٢\٥٨١٠).

## (١٢)

**(لە حکومەتی کوردستانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ٢ ی موحەرەمی ١٣٣٢)**

**بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، لە کوردستانەوە بۆ تاران، ژمارەی تێلگراف ١١٦، بەرواری ناردن ٢٨، بەرواری گەیشتن ٢٨ ی عەقرەب ١٣٣٢.**

مەقامی پایە بەرزی وەزارەتی ناوخۆ، هەر شکۆدار بێ. تێلگرافی ڕەمزداری ژمارە **٦٧٨**، لە بارەی هاتنی سەربازانی عوسمانی بۆ سنووری بانە و سەقز و بەندەش پشکنینێکی تەواوی ئەو دەوروبەرەم کردووە، سەری ئەو شوێنانەم دا بۆ ئەوەی وەڵامەکەی بگەیەنمە خزمەتتان. لە بانە و سەقزەوە تا کوردستان نزیکەی سی و پێنج قۆناغە ڕێیە، لەبەر نەبوونی پۆست وتێلگراف، دەبێ بەهۆی تەتەرەوە زانیارییەکانم دەسکەوێت و، هەرچەندە ئەو دوو دەڤەرە لە دەرەوەی سنووری حکومەتی کوردستانن، وەلێ سەرەڕای ئەوەش تایبەتیم تایبەتم ناردووە و هەرچۆنێك هەواڵم بۆ بێنێتەوە بە خزمەتتانی دەگەیەنم. بەڵام من هەمیشە هەواڵی گرنگی ئەو دەڤەرەتان بە پەلە بە ڕاپۆرتی ڕەمزداردا بۆ دەنێرم، نازانم پەسەندی ناکەن یا ناگاتە بەرچاوی موبارەکتان؟ هەروەك چۆن بە تێلگرافی ڕەمزداری ژمارە **٨٩٦** باسی کارەکانی **(والی موسڵ و موتەسەریف پاشای سلێمانی)** م پێڕاگەیاندبوون، کە چۆن لە سنووری مەریوان، هوز و تیرەکانی خەڵك هاندەدەن لەڕێگەی **بانە** و **سەقز**ەوە بچنە **تەورێز** بۆ جیهاد[2]. هەرکاتێك

---

١- وشەیەکی ڕەمزەکە نەخوێندرایەوە، وێدەچێ (تورك) بێ.

٢- بەڵگەنامەی ژمارە (١٠) ی ئەم بەشە.

گەڕانەوە بە تەواوی بەڕێزتان ئاگادرا دەكەمەوە. بەبۆنەی ئەو راپۆرتانەی كە پێشتر گەیشتبوون ناوەرۆكەكەیم بە رەمز بۆ ناردبوون، وێدەچێ راست بن و لەبەر ئەوەی خەڵكی كوردستان بە تایبەتی عەشیرەتەكانی دەورو بەر، بێ گومان بە هۆی هاومەزهەبی، حەزدەكەن بەدەنگ بانگەشەكەیانەوە بچن و، هەروەك پێم راگەیاندبوون خودی بەندە، سەری سنوورەكانم داوە و بە هەر شێوەیەك بێت، رێگە لەو نیازە خراپەی عەشیرەتەكان دەگرم، ئەگینا ئەگەری خراپەكاری و گێچەڵێكی زۆر هەیە، كە بنەمای بێلایەنی كوردستان تێك دەدات.

٢٨ی عەقرەب، ژمارە ٩٦٧، **سەردار محی.**

(٢٩٠٠٠٥٧٨١).

## (١٣)

**(لە حكومەتی كوردستانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ٢ ی موحەرەمی ١٣٣٢)**

**بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، لە كوردستانەوە بۆ تاران، ژمارەی تێلگراف ١١٩، بەرواری ناردن ٢٩، بەرواری گەیشتن ٩ قەوس ١٣٣٢.**

مەقامی پایە بەرزی وەزارەتی ناوخۆ، هەر شكۆدار بێ. ئەمڕۆ هەواڵمان پێگەیشتووە، كە موتەسەریفی سلێمانی و **تابووری**[١] سەردار، لەگەڵ دووسەت و پەنجا سەربازی سوارەی تۆپخانە دێن بۆ كوردستان. راستی و درۆی هەواڵەكە دیار نییە. تەنیا بۆ ئاگاداربوونتان بە خزمەتی موبارەكتانم راگەیاند.

٢٩ ی عەقرەب، ژمارە ٩٨٤, **سەردار محی.**

(٢٩٠٠٠٥٨١٠)

---

١- تابوور، یەكەی سەربازییە بەرامبەرە بە فەوج.

## (١٤)

**(لە حکومەتی کوردستانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ٥ موحەرەم ١٣٣٢)**

**بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، لە کوردستانەوە بۆ تاران، ژمارەی تێلگراف ٤، بەرواری ناردن ٢، بەرواری گەیشتن ٩ ی قەوس ١٣٣٢.**

مەقامی پایە بەرزی وەزارەتی ناوخۆ، هەر شکۆدار بێ. هەرچەندە پێموایە راپۆرتەکانی بەندە ئەوەندە بایەخیان نییە، یا بە واقعی دیار نین تا هەواڵ بۆ بەرێزتان بنێرم، وەلێ پێشکەش کردنی بابەتەکان وەك ئەرکی سەرشانی بەندە گرنگە. ئەمرۆ **سەردار رەشید جوانڕۆیی** ناوەرۆکی ئەو داوەتنامەیەی **شێخ حسامەدینی** دانیشتووی دەوڵەتی عوسمانی دەنێرێ و داوای مۆڵەتی رۆیشتن دەکات. **شێخ حسامەدین** و ژمارەیەکی تریش رۆیشتن و ئێستا لە سنووری **سەقزن**. هەرچەندە بەندە پێمداگرت **سەردار رەشید** واز لەو بیرۆکەیە بێنێت ( وەلێ تا خۆی نەچێتە سەر سنوورەکان و بە راوێژکردن پێش بە عەشیرەتەکان نەگرێت)، کە بە ئەگەری زۆر دەڕۆن دەبنە هۆی دەردەسەرییکی زۆر. بەندە تەنیا وەك ئەرکی سەرشانم ئاگادارم کردن، بڕیاری رەتکردنەوە و پەسەند کردنی لەدەست ئەنجومەنی دەوڵەت دایە. **شێخ عەبدولحەمیدیش** کە دەزانین کێیە، بە هاندانی **موختار بەگ** کە تازە هاتۆتە کوردستان، خەریکی کۆکردنەوەی یارمەتی مانگی سوور و هاندانی خەڵکە بۆ جیهاد. شابەندەریش هەموو رۆژێك لە ماڵەکانی خۆیاندا چاوی پێیان دەکەوێت، ئەوەی پێویست بوو پێشکەشتان کرا.

٢ ی قەوس، ژمارە ١٠٠٥، **سەردار محی.**

(٢٩٠٠٠٥٨١٠)؟

## (١٥)

**(لە حکومەتی کوردستانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ٧ ی موحەرەمی ١٣٣٢)**

**بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، لە کوردستانەوە بۆ تاران، ژمارەی تێلگراف ١٠، بەرواری ناردن ٧، بەرواری گەیشتن ٩ ی قەوس ١٣٣٢.**

مەقامی پایە بەرزی وەزارەتی ناوخۆ، هەر شکۆدار بێ. ئەمڕۆ موختار بەگ بۆ دنەدان و هاندانی عەشیرەتەکانی هەورامان کەوتە ڕێ. شێخ **عەبدولحەمید مەعروف**یش، کە بەردەوام خراپەکاری ئەوم خستۆتە روو، لەگەڵ ناوبراو کەوتۆتە ڕێ، کە لەوێوە بۆ جیهاد بڕوات. بەندە ویستم نەهێڵم بڕوات، شابەندەر بووە بەموریدی ئەو، لەکاتێکدا ئەو موریدی ناوبراو نییە، بەڵکو بۆ گەندڵکاری دوای کوتووە. بەم پێیەی پێمان دەگات، لەگەڵ ئەم جۆرە کەسانە[١] چۆن مامەڵە بکەین؟ ئەگەر پێش بەم کارە بە تایبەتی عەشیرەتەکانی ئەم دەوروبەرە نەگیرێ، گەندەڵی و خراپەکارییەکی زۆر وەدیدێنن. من لەرووی ئەنجامدانی ئەرك و چالاکی خۆمەوە شتێکی ترم نییە پێشکەشتانی بکەم. ئەوەندە نەبێ کە لە سەر ڕووداوەکان بڵێم، کە تێکڕای ئەم بابەتانەم بەردەوام پێشنیار کردووە و ئێوەم ئاگادار کردووە. ئەمشەویش ئەو بابەتەی **شێخ داوود** بۆ **هەورامی** نووسیویەتی بۆ نانەوەی ئاژاوە لەلایەن عەشیرەتەکانەوە، هەواڵگری بەندە لە ناوچەی **تیلەکۆ** بووە، نووسراوەکەم بە دەست گەیشتووە و بە پۆستدا ناردمە خزمەتتان.

چوارەمی قەوس، ژمارەی ١٠٣٣، **سەردار محی.**

---

١ - نەخوێندرایەوە

## (١٦)

**(له حکومەتی کوردستانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ١٠ ی موحەرەمی ١٣٣٢)**

**بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، لە کوردستانەوە بۆ تاران، ژمارەی تێلگراف ١٠، روونکردنەوە بەهۆی خراپی هێلی تێلگراف دواکەوت. بەرواری ناردن ٥، بەرواری گەیشتن ٩ ی قەوس ١٣٣٢.**

تاران مەقامی پایە بەرزی وەزارەتی ناوخۆ، هەر شکۆدار بێ. تێلگرافی ژمارە ٣٠٣٦ ی موبارەکتانم زیارەت کرد[١] سەبارەت بە نادرنی دوو کەسی سوارە بۆ **کامیاران**، بۆ وەرگرتنی نووسراوەکانی حکومەتی **کرماشان**. ئەم فەرمانە موبارەکتان زۆر لە جێگای خۆیدایەتی و ئاگالێك بوونی حکومەتی کرماشان و کوردستان زۆر پێویستە و پێشتر حکومەتی کرماشان ئەم پرسەی بە تێلگراف گەیاندبوو، سوارەی نێردراو چوار رۆژە لە **کامیارانە** و چاوەڕوانە. لە تێلگرافی رەمزداری ژمارە ١٠٣٣ دا، ئاژاوەکەی **شێخ عەبدولحەمیدم** بە خزمەتتان راگەیاندبوو ناراستەخۆ زۆر بە رێزەوە، بێ دروست کردنی هیچ ناخۆشییەك، ئەو شابەندەرەی ئاماژەم پێکردبوو لە شوێنیك دامناوە، تا نەبێتە هۆکاری وروژاندن. تەنیا بۆ ئاگادار بوون.

شەوی شەشەمی قەوس، ژمارە ١٠٤٤، **سەردار محی.**

(٢٩٠٠٠٥٨١٠)

---

١- بەڵگەی ژمارە ١٥.

## (١٧)

**(له ویلایەتی لۆرستانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ١٠ ی موحەرەمی ١٣٣٢)**

**بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، لە بروجەردەوە بۆ تاران، ژمارەی تێلگراف ١٤، بەرواری ناردن ٧، بەرواری گەیشتن ٩ ی قەوس ١٣٣٢.**

تاران، لە ڕێگەی جەنابی **موغیس لسەڵتەنە**وە، بەختەوەر بێ. مەقامی پایە بەرزی ناوخۆ، هەر شکۆدار بێ. ئێستا تێلگرافێکی جەنابی **سەردار ئەرفەع** گەیشت، بۆئاگاداری موبارەکتان ئەمەش دەقەکەیەتی:

دوای ناونیشان. سێ مانگە بەردەوام ئەو بابەتانەمان بە خزمەتتان ڕاگەیاندووە، کە بەهۆی دووبەرەکی نێوان ئینگلیس و عوسمانی، چەند ڕۆژە لە شەتوئەلعەرەبی خاکی عوسمانیدا شەڕە، دوای چەند جار شەڕ و پێکدادان، ئینگلیس خاکی عوسمانی لە **فاو**ەوە تا راستی **بەسرە** داگیر کردووە و بەرەو **بەسرە** دەڕوات. عوسمانییەکان هەموو ڕۆژێ فشار بۆ سەر بەندە دێنن و دەڵێن دەبێ لەگەڵیاندا دژی ئینگلیس بجەنگین. تا گەیشتۆتە ئەو رادەیەی **جاوید پاشا** والی بەغدا هاتۆتە سەر پردەکان و تێلگرافێکی لەلایەن حەزرەتی **ئایەتوڵلا**[1] و زانایانی دینی شوێنە پیرۆزەکان، بە ناونیشانی بەندەوە ناردووە بۆ تێکڕای تیرە و تایفەکان و رایگەیاندووە بە فەرمانی زانایان دەبێ جەنگی جیهاد بکرێ، ئەگینا هێرش دەکەینە سەر **محەمەرە**. فەرمانی هومایونی لە مەڕ بێلایەنی، بڕگەکانی لە لایەن کارگێڕی بەسرەوە بۆ بەندە نێردراوە و گەیشتۆتە والی و ئەویش وەڵامی داوەتەوە، کەلەم کاتەدا بەهۆی موسوڵمان بوون بێلایەنی قبوڵ ناکەین، یا دەبێ **سەردار ئەرفەع** لەشەڕدا لەگەڵمان یەکبگرێ، یا هێرش دەکەینە سەر **موحەمەرە**. دە ڕۆژ دەبێ ئەم هەواڵەمان بۆ تاران ناردووە، وەلێ هێشتا ڕێکار و ئەرکیان بۆ دیاری نەکردووین. بۆ پاراستنی نەزم، گەلێك تفەنگچی عەرەبم لەسەر سنوورەکانی **ساخلو** دامەزراندووە. ئاگاداری پاراستنی سنوور و بێ لایەنیم. ٢٩ ی **زی حەججە خزعەل**. تکام

١- وشەیەکە نەخوێندرایەوە، وێدەچێ (بۆ) بێ.

وایە فەرمان بدەن هەرچۆنێك دەکرێ، زووتر فەرمان و ئەرکێك بۆ بەندە دیاری بکەن و بە تێلگراف پێم رابگەیەنن.

شەوی دەهەمی موحەڕەم، ژمارە ١١٠٤. رەزاقولی.

(٢٩٠٠٠٥٨٠٢)

## (١٨)

**(لە سەرۆکایەتی وەزیران بۆ حکومەتی کوردستان، ١٤ موحەرەمی ١٣٣٣)**

**سەرۆکایەتی وەزیران، ژمارە ٧١٢، ١٤ موحەرەم ئەلحەرام ١٣٣٣.**

بۆحکومەتی کوردستان بەرەمز بنێردرێ. بەپێی ئەو زانیارییانەی گەیشتوون، شابەندەرخانە عوسمانی ئاگادارینامەی بە دەرگای ماڵانەوە چەسپاندووە و لەلایەن سوڵتانی عوسمانییەوە بانگەشەی جیهادی کردووە، شێخەکانی سەرسنووریش پەیڕەوانی خۆیان هانداوە بۆ شەڕ و، **شێخ عەبدولحەمید** ناوێك لە ناو شادرا خەریکی وروژاندنی خەڵکە. ئەم هەواڵانە جێگای سەرسامی ئێمەن، کە جەنابتان بەو هەموو جەخت کردنەوەی دەوڵەت لەسەر پاراستنی بێلایەنی، بۆچی هیچ هەنگاوێکتان نەناوە بۆ رێ لێگرتنیان، لەوەش سەیر تر ئەوەیە کە ناوەندتان ئاگادار نەکردۆتەوە، لەکاتێکدا دەبوو بە ئامرازی خێرا و بەهۆی کارگێڕانەوە، رێگەیان لێبگرن و خراپی ئەم رەفتارە بە شابەندەر رابگەیەنن، کە لەبەر بێلایەنی ئێران ئەم جۆرە رەفتارانە بەجێ نین و چاوەڕوان نەکراون. دیارە دەبێ هەواڵ و دەرئەنجامی ئەو هەنگاوانەی ناوتانە، بەپەلە ئاگادارمان بکەنەوە.

(واژۆی مستەوفی ئەلمەمالك)

(٢٩٠٠٠٥٨٧٠)

## (١٩)

**(له حکومەتی کوردستانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ١٥ موحەرەمی ١٣٣٣)**

**بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، له کوردستانەوە بۆ تاران، ژمارەی تێلگراف ٤١، بەرواری ناردن ١٩، بەرواری گەیشتن شەوی ٢٠ قەوس ١٣٣٢.**

تاران مەقامی پایە بەرزی وەزارەتی ناوخۆ، هەر شکۆدار بێ. ئەمڕۆ بە پێی راپۆرتێك له **سەقز**ەوە، کۆمەڵێك سەربازی عوسمانی و چەند عەشیرەتێك له **سەقز** کۆبونەتەوە و، له بیری ئەودان بەرەو کوردستان بێن. راستی ئەم هەواڵە نازانم، بە ئەندازەی بەرپرسیم پێویستە بە ئێوەی رابگەیەنم.

دوازنزەهەمی قەوس، ژمارە ١١٣٤، **سەردار محی.**

(٢٩٠٠٠٥٧٠١).

## (٢٠)

**(له حکومەتی کوردستانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ١٨ موحەرەمی ١٣٣٣)**

**بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، له کوردستانەوە بۆ تاران، ژمارەی تێلگراف ٢٢، بەرواری ناردن ١٥، بەرواری گەیشتن ٢٠ ی قەوس ١٣٣٢.**

تاران، مەقامی پایە بەرزی وەزارەتی ناوخۆ، هەر شکۆدار بێ. پێشتر بەخزمەتتانمان راگەیاندبوو، کە شێخەکانی سنووری عوسمانی، بۆ هاندانی خەڵك بۆ جیهاد رۆیشتوون بۆ بانە، ئەمڕۆش دووبارە راپۆرتێکی دوورودرێژ له سەقزەوە گەیشتووە، کە ئەمە ناوەرۆکەکەیەتی: **شەریف** پاشا هەزار و سێسەت[١] و ئەرکانی جەنگ و کومەڵێك پایەداری عوسمانی لەگەڵ

١- ناروونییەك هەیە لە دۆزینەوەی رەمزەکەدا.

سەربازێکی لە رادەبەدەر زۆر، هاتوونەتە ناو **بانە** و شێخەکانی دانیشتووی سنووری **هەورامان** بە ناوی جیهادەوە هاتوون و لەم دوو رۆژەدا دەچنە ناو شارۆچکەی **سەقز** و دەیانەوێ بەرەو **تەورێز** وەرێ کەون. **فەریق پاشا**ش بە خۆی و کۆمەڵێك خاون پلەوە لەگەڵ دوانزە هەزار سەرباز گەیشتوونەتە شەش فرسەخی ساوجوبلاغ. بەندە بە خزمەتتان رادەگەیەنم لەگەڵ ئەوەشدا باش نییە **بانە** و **سەقز** لەگەڵ کوردستان بکرێن بە بابەت(۲) و ئێستا لە سنووری فەرمانڕەوایی مندا نین، کەسانم داناوە راپۆرتم بۆ بنێرن. تکایە سەبارەت بە مووچەی سوارە و قۆزاقەکان وەك بەڵێنی دەرکردنی تیلگرافخانەی خەزانەداریتان داوە دوای عاشورا ئەنجام بدرێ، تا بەندە بتوانێ زووتر بە سوارەو[1]- سنووری حکومەتی کوردستان بجوڵێ.

١٥ قەوس، ژمارە ١٠٨٩، **سەردار محی.**

(٢٩٠٠٠٥٨١٥)

## (٢١)

**(لە حکومەتی کوردستانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ٢١ موحەرەمی ١٣٣٣)**

**بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، لە کوردستانەوە بۆ تاران، ژمارەی تێلگراف ٢٧، بەرواری ناردن ٢٢ ی (قەوس)، بەرواری گەیشتن ٢٢ ی قەوس ١٣٣٢.**

تاران، مەقامی پایە بەرزی وەزارەتی ناوخۆ، هەر شکۆدار بێ. زیارەتی تێلگرافی رەمزداری ژمارە ٧١٢ ی موبارەکتانمان کرد[2]،سەبارەت بەو زانیارییانەی لە کوردستانەوە گەیشتوون، لە بارەی کارەکانی شابەندەرخانەی عوسمانی و هەڵواسینی ئاگادارینامە بە دەرو دیواری بازاڕ و بانگەشەی خەڵك بۆ جیهاد و هاندانی شێخەکانی لایەنگری خۆی لەسەر سنوور بۆ جەنگ و دنەدانی **شێخ عەبدولحەمید**[3] ئەوەی نووسیوتانە ئێمەی سەرسام کرد، کە بۆ لەڕێی

---

١- لە راستیدا رەمزی (بابەتەکە) دۆزراوەتەوە وەلێ دەشێ (منتزع واتە ئەبستراکت) بێ.

٢- وشەیەکی رەمزەکە نە دۆزراوەتەوە.

٣- وشەیەکی رەمزەکە نە دۆزراوەتەوە.

کارگێڕییەوە ڕێگەتان لەو کارە نەگرتووە و، لەوەش سەیرتر بۆ بە ناوەندتان ڕانەگەیاندووە، پێموایە یا تێلگرافخانە ڕاپۆرت و تێلگرافەکانی بەندە ناگەیەنێ، یا ئەوەتا نوسراوەکانی بەندە شایستەی بایەخ پێدان و جێگای سەرنجی هەیئەتی دەوڵەت نین. پتر لە یەك مانگە بە پێی ئەم ڕاپۆرتانە، **٨٠٣، ٨٦٢، ٨٩٦، ٩٥٠، ٩٦٧، ٩٨٤، ١٠٠٥، ١٠٣٣، ١٠٣٤، ١٠٤٤**[١]، بارودۆخی ئەم ناوچەیەم بە تەواوی و بە پەلە بۆ ناوەند ناردووە و هێشتا وەڵامی هیچ کامێکیانم وەرنەگرتۆتەوە تا لانی کەم بزانم چیبکەم. کاتێك دەفەرمووی سەیری ئەو ڕاپۆرتانە بکەیت، دەبینی بەندە لە ئەنجامدانی ئەرکەکانم بە هیچ شێوەیەك دریغیم نەکردووە و، لە باودۆخێکی ئاوادا خۆم لە بەرپرسیارەتی نەدزیوەتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا بە لوتفی خودا بە هەر شێوەیەك بێ، بێلایەنی شارمان پاراستووە و بڵاوکردنەوەی ئاگادارییننامە بەدرۆ دەخەمەوە، وەلێ بە جیدی بانگهێشتی عەشیرەتەکان دەکەن، تا ڕێگە لە هەوڵەکانی بەندە بگرن. **شێخ عەبدولحەمید** بە ناوی لایەنگیری لە ژێرەوە خەریکی خراپەکارییە و، چۆنییەتی ڕێگە لێگرتنیانم لە تیلگرافەکانی پێشوودا داواکردووە، کارگێڕی پێشووش[٢] هەر وەك ئەوان گەندەڵ و خێرخوازی بێگانەیە، سەبارەت بەو تێبینیە، هیچ کاردانەوەیەك بەرامبەر ناوبراوە نەکراوە، ئێستا کە جەنابی حاجیاغا **نەسیرولدەولە** تەشریفی هێناوە، لە هەموو ڕوویەکەوە دڵنیا دەبین. هەرچەندە دە ڕۆژیش دەبێت لەم بارودۆخەی تێلگرافخانەدا هیچ تێلگرافێکمان نادەنێ لەبەرئەوە لە زیارەتی وەڵامەکانیان بێ ئومێدم. لەگەڵ ئەوەشدا تکام وایە جارێکی تر بە ڕاپۆرتەکانی بەندەدا بچنەوە و چارەسەری یەکجارەکی دیاری بفەرموون کە[٣] — نەکرێ.

١٨ ی قەوس، ژمارە ١١٢٨، **سەردار محی.**

(٢٩٠٠٠٥٨١٠).

---

١- بۆ زانینی ئەم ڕاپۆرتە، جگە لە ڕاپۆرتی ژمارە (١٠٣٤) کە لەم کۆمەڵە بەڵگەنامەیەدا نەبوو، بڕوانە بەڵکەنامەی ژمارە( ٦، ٧، ٨، ٩، ١١ تا ١٦).

٢- وشەیەکی نەخوێندرایەوە.

٣- نە خوێندرایەوە.

## (٢٢)

**(له حكومەتی کوردستانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ٢٠ موحەرەمی ١٣٣٣)**

**بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، لە کوردستانەوە بۆ تاران، ژمارەی تێلگراف ٤٢ بەرواری ناردن ١٩ (قەوس)، بەرواری گەیشتن ٢٠ قەوس ١٣٣٢.**

مەقامی پایە بەرزی وەزارەتی ناوخۆ، هەر شکۆدار بێ. لە سەرچاوەیەکی ناراستەوخۆی هەواڵەوە، دەنگۆیە کە کۆمەڵێك سەرباز بەرەو کوردستان دێن، ڕاستی و هەڵەی ئەم هەواڵە هێشتا دیار نییە. تەنیا بۆ ئاگادار کردنی بەرپرسانی بەڕێزی دەوڵەت، سەرنجیان بۆ گرنگی بارو دۆخی ئێستای کوردستان رادەکێشین. درێژەی بابەتەکەمان لە تێلگرافی رمزداری دواتردا بە خزمەتتان ڕاگەیاندووە. ١٧ ی قەوس، ژمارە ١١٢٩، **سەردار محی**. (٢٩٠٠٠٥٧٠١).

## (٢٣)

**(لەحکومەتی کوردستانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ ٢٢ موحەرەم ١٣٣٣)**

**بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، لە کوردستانەوە بۆ تاران، ژمارەی تێلگراف ٤٠، بەرواری ناردن ١٩، بەرواری گەیشتن شەوی ٢٠ ی قەوس ١٣٣٢.**

مەقامی پایە بەرزی وەزارەتی ناوخۆ، هەر شکۆدار بێ. هەواڵگیرەکانی بەندە کە بۆ بەدەستهێنانی هەواڵ ناردبوومن بۆ **سەقز** و **سلێمانی**، ئەمڕۆ ڕاپۆرتیان ناردووە کە سێزدەی مانگ کونسولی رووسیا لە ساوجبلاغ[1] رایکردووە، موتەسەریفی **کەرکوك** وێڕای کۆمەڵێك

---

١- مەبەست (ا.ی. یاس)ە، کە دواتر دەکوژرێ و سەری لێدەکەنەوە و بە (میاندوا) و (سابلاغ) دا دەیگێڕن، بە دەرگای ماڵی (قازی فەتاح) دا لە سابلاغ هەڵیدەواسن و دوایی پاشماوەی تەرمەکەی فڕێدەدەنە ناو چۆمی (میانداو) و ئاو دەیبا.

سەربازی عوسمانی و شێخەکان گەیشتن. **موختار بەگ** لە دەوروبەری **سلێمانی** خەریکی کۆکردنەوەی تواناکان بووە و لە بیری هاتنە کوردستان دابووە[1]- **شابەندەر بەگی ساوجبلاغ** کە دوو رۆژ پێشتر کەوتۆتە رێ، بە نهێنی بە خەڵکی راگەیاندووە کە پێویستە کوردستان بە هۆی یەك ئایینی ببێتە بەشێك لە دەوڵەتی عوسمانی، خەڵکی هانداوە و لە سەرچاوییەکی عوسمانییەکانیشەوە دەنگۆیە کە ناوبراو بووە بە والی **ساوجبلاغ**. پێویست بوو بەخزمەتتان رابگەیەنم. ١٩ی قەوس، ژمارە **١١٣٥**[2] ، **سەردار محی**.

(٢٩٠٠٠٥٨١٥).

## (٢٤)

**(لە حکومەتی کوردستانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ٣٠ موحەرەمی ١٣٣٣)**

**بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، لە کوردستانەوە بۆ تاران، ژمارەی تێلگراف ٦٧، بەرواری ناردن ٢٦، بەرواری گەیشتن ٢٦ ی قەوس ١٣٣٢.**

مەقامی پایە بەرزی وەزارەتی ناوخۆ، هەر شکۆدار بێ. دوێنێ شابەندەر فتوانامەیەکی بە زمانی عەرەبی، فارسی و تورکی لە مەڕ پێویستی جیهاد، بۆ بەندە و زۆربەی خەڵکی شار ناردووە و، لە ناو عەشیرەتەکانیش دا بڵاوکراوەتەوە. بۆ خاتری موبارەکتان بە پەلە پێم راگەیاندن.

٢٧ ی قەوس، ژمارە ١١٩٩، **سەردار محی.**

(٢٩٠٠٠٥٨١٠).

---

١- وشەیەکی نەخوێندرایەوە.

٢- لە دەقەکەدا (٩١١٣٥) یە.

## (٢٥)

**(لە حکومەتی کوردستانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ٣٠ موحەرەمی ١٣٣٣)**

**بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، لە کوردستانەوە بۆ تاران، ژمارەی تێلگراف ٧٠، بەرواری ناردن ٢٧ ی قەوس، بەرواری گەیشتن ٢٨ ی قەوس ١٣٣٢.**

مەقامی پایە بەرزی وەزارەتی ناوخۆ، هەر شکۆدار بێ. لەمەڕ فتوانامەی پێویستیی جیهاد، کە درێژییەکەی لە تیلگرافی رەمزداری ژمارە ١١٩٩ دا بە خزمەتتانم راگەیاندووە. ئەو کاغەزانە سەرەڕای بڵاوکردنەوەیان لە رێڕەوە گشتییەکانیش دا هەڵواسراون، بەندە خێرا چەند کەسێکم نارد لێیان کردنەوە. تەنیا بۆ ئاگاداریتان.

٢٧ ی قەوس، ژمارە ١٢٠٤، **سەردار محی.**

(٢٩٠٠٠٥٨١٠).

## (٢٦)

**(لە حکومەتی کوردستانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ٣٠ موحەرەمی ١٣٣٣)**

**بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەت پایە بەرزی ئێران، لە کوردستانەوە بۆ تاران، ژمارەی تێلگراف ٧٣ بەرواری ناردن ٢٧، بەرواری گەیشتن ٢٨ قەوس ١٣٣٢.**

تاران، مەقامی پایە بەرزی وەزارەتی ناوخۆ، هەر شکۆدار بێ. شابەندەر بە ئیمام جومعەی راگەیاندووە، بە ناوی سوڵتانی عوسمانی کۆتایی بە وتاری نوێژی هەینی بێنێ، داوای لە بەندەش کرد و وەڵامم دایەوە ناکرێ، بەرپرسیار دەبی. چەند رۆژێکە شابەندەر و لایەنگرانی عوسمانی بارو دۆخەکەیان گۆڕیوە و خەریکی دەسدرێژی کردنن. دوێنێ پیاوەکانی شابەندەر زۆریان لە پۆلیسێك هەڵداوە و لەگەڵ جەنابی **نەسیر ولدەولە** خەریکی گفتوگۆم، تەنیا بۆ ئاگاداریتان.

٢٧ ی قەوس، ژمارە ١٢٠٣، **سەردار محی.**

(٢٩٠٠٠٥٨١٠)

## (٢٧)

**(له حکومەتی کوردستانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ٣٠ موحەرەمی ١٣٣٣)**

**بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، لە کوردستانەوە بۆ تاران، ژمارەی تێلگراف ٧٤، بەرواری ناردن ٢٨، بەرواری گەیشتن ٢٨ قەوس ١٣٣٢.**

مەقامی پایە بەرزی وەزارەتی ناوخۆ، هەر شکۆدار بێ، بۆ بەدواداچوونی تێلگرافی ڕەمزداری ١٢٠٣[١]، پێویستە بەخزمەتتان رابگەیەنرێ: ئەمڕۆ چەند کەسێك لە لایەنگرانی عوسمانی،کە چەکدار بوون، پۆلیس وەك ئەرکی سەرشانیان چەکیان کردن. شابەندەر پەیامێکی ناردووە داوای تەمێ کردنی پۆلیسی لە دارلحکومە یا لە شابەندەرخانە دەکات. وەڵامم دایەوە: بە فەرمی بینووسە، هێشتا وەڵامی نەداوەتەوە. تکایە بە پەلە بۆمان دیاری بکەن، هەرکاتێك لایەنگرانی عوسمانی چەك هەڵبگرن چی بکەین؟ بە نەرمی مامەڵەیان لەگەڵ بکەین یا چەکیان بکەین؟

٢٧ی قەوس، ژمارە١٢٢٣، **سەردار محی.**

(٢٩٠٠٠٥٨١٢).

## (٢٨)

**(له حکومەتی کوردستانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ ٢ی سەفەر١٣٣٣)**

**بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، لە کوردستانەوە بۆ تاران، ژمارەی تێلگراف ٨٤، بەرواری ناردن ٢٩، بەرواری گەیشتن ٢٩ قەوس ١٣٣٢.**

مەقامی پایە بەرزی وەزارەتی ناوخۆ، هەر شکۆدار بێ، لە سەر هاندان بۆ جیهاد و پرسی وتاری هەینی و دەسدرێژییەکان تا دەگاتە لایەنگرانی عوسمانی، کە جەنابی **حاج نەسیر ئەلسەڵتەنە** زارەکی لەگەڵ شابەندەر گفتۆگۆی کردووە، بە درێژی لە ژمارە ٧٢ دا، بە وەزارەتی کاروباری دەرەوەمان ڕاگەیاندووە. سەرنجی موبارەکی بەرپرسانی دەوڵەتمان بۆ پێگەی

---

١- بەڵگەنامەی ژمارە ٢٦.

کوردستان راکێشاوە و داوای ڕێکاری بەپەلە دەکەم، چونکە بەپێی ڕاگەیاندنی بێ لایەنییەوە بەندە هەر ڕووداوێك ڕووبدا، لە ئەنجام دان و پێشپێگرتنی درێغی ناکەم و ئەگەر پێمان ڕانەگەیەنن چیبکەم؟ خۆم بە بەرپرس نازانم!

شەوی ٢٩ ی قەوس، ژمارە ١٢٣٨، **سەردار محی.**

(٢٩٠٠٠٥٨١٠).

## (٢٩)

**(لە حکومەتی کوردستانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ٤ موحەرەمی ١٣٣٣)**

**بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، لە کوردستانەوە بۆ تاران، ژمارەی تێلگراف ٤، بەرواری ناردن یەکەم، بەرواری گەیشتن یەکەم و جیدی ١٣٣٢.**

مەقامی پایە بەرزی وەزارەتی ناوخۆ، هەر شکۆدار بێ، ئەمڕۆ **ئۆشاکۆف** لە کرماشانەوە تێلگرافی کردووە، کە وەك خۆی بە جەنابتانی ڕادەگەیەنم.

وەك بیستوومانە سەرەڕای ڕاگەیەندنی بێلایەنی دەوڵەتی ئێران سەبارەت بە دەوڵەتی ڕووسیا و عوسمانی، بۆچی ڕێگەتان لە ڕاگەیاندنی خراپکارانەی شابەندەر نەگرتووە. منیش لەو ڕووەوە تێلگرافم بۆ سەفارەتی ڕووسیا لە تاران کردووە.

**ئۆشاکۆف.**

لەبەرئەوەی پێشتر درێژەی ئەم بابەتەم بە ڕەمز ڕاگەیاندووە، پێویست بە دووبارە ئاگادار کردنەوە ناکات.

یەکەمی جیدی، ژمارە ١٢٥١، **سەردار محی.**

(٢٩٠٠٠٥٧٧٦).

## (٣٠)

**(لە وەزارەتی ناوخۆوە بۆ حکومەتی کوردستان، ٦ی سەفەر١٣٣٣.**

**(بێ سەربەرگ)، ژمارە ٧٥٣، ٦ی مانگی صفر ئەلموزەفەر ١٣٣٢.**

بۆ حکومەتی کوردستان رەمزدار بێ، تێلگرافی رەمزداری ژمارە ١٢٠٣[١] گەیشت لە بارەی ئیمام جومعە و خوێندنەوەی وتار بە ناوی سوڵتان، چارە هەرئەوەیە کە گوتوومانە و[٢]- و دیارە دەبێ بە راوێژ و ئاگاداری نەسیر ولدەولە پێویستە رێگە لەم جۆرە کارەنە بگرن.

(٢٩٠٠٠٥٨١٠).

(واژۆی مستەوفی لەمالك)

## (٣١)

**لە وەزارەتی ناوخۆوە بۆ حکومەتی کوردستان، ٦ی سەفەر١٣٣٣.**

**(بێ سەربەرگ)، ژمارە ٧٥٤، ٦ی مانگی سەفەر ولموزەفەر ١٣٣٢.**

بۆ حکومەتی کوردستان، رەمزدار بێ. تێلگرافی رەمزداری ژمارە ١٢٢٣ گەیشت[٣]، رێگرتن لە چەك هەڵگرتنی لایەنگرانی عوسمانی کاتێك راستە، کە تێکڕای خەڵکی شار و بیانی و دارودەستەکانیان لە ژێر دەسەڵاتی ئەم حکومەتە دابن. ئەگەر دەتوانن بەرامبەر کەسانی تر ئەم کارە بکەن، ئەوا دەرهەق بە لایەنگرانی (عوسمانی)ش بیکەن، بەو مەرجەی پێشتر ئەنجامدانی ئەم کارە ریکخرابێ و پێش راگەیاندنی لەگەڵ شابەندەرخانە عوسمانی

---

١- بەڵگەنامەی ژمارە ٢٦.

٢- نەخوێندرایەوە، وێدەچێ (ناردم) بێت.

٣- بەڵگەنامەی ژمارە ٢٧.

دانوسان بکەن و دسپێشخەر بن و دواتر بڕیاری گشتی رابگەیەنن تا دوای بڵاوکردنەوەی، لە جێبەجێ کردندا گرفتێك سەر هەڵنەدا.

(واژۆی مستەفی ئەلمەمالك)

(٢٩٠٠٠٥٨١٢)

## (٣٢)

**(لە حکومەتی کوردستانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ٧ موحەرەمی ١٣٣٣)**

**بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، لە کوردستانەوە بۆ تاران، ژمارەی تێلگراف ٢٠، بەرواری ناردن ٤ (؟)، بەرواری گەیشتن ٤ جیدی ١٣٣٢.**

مەقامی پایە بەرزی وەزارەتی ناوخۆ، هەر شکۆدار بێ. کارەکانی ئەم ماوەیەی شابەندەر[1] سەبارەت بە ناردنی کۆمەڵێك خەڵکی کوردستان بۆ جیهاد، بەردەوام بەخزمەتتانم راگەیاندووە. ئەمڕۆ خودی شابەندەریش لە نوێژی هەینی ئامادەبوو، وەك لەو راپۆرتەدا کە گەیشتووە، کۆمەڵێك موسوڵمانی ئێرانی ویستویانە لەگەڵ کۆمەڵێك نێوبژیوان بە ناوی جیهاد بەرێ بکرێن، بەندەش خێرا ئەم رووداوە و گرنگی و بەرپرسیاریی ئەم پرسەم بە جەنابی **نەسیرولدەولە** راگەیاند، بە راشکاوی پێموت ئەگەر بە پەلە رێگە لەم کارە نەگیرێ، حکومەت بە ویستی جیدی خۆی بۆ پێشگرتن لەم کردەوانە و رەفتارەی خەڵکی خۆی و نێوبژیوانان، درێغی لە هیچ چارەسەرییەك ناکات و یەکسەریش فەرمانی پێویست درا بە بەرێوەبەرایەتی ئاسایش و پۆلیسی سوارە، تا بە رەچاوکردنی تێبینی پێویست، چاودێری تەواو بکەن بۆ رێگرتن لەم کردەوەیە.

دوای دانووسانێکی دورو درێژ جەنابی **نەسیرولسەڵتەنە** بە پەیام و تێکڕای -[2] شابەندەرخانە و ئاگادار بوون لە رێگاچارەی جیدی حکومەت تاڕادەیەك سڵیان کردۆتەوە لە ئەنجامنەدانی ئەرکەکانیان، لە کۆتاییدا بیست کەس لەو کەسانەی دیارە کێن، چوونە پاڵ دەستە و ئاڵای عوسمانییەکان. بەو پێیەی هێشتا وەڵامی یەکلاکەرەوەی تێلگرافەکان

١- بەڵگەنامەی ژمارە (٢٧).

٢- نەخوێندرایەوە.

نەگەیشتوون، هەنگاونانی توندو تیژترم بە باش نەزانیوە و رووبەڕوو داوام لە ئیمام جومعە کردووە لە وتاری نوێژی هەینیدا، ئەرکەکانی پێشووی لەبیر نەکات و بە پێی بڕیاری شابەندەرخانە وتار نەخوێنێتەوە. تکام وایە بە تایبەتی سەرنجی تێلگرافەکانی من بدەن و، بە پەلە رێ و شوێنی تایبەت دابنێن بۆ چارەسەری ئەم کارە و نێوبژیوانەکان بە گشتی. چوارەمی جیدی، **سەردار محی**.

(۲۹۰۰۵۸۱۰)

**(۳۳)**

**(لە حکومەتی کوردستانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ ۱۱ ی سەفەری ۱۳۳۳)**

**بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، لە کوردستانەوە بۆ تاران، ژمارەی تێلگراف ۳۵، بەرواری ناردن ۸، بەرواری گەیشتن ۸ جیدی ۱۳۳۲.**

مەقامی پایە بەرزی وەزارەتی ناوخۆ، هەر شکۆدار بێ. ئەمڕۆ تێلگرافێك لە ئۆشاکۆفەوە گەیشتووە، کە تەنیا بۆ ئاگادری بەڕێزتان دەیخەمە روو.

بستوومە کۆمەڵێك لە کوردستان روویشتوون بۆ یارمەتیدانی عوسمانییەکان، لەکاتێکدا چەندین جار نوسیوومە: ئێران بێ لایەنە، ئێوە بۆ رێگایان لێناگرن، ئەم کارانە ئەنجامێکی خەراپی بۆ ئێوە دەبێت.

**ئۆشاکۆف**

هەرچەند بیر دەکەمەوە، هۆکاری ئەم جۆرە پەیوەنییە هەواڵییانە نازانم، بۆچی دەبێ حوکمێکی ئاوا بدرێت. ئەرکی بەندە تەنیا جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی سەرۆکایەتی دەوڵەتی خۆمە و پێویستە بە پێی ئەو رێ و شوێنەی بۆم دادەنرێ جێبەجێکاربم.

بە باشی سەرنج بدەنە گەیشتنی تێلگرافێکی ئاوا بە ئاشکرا بە بەرچاوی خەڵکەوە، کە دەمارگیری توندی دینیان هەیە، چەند بە خراپی کاریگەر بووە و بۆتە هۆی لەکەدار کردنی دەوڵەت. بەندە کە ناتوانم بە ئارەزوو نیازی شەخسی، فەرمانی کەسانی تر جێبەجێ بکەم و لە لایەن دەوڵەتیشەوە هیچ رێگایەك دیاری نەکراوە تا بە زەبری هێز لە کاتی وەرێکەتندا رێگە

لەو نێوبژیوانانە بگرم. چونکە ناوەرۆکی فەرمانەکان ئەوە بووە، بە ڕێز و نەرمییەوە، بێ توندوتیژی ڕێگەیان لێ بگیردرێ. لەبەر ئەوە فەرمان بدن ئەم جۆرە تێلگرافانە نەنێرن، تا بەندە بتوانم ئەرکی دیاری کراوی خۆم لەمەڕ پاراستنی بێلایەنی و نەزم و ئاسایشی ناوچەکە وەك فەرموتانە، بەجێ بگەیەنم. لەبەر ئەوەی ڕێگرتن لەم سەرپێچییانە مەحاڵە، بەراشکاوی بە خزمەتتان رایدەگەیەنم، ڕێگەی بەندە بدەن واز لەم خزمەتگوزارییە بهێنم.

شەوی هەشتەمی جیدی، ژمارە ١٣٥٨، **سەردار محی.**

(٢٩٠٠٠٥٧٧٦).

**(٣٤)**

**(لە حکومەتی کوردستانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ١٢ موحەرەمی ١٣٣٣)**

**بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، لە کوردستانەوە بۆ تاران، ژمارەی تێلگراف ٥٥، بەرواری ناردن ٨، بەرواری گەیشتن ٩ی جیدی ١٣٣٢.**

مەقامی پایە بەرزی وەزارەتی ناوخۆ، هەر شکۆدار بێ. سەرەڕای بەرگری پۆلیس، دوای ئەوەی لایەنگرانی عوسمانییەکان بەیاننامەکانیان دڕاند، گفتوگۆی ڕووبەڕووی جەنابی **نەسیرولدەولە** لەگەڵ شابەندەر، کە ئەمڕۆ لە کاتی کۆبوونەوەی کۆمیسیۆن دا ئەنجامدرا، هیچ دەرئەنجامێکی لێنەکەوتەوە، بڕواناکەم هیچ کاریگەرییەکی هەبێت. کاتەکان بە خۆ بواردن و کات بەسەر بردن بەرێدەکەن. ئەم پرسەش کاریگەرییەکی لە ڕادە بەدەر خراپی هەیە، زێدەباری ئەوەش سومعەی دەوڵەت خراپ دەکات و خۆڕاگرتن لەبەرامبەر ئەم جۆرە کارە نابەجێیانەدا زۆر زەحمەتە، هەر کاتێك ڕێگە بدەن، پۆلیس و پۆلیسی پیادە و سوارە و پیاوانی دەوڵەت دەنگ دەدەم، لە کاتی دەسدرێژی و جموجوڵی دڕندانەی ئەوانەدا کە بە خەنجەرەوە هێرش دێنن، ئەرکی خۆم بە تەواوی ئەنجام بدەم، ئەگینا ئەم جۆرە کەسانە مەحاڵە بە نەرمی و ئاشتییانە بە هێمنی دابنیشن، بگرە ڕۆژ بە ڕۆژ پتر پێی لێ هەڵدەبڕن، ئاشکرایە کوردستان دەکەوێتە چ بارودۆخێکەوە. شەوی نۆهەمی جیدی، ژمارە ١٣٧٣.

**سەردار محی.**

(٢٩٠٠٠٥٨١٠).

## (٣٥)

**(له حکومەتی کوردستانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ٧ موحەرەمی ١٣٣٣)**

**بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، لە کوردستانەوە بۆ تاران، ژمارەی تێلگراف ٢٠، بەرواری ناردن ٤ (؟)، بەرواری گەیشتن ٤ جیدی ١٣٣٢.**

مەقامی پایە بەرزی وەزارەتی ناوخۆ، هەر شکۆدار بیّ. دوو رۆژە کۆبوونەوە دژی قۆزاق و سوارەی **ساخلوی** کوردستان دەکریّ و دەیانەوەی ئاژاوە بگێڕن و گەلەکۆمەگەیان لێبکەن، وەلیّ بەندە شەو و رۆژ خەریکم بەڵکو بتوانم بە شێوەیەك رێگەیان لێبگرم. ئەمرۆش کۆمەڵێکی تر دوای نوێژی هەینی بە مەبەستی جیهاد وەرێکەوتن. زۆربەیان خەڵکی ناوخۆن. بەردەوام بە خزمەتتانم راگەیاندووە بە زەبری هێز نەبیّ مەحاڵە بتوانین رێگایان لێبگرین، چونکە بەهۆی دەمارگیری ئاینی و هاندانی عوسمانییەکان و بڕە پارەیەك کە دەیادندەنیّ، ئامادەی هەمووجۆرە بەرگرییەکن، ئەگەر بە زەبری هێز رێگەیان لێبگرین پێویستە دوای مۆڵەتی راشکاوانە بە پەلە قەدەغە بکرێن، جگە لە تۆپی شنایدەر و ماکزیم ژمارەیەکیش قۆزاقی کرماشان بەپەلە وەرێکەوتوون، چونکە پێشپێگرتنیان لە توانای من بەدەرە. بەندەش (لە) بەشێك و واسیتە کردن تەواوی سەرکردە[١]،

شەوی ١١ی جیدی، ژمارە ١٣٨٣، **سەردار محی**

(٢٩٠٠٠٥٨١٠)

١- ناروونی لە دۆزینەوەی رەمزی دەقە کەدایە.

## (٣٦)

**(له حكومەتی كوردستانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ١٥ ی سەفەری ١٣٣٣)**

**بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، لە كوردستانەوە بۆ تاران ، ژمارەی تێلگراف ٧٣، بەرواری ناردن ١٢، بەرواری گەیشتن ١٣ جیدی ١٣٣٢.**

مەقامی پایە بەرزی وەزارەتی ناوخۆ، هەر شكۆدار بێ. ئێستا بە یارمەتی خوا و ئەو هەنگاوانەی ئیدارەی حكومەت دەینێ شار و دەوروبەری خاوەن نەزمن و ڕووداوێكی تازە ڕووی نەداوە. هێندێك كۆبوونەوەی نهێنی بۆ خراپەكاری و ئاژاوە نانەوە كراوە، كە لە تێلگرافی ڕەمزداری ١٣٨١ بە خزمەتتانم ڕاگەیاندووە[١]. لە جولانەوەشیاندا هیچ ئەنجامێكیان دەسنەكەوت و بە چەندان شێوە ڕێگر بوون لە ئیدارەی حكومەت. دوێنێ شابەندەرخانە عوسمانی لە ئەنجومەن و گفتوگۆی ڕرووبەڕوودا، هاوكاری و یارمەتی خۆی ڕاگەیاند، هەروەها وتی ناتوانین ڕێگە لەو كەسانە بگرین كە خۆبەخشانە دەڕۆن بۆ جیهاد و بە پێی یاسا هیچ دەوڵەتێك لەگەڵ بێ لایەنیدا ناكۆك نییە، وەلێ ئاشكرایە لە ژێرەوە لەمەڕ وروژاندن و هاندانی خەڵك بۆ جیهاد و ئەنجامدانی ئەركی خۆیاندا درێغی ناكەن. هەر وەك لە تێلگرافی ڕەمزداری **١٣٨١** دا بە خزمەتتانم ڕاگەیانددووە، هەینی ڕابردوو، نزیكەی پەنجا كەسی بیانی و خەڵكی ناوخۆ، كە تازە ناسنامەی هاوڵاتیی بوونیان وەرگرتبوو، بە نیازی جیهاد كەوتوونە ڕێ و لە ڕۆژی هەینی ئەم هەفتەیەشدا پێم وایە كۆمەڵێكی تر بڕۆن. چارەیەكتان بۆ ئەم پرسە دیاری نەفەرموو، كە ڕۆیشتنی ئەم كەسانە پێچەوانەی بێ لایەنییە و پێویستە ڕێگەیان لێبگیردرێ، یا ئەوەتا ڕێگەیان لێ نەگرین و لەم ڕۆیشتنەدا ئازاد بن، پێویستە وەڵامی یەكلاكەرەوەمان بۆ بنێرن.

**حاجی بەهارولسەڵتەنە** سەرۆكی **دارۆغا**، كە ئێستا زانیویەتی لە هێندێك ڕووەوە كاروبارەكەی پێشن ناكەوێ ، دەستی لە كاروباری نەزمیە كێشاوەتەوە و بەندەش بەپێی پێویستی كاتەكە پەسەندم كرد و كردم بە فەرمانداری **ئەسفەند ئاباد**. ڕێك و پێك كردنی ئەو

---

١- لەم كۆمەڵە بەڵگەنامەیەدا بەدی نەكرا.

سنووره، خێرا **ئیبراهیم خان** کە یەکێك بوو لە سەرکردەکانی پۆلیسی سوارەی حکومەت و، چەند ساڵ بوو لە دارۆغای ناوەندی خاوەن پلە و پایە بوو، کردم بە سەرۆکی دارۆغا بە کەفالەت، دواتر پێشنیار دەکەم کەسێکی بە توانای ئەوتۆ دابمەزرێنم، کە بتوانێ لەگەڵ بارودۆخی کوردستاندا بگونجێ. بە پێی تێلگرافێکی گەیشتوو، دوو رۆژە پەنجا کەسی قۆزاق بە تۆپێکی ماکزیمەوە لە کوردستانەوە بەرەو کرماشان وەرێکەوتوون. ئێستاش **جەعفەر سوڵتانی** هەورامی راپۆرتێکی نووسیوە، کە سەربازەکانی **مەنسوری عوسمانی** بەردەوام لە جوڵە و هاتوچۆ دان، وەڵی مەبەستیان هێشتا ئاشکرا نەبووە. پێویست بوو بە خزمتتانی رابگەیەنم.

١٢ جیدی، ژمارە ١٤٠٢، **سەردار محی**.

(٢٩٠٠٠٥٧٠١).

## (٣٧)

**(لە حکومەتی کوردستانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ ١٧ موحەرەمی ١٣٣٣)**

**بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، لە کوردستانەوە بۆ تاران ، ژمارەی تێلگراف ٨٠، بەرواری ناردن ١٤، بەرواری گەیشتن ١٤ جیدی ١٣٣٢.**

تاران، مەقامی پایە بەرزی وەزارەتی ناوخۆ، هەر شکۆدار بێ. لە راپۆرتی ژمارە **١٤٠٩** ئەمڕۆ[١] لە بارەی خەلیفە و عەسکەر بەخزمەتتانم راگەیاند کە دوای هاتنی خەلیفە، چوار سەرباز پلەدارێکیان لەگەڵ خۆیان بردووە، شابەندەر دەڵێ دوای دوو رۆژ ئەو پێنج کەسە دەگەڕێنەوە.

شەوی چواردەهەمی جیدی، ژمارە ١٤[٢]، **سەردار محی**.

(٢٩٠٠٠٥٨١١).

---

١- لەم کۆمەڵە بەڵگونامەیەدا بەدی نەکرا.

٢- لە دەقەکەدا (١٤) یە.

## (٣٨)

**(له حکومەتی کوردستانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ١٦ ی سەفەری ١٣٣٣)**

**بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، لە کوردستانەوە بۆ تاران ، ژمارەی تێلگراف ٧٦، بەرواری ناردن ١٣ ی جیدی، بەرواری گەیشتن ١٤ جیدی ١٣٣٢.**

مەقامی پایە بەرزی وەزارەتی ناوخۆ، هەر شکۆدار بێ. بە پێی راپۆرتی گەیشتوو، ئەمڕۆ **خەلیفەی ئەرمەنییەکان** دێتە کوردستان و دوازدە سەربازی بۆ پارێزگاری لەگەڵدایە، دەڵێن پێشتر پیاوێکی سادە بووە، ئەو سەربازانەی لەگەڵ شاندەکەی خەلیفە بوون، دوای هاتنە ناوشار دەگەڕێنەوە. ئێستا دیار نییە دوای هاتنی خەلیفە دەگەڕێنەوە یان نا. هەرچۆنێك بێ هاتنی سەربازی عوسمانی، تەنانەت ئەگەر یەك کەسیش بێت لەم کاتەدا کاریگەرییەکی خراپی دەبێت. دەکرا بۆ پاراستنی خەلیفە پێش وەخت بە حکومەت رابگەیەنن، تا پۆلیسی سوارە و پاسەوان بۆ سەر سنوور بنێرێ. پێویست بوو بەخزمەتتان رابگەیەنم.

١٣ جیدی، ژمارە ١٤٠٩، **سەردار محی.**

(٢٩٠٠٠٥٨١١).

## (٣٩)

**(له حکومەتی کوردستانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ٢١ی سەفەری ١٣٣٣)**

**بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، لە کوردستانەوە بۆ تاران ، ژمارەی تێلگراف ٩٥، بەرواری ناردن ١٨، بەرواری گەیشتن ١٨ جیدی ١٣٣٢.**

مەقامی پایە بەرزی وەزارەتی ناوخۆ، هەر شکۆدار بێ. سوپاس بۆ خوا ئەو هەنگاوانەی لەلایەن دەوڵەتەوە نراون، بۆ پاراستنی نەزمی شار و ئاسایشی خەڵك و رێگرتن لە بەشێکی جموجوڵی خراپکاران، شار رێك و پێك و خەڵکیش ئاسوودەن. مەبەست لە بزواندنی بە شێك لە شەڕخوازان بۆ جیهاد ئەوە بووە: کە ئەو هەڵچوونە خەڵکی شار بوروژێنێ و دەرئەنجامی پێویست دەستەبەر بکەن، لەبەرئەوەی سەرکەوتوو نەبوون کەمێك هەڵچوون و تووڕەییان

دابەزیوە و، دوێنێش ژمارەیەك خۆبەخشی جیهاد بە هۆی بەفر و سەرماوە گەڕاونەتەوە، بەم پێیە راست و رەوان وازیان لە بیرو باوەری دەروونی خۆیان هێناوە و، ئۆردوی حکومەت بۆ هەر پێش پێگرتنێك ئامادەیە، وەلێ لە چەند شوێنێکی دەوروبەر، چەند راپۆرتێکی وروژێنەر گەیشتوون، کە حکومەت بەمزوانە ناچارە بجولێ لەشار -[1] لە جولانەوەی بێلایەنی ئەوان دەبێت. دوێنی پەنجا قۆزاقی پیادە و تۆپێکی ماکزیم لە کرماشانەوە هاتنە کوردستان.

١٨ ی جیدی، ژمارە ١٤٦٣، **سەردار محی.**

(٢٩٠٠٠٥٨٠٩)

## (٤٠)

**(لە حکومەتی کوردستانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ٢٨ سەفەری ١٣٣٣)**

**بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، لە کوردستانەوە بۆ تاران ، ژمارەی تێلگراف ٥٥، بەرواری ناردن ٢٦، بەرواری گەیشتن ٢٧ جیدی ١٣٣٢.**

مەقامی پایە بەرزی وەزارەتی ناوخۆ، هەر شکۆدار بێ. **شێخ عارف** کە ئاشکرایە کێیە، خەریکی ئەوەیە لە دووەمی رەبیعولئەوەل بۆ جیهاد وەرێکەوێ، لە بیری ئەوە دایە کۆمەڵێکیش لەگەڵ خۆیدا ببات، وەلێ بەندە بڕواناکەم کەس لەگەڵیدا بڕوات. پێویست بوو بەخزمەتتان رابگەیەنم. ٢٥ی جیدی، ژمارە ١٥٦٤، **سەردار محی.**

(٢٩٠٠٠٥٨١٦).

---

١ - نەخوێندرایەوە.

## (٤١)

**(له حکومەتی کوردستانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ٢ی ڕەبیع و لئەوەلی ١٣٣٣)**

**بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، لە کوردستانەوە بۆ تاران ، ژمارەی تێلگراف ١٢٧، بەرواری ناردن ٢٩، بەرواری گەیشتن ٢٩ جیدی ١٣٣٢.**

مەقامی پایە بەرزی وەزارەتی ناوخۆ، هەر شکۆدار بێ. **جەعفەر سوڵتان**، حاکمی هەورامان لەمەڕ کاروباری سنووردا نووسراوێکی بۆ قائمقامی -[1] کە لای ئەو جەنابی **ئیعتلائولملك** نووسیوە و بە تەتەرێکی تایبەتدا ناردووەیەتی، ئەو تەتەرە دوای گەڕانەوەی زانیارییەکانی ئەو و هی خۆشی بە بەندە ڕاگەیانگدووە و دەڵێ کە سەربازێکی زۆری سنوور -[2] و هیتر دەیانەوێ بەرەو **سەنەنەدەج** بجولێن و داوا لە بەندە دەکات ئەگەر ئەوانە بێنە ناوخاکمان چارە چییە؟ پێشیان پێبگرێت یان نا؟ بەندەش بە پەلە بە خزمەت سەرکردایەتی رادەگەیەنم و ئەگەر ڕاست بێ، چییان لەگەڵبکەم و، فەرمانی چ ڕێکارێك بە حاکمی هەورامان بدەم؟. ٢٨ جیدی، ژمارە١٥٨٩.

**سەردار محی.**

.(٢٩٠٠٠٥٧٠١)

---

١- نەخوێندرایەوە.

٢- نەخوێندرایەوە.

## (٤٢)

**(لە حکومەتی کوردستانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ٣ ی رەبیع و لئەوەلی ١٣٣٣)**

**بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، لە کوردستانەوە بۆ تاران ، ژمارەی تێلگراف ١١٩، بەرواری ناردن ٢٩، بەرواری گەیشتن ٢٩ جیدی ١٣٣٢.**

مەقامی پایە بەرزی وەزارەتی ناوخۆ، هەر شکۆدار بێ، بە پێی داوای **سەعید بەگ** شابەندەرخانە هەمەدان، ئەمڕۆ شابەندەر دە کەسی لە لایەنگرانی خۆی بەچەکەوە ناردووە بۆ هەمەدان. زانیارییەکانم بە خزمەتتان گەیاند. ٢٩ جیدی، ژمارە ١٦٠٩. **سەردار محی.**

(٢٩٠٠٠٥٨١٤).

## (٤٣)

**(لە حکومەتی کوردستانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ ٧ی رەبیع و لئەوەلی ١٣٣٣)**

**بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، لە کوردستانەوە بۆ تاران ، ژمارەی تێلگراف ٧ بەرواری ناردن شەوی ٣، بەرواری گەیشتن ٣ ی دەلو١٣٣٣.**

تاران، تێلگرافی بەپەلەی دەوڵەتی. مەقامی پایە بەرزی ناوخۆ، هەر شکۆدار بێ. وا دیارە **مەحمود موخلص بەگ** شابەندەری پێشووی کوردستان، کە پێشینەیەکی خراپی لێرە هەیە، لە بری شابەندەر کوردستانی بێت، کە فەرمانداری کرماشانە. وەزارەتی دەرەوە بە تەواوی لە خراپکارییەکانی ناوبراو ئاگادارە، بە هەر زەحمەتێك با دەکرا لەگەڵ شابەندەرخانە ئێستا رێککەون، وەلێ **مەحمود مخلص بەگ** بە خراپکاری بێ ئەندازە و دژایەتی حکومەت ناسراوە، هاتنیشی بۆ کوردستان ئەنجامێکی خراپی بە دواوە دەبێ و بۆ دەوڵەت دەبێتە گرفتی سەرەکی لەم ناوچەیە. ئەگەر دەکرێ هەر شابەندەری دووەم بمێنێتەوە، ئەگەرنا کەسێکی تر دیاری مەفەرموون. ئەگەر هەر دەبێ **مەحمود بەگ** بێت، بە بوونی ناوبراو و بارودۆخی ئێستا، بەندە لە خزمەت کردن لە کوردستان لا ببەن. شەوی **٣** ی دەلو، ژمارە **١٦٢٨**، **سەردار محی.**

(٢٩٠٠٠٥٧٩٣).

## (٤٤)

**(له وەزارەتی ناوخۆوە بۆ حکومەتی کوردستان، ١٤ی ڕەبیعولئەوەلی ١٣٣٣)**
**(بیٚ سەربەرگ)، بەپەلە، ژمارە ٨٧٦، ١٤ ڕەبیع و لئەوەلی ١٣٣٣.**

بۆ حکوموتی کوردستان ڕەمزدار. به پێی ئەو زانیارییانەی بە دەست وەزارەتی دەرەوە گەیشتوون، شابەندەرخانەی عوسمانی چەند کاغەزیکی بە زمانی تورکی و فارسی و عەرەبی لەمەڕ فتوای جیهاد، له ناو عەشیرەتەکاندا دابەش کردووە و هانیان دەدا بۆ گەلەکۆمە. هەرچەندە لێرە دانوسانی پێویست لەگەڵ سەفارەتی عوسمانیدا کراوە، تا شابەندەر لەو کارانە بگێڕنەوە، وەلیٚ جەنابتان بەو ئامرازانەی دەکریٚ و بە ریٚ و شوێنی پێویست، بە شێوەیەك کە نەزم و ئاسایش بپارێزن، ڕێگە لەو جۆرە کاغەزانە بگرن و مەهێڵن بە پێچەوانەی پرنسیپەکانی بێلایەنی هیچ کارێك بکرێت. (واژۆ **مستەوفی لەمالك**).

(٢٩٠٠٠٥٨١٠)

## (٤٥)

**(لە سەرۆك وەزیرانەوە بۆ حکومەتی کوردستان، ٢١ی ڕەبیع و لئەوەلی ١٣٣٣)**
**سەرۆك وەزیران، یاداشت بکرێت، ژمارە ٨٧٤، ٢١ی ڕەبیع ولئەوەلی ١٣٣٣.**

بۆ حکومەتی کوردستان ڕەمزدار بکریٚ، تیلگرافی ڕەمزدار ژمارە ١٧٥٢ و ئاشکرای ژمارە ١٧٥٨[١] زۆر سەیر و جێگای سەرنجدانە، کە وێڕای ئەو زانیباییە تۆکمەیەی لەمەر بارودۆخی ئەو سنوورە و گرنگییەکەی هەتانە، لە کاتێکی ئاوادا داوای دەست لە کارکێشانەوە دەکەیت. ئێستا پێویست بە گۆڕانکاری ناکات و ناتوانین ئەو داوایەی جەنابتان قبوڵ بکەین. گریمان چارەسەری میزاجتان پێویست بیٚ، بیخەرە دوای جێژن، کاتێك کە کاروبارەکانی ئەوێش–[٢] جێگای دڵنیایی بن.
(واژۆ **مستەوفی لەمالك**).
.(٢٩٠٠٠٤١٥٢)

---

١- لەم کۆمەڵە بەڵگەنامەیەدا بەدی نەکرا.

٢- نەخوێندرایەوە.

## (٤٦)

**(لە حکومەتی کوردستانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ٢١ ی رەبیع و لئەوەلی ١٣٣٣)**

**بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، لە کوردستانەوە بۆ تاران ، ژمارەی تێلگراف ٦١، بەرواری ناردن ١٧، بەرواری گەیشتن ١٨ ی دەلو١٣٣٣.**

مەقامی پایە بەرزی وەزارەتی ناوخۆ، هەر شکۆدار بێ. هەر ئێستا هەواڵێکی تێلگرافی لە **گەرووسەوە** گەیشتووە، کە وەك خۆی بە خزمەتتانی رادەگەیەنم، **عەلی ئەفەندی** لەگەڵ چەند سوارەی عوسمانیدا، کە لە **تەورێزەوە** دێن، گەیشتوونە ناو **گەڕووس** و سبەینی بەرەو کوردستان وەڕێدەکەون، دوای پێراگەیاندن هەرفەرمانێك دەفەرموون جێبەجێی دەکەین. **١٧** دەلو ژمارە **١٧٧٤**، **سەردار محی**.

(٢٩٠٠٠٥٨١٦).

## (٤٧)

**(لە حکومەتی کوردستانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ٢٣ی رەبیع و لئەوەلی ١٣٣٣)**

**بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، لە کوردستانەوە بۆ تاران ، ژمارەی تێلگراف ٦٠، بەرواری ناردن ١٩، بەرواری گەیشتن ٢٠ ی دەلو١٣٣٣.**

مەقامی پایە بەرزی وەزارەتی ناوخۆ، هەر شکۆدار بێ. بە پێی هەواڵێکی ناراستەوخۆ کە تارادەیەك راستییەکەی پشت راست دەکەمەوە، دە هەزار سەربازی سوپای ساخلوی بەغدا کرماشانیان پێ سپێردراوە و **عەلی ئەفەندی** کە لە تێلگرافی **١٧٧٤** دا پێم راگەیاندن، چۆتە ناو گەروس و سەرۆکی نیزام لە ناو ئۆردویە و بۆ رێنیشاندانی ئەو سوپایە دەڕوا، تا لە رێگەی **کرماشانەوە** بیانبات بۆ **ئازەربایجان**. ٩ی دەلو، ژمارە **١٧٩٨**.

**سەردار محی.**

(٢٩٠٠٠٥٨١٦)

## (٤٨)

**(راپۆرتی سنوورپاریزی زەهاو، ٢٢ رەبیع و لئەوەل ١٣٣٣)**[1]

**وەزارەتی کاروباری دەرەوە، بەڕێوەبەرایەتی نووسراوەکانی عوسمانی، درێژەی راپۆرتی سنوورپارێزی زەهاو، بەرواری ٢٢ ی رەبیع و لئەوەلی ١٣٣٣، ژمارە ١٦١**

وەك دیارە مانەوەی کەسێکی خاوەن پلە و پایەی عوسمانی لە **قەسری شیرین**، بۆ ئەوەیە یاوەران و ئەو باروبنەیەی لە دواوە هەیانە بگات. تا ئەم کاتە کە پاش نیوەڕۆی یەکشەممەی **٢٢** ی ئەم مانگەیە، یاوەران و باروبنەکەیان گەیشتۆتە قەسر. وەك دەڵێن ئەمڕۆ چاوەڕوانی هاتنیانە. وەلێ هێشتا دەرنەکەوتووە یاوەرەکانی کێن و بارەکان چین؟ هەر کە گەیشتن، زانیاری کۆدەکەمەوە و ئەگەر وایەری تێلگراف کاری کرد، بەدوورودرێژی بە تێلگراف بە خزمەتتان رادەگەیەنم. لەبەرئەوەی ئەو دوو سێ کەسەی یاوەری بوون، بە چەکەوە هاتوونەتە ناو خاکی ئێران، ئەگەری زۆری ئەوە هەیە بارو بنەو دواکەتووەکان چەك و چۆڵ بن. دیارە لێکۆڵینەوە لەم بڕگەیە پتر ئەرکی سەرشانی سەرۆکی گومرگی سنوورە.

ئیتر وەك ئەو ئەڵمانییە باسی کردووە، یەکێك لە یاوەرەکانی وەك هەواڵگیر[2] لە **قەسری شیرین** دادەنێ. (کارگێڕی رووسیش لە قەسری شیرین دەهری بووە). ئەم خاڵەش بە خزمەتتان بگەیەنم: بەم دواییانە کەسی بیانی لە قەسر بایەخ پەیدا کردووە. گومانی تێدا نییە کارگێڕی بەڕێز لە رووی رێنوێنی ورد و یارمەتی پێویست، لایەکی دلسۆزانە لە سنوورپارێزی دەکەنەوە. بەم حاڵەشەوە بێلایەنی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، بۆ ئەوەی لەسەر سنوورەکان کارەساتێك روونەدات، گرنگە فەرمانێکی بەپەلە لە لایەن ویلایەتی پایە بەرزەوە بۆ حاکمی **قەسر** دەربکرێت، کە رێزی کاربەدەستانی بیانی بگیرێ و لە روانگەیەکی قووڵەوە بە پێویستی دابنێن تا گرفت و زیادەڕەوەی لە قەدەغە کردندا نەکرێ.

**(حەسەن سنوورپارێز)**

(ك ٤٣٣٨).

---

١ - وەزارەتی کاروباری دەرەوە بە پێی نامەی ژمارە (١٤٢٠٢/٢٩٨١) بە رێکەوتی ٢٣ ی رەبیع ولسانی ١٣٣٣، دەقی ئەم راپۆرتانەی خوارەوەی (٤٨ و ٤٩ و ٥٠) ی ناردووە بۆ وەزارەتی ناوخۆ.

٢-کارگێڕ و رێکخەر. Agent

## (٤٩)

**(ڕاپۆرتی سنووڕپاریزی زەهاو، ٢٢ ڕەبیع و لئەوەلی ١٣٣٣)**

**وەزارەتی کاروباری دەرەوە، بەڕێوەبەرایەتی نووسراوەکانی عوسمانی، درێژەی ڕاپۆرتی سنووڕپارێزی زەهاو، بەرواری ٢٢ڕەبیعولئەوەل ١٣٣٣، ژمارە نهێنی.**

شازادە ئیقبالولسولتان هەوڵێکی جیدی دەدات کە صمصامولمەمالك نەیەتە ناو شار. بە تایبەتی شەوی دووشەممە کاتژمێرێکی شەو تێپەڕی بوو، کە ڕۆیشتبوو بۆ ماڵی کارگێڕی (ئەژانس) و دەرگای حەساریان[١] لەدەرەوە داخستبوو. مەبەست لەم خەڵوەتە، دەستەبەرکردنی چەند هۆکارێکە بۆ نەهاتنی **صمصام** بۆ ناوشار. کەسێك بە ناوی **شیخولئیسلام کەربەلایی** کە سوننە مەزهەبە، دوو سێ ڕۆژ دەبێ هاتۆتە کۆشك، چەند ئاگاداری لەگەڵ خۆی هێناوە و خەریکی کاری هاندانە. گوایا دێت بۆ کرماشانیش و دەڵێن کوڕی **حاجی میرزا حوسێن** و **حاجی میرزا خەلیل**، دو ڕۆژی تر لەگەڵ خەڵکێکی زۆر دێنە ناو کۆشك.

وادیارە دووسەت تا سێسەت بار چەك و **قۆرخانەی** ئەڵمانی گەیشتۆتە خانەقین، بڕیار بوو دوێنێ بێن، ئێستا هیچ باس و خواسێك نییە، ئەگەری تەواو هەیە لە ناو دەوڵەتی عوسمانییەوە ئەو چەك و چۆڵانە ببەنە سەر **کانزای نەوت**. بەردەوام بە خزمەتتانم ڕاگەیاندووە کە وەخت گرنگە، تا زووتر صمصام بانگهێشت بکەن لە شار ئامادەبێ، باشترە.

(ك ٤٣٣٨).

---

١- لە دەقەکەدا لە بری حیاط، حیات نووسراوە.

## (٥٠)

**(راپۆرتی سنوورپاریزی زەهاو، ٢٥ ی رەبیع و لئەوەلی ١٣٣٣)**

**وەزارەتی کاروباری دەرەوە، بەڕێوەبەرایەتی نووسراوەکانی عوسمانی، درێژەی راپۆرتی سنوور پارێزی زەهاو، بەرواری ٢٥رەبیعولئەوەلی ١٣٣٣، بیٚ ژمارە، نهێنی.**

بە خزمەتتان رادەگەیەنم کە دوێنیٚ بەیانی ناسرلوزرای وەرگێڕی تورکی کونسولگەری ئەڵمان، هاتە لای بەندە و رایگەیاند کە کەنسولٚ گلەیی لێمە. هاتوون پێیان گوتووە کە ئێوە لەگەڵ تێلگرافەکە بە رەمزی راتان گەیاندووە کە ئاژانسی رووس لە هاتنی جەنابی کونسولٚ بۆ قەسری شیرین ترسی هەیە (**پۆلتیك**)، بۆ ئەوەی جەنابی کونسولٚ لە خۆتان نەتۆرێنن، باشترە ئەمشەو بێی رەمزەکەی بۆ روون بکەیتەوە، هەم خۆشحالٚ دەبیٚ، هەم خێریشی بۆ تۆ تێدا دەبیٚ. بەم مووچەیە چۆن ژیان بەسەر دەبەیت. بەتایبەتیش کونسولٚ پێی وتووم زۆر حەز دەکات فلان کەس بە دەرامەتێکی باش وەك ئاژانس لە کۆشك دابنیٚ. لە وەڵامدا وتم یەکەم من بۆ گفتوگۆ هیچ رەمز و رازێکم نییە، دووەم گریمان هەشمبوو سەبارەت بەو نییە و لە ترسانی ئاژانسیش ئاگادارنیم، ئینجا جەنابی کونسولٚ چۆن قبولٚ دەکات، کە شتە نهێنییەکان ئاشکرا بکەم و ئومێدەوارم لە خزمەت کردن بە دەوڵەتی خۆم راستگۆ بم، رەنگە ئیمتحانی خۆم بە کاربەدەستانی بالآدابێت و لە لوتفی ئەوان مەمنونم و هەرچەند بیری لێدەکەمەوە، شتێکی نهێنی نەبوو کە من بیلێم، ئەوەندەش ناچار نیم، بەم دەرامەتە کەمەی خۆم قەناعەتم کردووە و هیوام پێیەتی. دوای ئەم گفتوگۆیە **ناسرلوزرا** خواحافیزی کرد و رۆیی. وەختی عەسر دوو کەسی **چەرکەس** بە شپرزەیی هاتبوونە بەردەمی ماڵی بەندە و وتبوویان لە کوێیە؟ و بە ماڵەوەیان گوتبوو کارمان بە خۆیەتی. ئەوانیش وتبوویان نازانین، لە بەیانییەوە نەهاتۆتەوە ماڵیٚ. تەنانەت چەندین جار بە دوامدا گەڕابوون. وەك دیارە نیازیان بەرامبەر بەندە خراپە و ئەوەش بە هۆی هاندانی خەڵکی خۆمانە. هەرچەندە بە رەمزیش بە خزمەتتانم راگەیاندووە کە بە دوای بیانوویەکدا دەگەڕێن، ماوەیەکە هاوار دەکەم کە بە پێی پێویستی ئێستا، بوونی ئەو کەسە زیانبەخشە، بەڵام گوێتان نەداوەتیٚ و دواتریش گوییٚ نادەنیٚ. وەڵڵا بیللا جگە لە خۆشەویستی دەوڵەت هیچ مەبەستێکی ترم نییە. من ئەوەی مەرجی پێراگەیاندن بوو، وتم.

خودی هاوەڵەکەشی لەو بێچارەتر نییە، **جەنابی شیخولئیسلام**، کە سوونی مەزەبە لە راستیدا کوردستانییە و، لە کەربەلای مەزن **شێخولئیسلامە** و، بۆ پڕۆپاگەندە و وروژاندن و گەیاندنی ئاگادارییەکان، ماوەیەکە لە وڵاتی عوسمانییەوە هاتووە و تا ئێستاش هەر بەردەوامە.

ئەگەر قۆرخانە و چەك و جبەخانەش بووبێ، دەڵێن بە نهێنی بردوویانە بۆ سەر هێڵی سوور، واتە **کانزای نەوت**. رۆژ بە رۆژ و بەرەبەرە ژمارەی سەربازی قشڵە و کانزاکان زیاد دەکەن و بە تەمای کارێکی گەورەن. راستییەکەی ئەوەیە کە بەم وەزعە زۆر لە گیانی خۆم دەترسم. هەرچۆنێك بێت دەرکردنی بڕیارێك لەمەڕ ئاشایشی بەندە لەرووی پاراستن و پاسەوانەوە پێویستە، بۆ ئەوەی مندالەکانم هەتیو نەبن، لەم رۆژگارەشدا بەدەست خۆم نییە خەرجی زۆرم هەیە وەك ناردنی هەواڵچین و وەدەستهێنانی هەواڵ، هەقی خۆیەتی ئەگەر کاتییش بێ پێویستە لایەك لە حاڵی بەندە بکەنەوە. ئیتر خۆتان و ویژدان و شەرەفتان.
(ك٤٣٣٨)

## (٥١)

**(لە حکومەتی کوردستانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ٢٥ی رەبیع و لئەوەلی ١٣٣٣)**

**بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، لە کوردستانەوە بۆ تاران ، ژمارەی تێلگراف ٧٠، بەرواری ناردن شەوی ٢٢، بەرواری گەیشتن ٢٣ ی دەلو١٣٣٣.**

مەقامی پایە بەرزی وەزارەتی ناوخۆ، هەر شکۆدار بێ. ئەمڕۆ **عەلی ئەفەنی** بە خۆی و یازدە سەربازی عوسمانییەوە هاتن. بە پێویستم زانی بە خزمەتتان رابگەیەنم. ٢١ دەلو، ژمارە ١٨١٠، **سەردار محی**. (٢٩٠٠٠٥٨١٦).

## (٥٢)

**(له حکومەتی کوردستانەوە بۆ سەرۆکایەتی وەزیران، ٢٧ ی ڕەبیع و لئەوەلی ١٣٣٣)**

**بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، لە کوردستانەوە بۆ تاران، ژمارەی تێلگراف ٨٦، بەرواری ناردن ٢٣، بەرواری گەیشتن ٢٣ ی دەلو١٣٣٣.**

مەقامی پایە بەرزی ناوخۆ، هەر شکۆدار بێ. لە وەڵامی تێلگرافی ڕەمزداری ژمارە **١٧٢٥** کە بە خزمەتی موبارەکتان ڕاگەیەنرابوو، تێلگرافی ڕەمزی ژمارە **٨٧٤** بەرواری **٢١** ڕەبیعولئەوەل لە لایەن وەزارەتی شکۆداری ناوخۆوە لە **٢٦** ڕەبیعولئەوەل نێردرابوو زیارەتم کرد[١]، کە لەبارەی دەست لە کار کێشانەوەم لەم بارودۆخەدا فەرمووبووتان: سەرسام بووم و پێویستە تا دوای جەژن ڕاوەستم، لام وایە ئەم فەرموودەیەی ئێوە پتر جێگای سەرسوڕمانە، چونکە ئەگەر کاربەدەستانی باڵای حکومەت بەندەیان ناسیبێ، لە کاتی کار و خزمەتدا ڕووم لە هیچ مەترسی و پێشهاتێکی سەخت وەرنەگێڕاوە، بێ سێ و دوو و بێ بیر لێکردنەوە فەرمانەکانی دەوڵەتی خۆم جێبەجێ کردووە، ئەگەر ئێستای کوردستان لەگەڵ ساڵی پار بەراورد بفەرموون، دەردەکەوێ بەندە چ گیانفیداییەکم کردووە، چ زەحمەتێکم کێشاوە و ناڵێم خزمەتەکانی بەندە جێگای دەسخۆشییە، چونکە ئەمە ئەرکی سەرشانی نۆکەری دەوڵەت و ئەم ئاو و خاکەیە، بەڵکو بۆ ئەوەیە ئەو کەسانەی ئەرکەکانیان ئەنجام نادەن، جێگای گلەیی و گازندەن، بەڵام بەو زانیارییانەی ئێستا ئەم ماوەیە، دووربینی لە کارەکانی داهاتووی ئەم ویلایەتدا ئەگەر پێشیان پێنەگیردرێ، خراپی بەسەر دێت و بێ چارەیی لە کاردا سەرەڕای سستی گیانی، ڕوحی بەندەشی سست کردووە و، ناتوانم گۆشەگیربم و سەیری تاڵانکاریی و دەسدرێژی خراپکاران بم بۆ سەر خەڵك و ئەوسا بە خۆم بە بوودەڵە بناسێنم. هەرئەوەندەی فەرمووتانە دەبێ ڕاوەستم، ئەگینا بایەختان بە داوایەکانی تری بەندە نەداوە. ئێستا ئەوە دوو مانگە بەرەمز بۆم ڕوونکردوونەتەوە تا ساردی زستان، دەبێ بەرامبەر خراپکاریی عەشیرەتەکان ڕاوەستم، دەبێ تەمێ بکرێن و توانای دەسدرێژییان نەمێنێ و پێویستە خۆیشم ئەم کارە زەحمەتە وەئەستۆ بگرم و پێشم ڕاگەیاندوون ئەگەر جموجوڵی بەندە پەسەند ناکەن،

---

١- بەڵگەی ژمارە (٤٥).

بڕیار بدەن تا بە ئامرازگەلی تر خەریکی پێشبینی بم، کەچی هیچ وەڵامیکی بەندەتان نەداوەتەوە. سەیری نەزم و هێزی بانە و سەقزتان نەکردووە. ناپرسن راتان بەرامبەر حاڵ و داهاتووی ئەوێ چییە؟ و چۆن و بە چ ئامرازێك دەتوانن نەزمی ئەو سنوورە دابین بکەن و چەند توانای گەرەکە؟ ئایا بەندە بەو هێزەی بەزەحمەت کوردستانی پێ بەڕێوە دەبەم، چۆن دەتوانم نەزمی ئەو دەڤەرەی پێ رابگرم. بەم داوایانە و زۆری تریش کە شەرم دەمگرێ باسیان بکەم، ئەوەنەبێ دەست لە کار کێشانەوەی خۆم پێشکەش بکەم و لە هەفتەیەکدا وەخۆ کەوم. شەوی **٢٣** دەلو، ژمارە **١٨٢٩**، **سەردار محی.**

(٢٩٠٠٠٤١٥٦)

**(٥٣)**

**(لە حکومەتی کوردستانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ٢٨ ی رەبیعولئەوەلی ١٣٣٣)**

**بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، لە کوردستانەوە بۆ تاران ، ژمارەی تێلگراف ٩٠، بەرواری ناردن ٢٤، بەرواری گەیشتن ٢٤ ی دەلو١٣٣٣.**

مەقامی پایە بەرزی وەزارەتی ناوخۆ، هەر شکۆدار بێ. ماوەیەکە جموجوڵی قۆزاقەکانی **ساخلوی** کوردستان لە ناوشار بە پێچەوانەی پێشبینی و بە ئەنقەست رووبەرووی عوسمانییەکان دەبنەوە، هەر ئەمڕۆ **مەحمود** ناوێکی عوسمانییان بەسەختی بریندار کردووە. تا ئەم پرسە و هاوشێوەکانی رووبدەن، دەبنە هۆکاری ئاژاوەی گشتی و وروژان. پێویستە بۆ رێگرتن لەم جموجوڵانە وەك پێویست بە پەلە هەنگاوی بۆ بنێن. شەوی ٢٤ دەلو، ژمارە ١٨٣١، **سەردار محی.**

.(٢٩٠٠٠٥٧٧٤)

**(٥٤)**

**(له حکومەتی کوردستانەوە بۆ وەزارەت ناوخۆ، ٢٨ ی ڕەبیع و لئەوەلی ١٣٣٣)**

**بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، لە کوردستانەوە بۆ تاران، بەرواری ناردن ٢٤،بەرواری گەیشتن ٢٤ ی دەلو١٣٣٢.**

مەقامی پایە بەرزی وەزارەتی ناوخۆ، هەر شکۆدار بێ **عەلی ئەفەندی** کە بەخۆیی و دە سەربازی عوسمانییەوە دەهاتە کوردستان، دوای وەڕێکەوتن بەرەو گەرووس لە ڕێگەی ئاسایی خۆی لایداوە و چۆتە ناو عەشیرەتەکان، تایفەکانی **گوڵباغی** و **مەندمی** یەکخستووە. بە پێویستم زانی بە خزمەتتانی رابگەیەنم. شەوی ٢٤ دەلو، ژمارە ١٨٣٢، **سەردار محی**.

(٢٩٠٠٠٤٢١٣).

**(٥٥)**

**(له حکومەتی کوردستانەوە بە وەزارەتی ناوخۆ، ٢٨ ی ڕەبیع و لئەوەلی ١٣٣٣)**

**بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، لە کوردستانەوە بۆ تاران، ژمارەی تێلگراف ٩٤، بەرواری ناردن ٢٤، بەرواری گەیشتن ٢٥ ی دەلو١٣٣٣.**

مەقامی پایە بەرزی وەزارەتی ناوخۆ، هەر شکۆدار بێ. **مەحمود بەگ،** شابەندەری کوردستان، ئەمڕۆ هاتووە. بۆ زانینتان بە خزمەتتانم ڕاگەیاند. ٢٤ دەلو، ژمارە ١٨٤٢.

**سەردار محی.**

(٢٩٠٠٠٤٢١٣).

## (٥٦)

**(له حكومەتی كوردستانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، یەكەمی رەبیع ولسانی ١٣٣٣)**

**بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، لە كوردستانەوە بۆ تاران ، ژمارەی تێلگراف ١٠٨، بەرواری ناردن ٢٧،بەرواری گەیشتن ٢٨ ی دەلو١٣٣٣.**

مەقامی پایە بەرزی وەزارەتی ناوخۆ، هەر شكۆدار بێ. ئەمڕۆ لەلایەن شابەندەرەوە راگەیەنرا [١]-لایەنگرانی عوسمانی و تێكڕای عوسمانییەكان، دەبێ لە ماوەی یەك هەفتەدا بەرەو **ساوجبلاغ** وەڕێكەون وبگەنە ئۆردوی ئیسلامی. ٢٧ دەلو، ژمارە ١٨٥١.

**سەردار محی.**

.(٢٩٠٠٠٥٨١٣)

## (٥٧)

**(له حكومەتی كوردستانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ٢٧ ی رەبیع ولسانی ١٣٣٣)**

**بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، لە كوردستانەوە بۆ تاران، ژمارەی تێلگراف ١٠٦ بەرواری ناردن ٢٧، بەرواری گەیشتن شەوی ٢٨ ی دەلو١٣٣٣.**

مەقامی پایە بەرزی وەزارەتی ناوخۆ، هەر شكۆدار بێ. **كەیخوسرەوخانی مەریوانی** راپۆرتێكی ناردووە كە بێ پسانەوە سەربازەكانی عوسمانی لە هێڵی مەریوانەوە بەرەو ئۆردووی خۆیان دەچن. ژمارەیەكیان لە ناو مەریوان ماونەتەوە و خەریكی خۆ ئامادەكردنن. **مەحمودخانی مەریوانی** چۆتە نزیك تەورێز و بەهەڵاتن گەڕاوەتەوە، رێگەی ئێمەش گیراوە و ناتوانین بابەتەكان بە ئاشكرا بنووسین. بە پێویستم زانی بە خزمەتتان رابگەیەنم. ٢٧ دەلو، ژمارە ١٨٥٢. **سەردار محی**

.(٢٩٠٠٠٥٧٠١)

---

١ - نەخوێندرایەوە.

## (٥٨)

**لە حکومەتی کوردستانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ٢٧ی رەبیع و لسانی ١٣٣٣**

**بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، لە کوردستانەوە بۆ تاران، ژمارەی تێلگراف ٨٦ بەرواری ناردن ٢٣، بەرواری گەیشتن ٢٣ ی دەلو١٣٣٣.**

مەقامی پایە بەرزی وەزارەتی ناوخۆ، هەر شکۆدار بێ. بە پێی ئەو راپۆرتەی گەیشتووە، **شێخ عەلائەدین** کە لە هەورامان نیشتەجێیە، وەك شێخەکانی تر خاوەن پێگە و خانەقایە، بە پێی بانگەشەی **شێخ حسامەدین** دوو رۆژی تر دەچێت بۆ جیهاد. تەنیا بۆ ئاگاداریتان بە خزمەتتانم راگەیاند. ٢٧ دەلو، ژمارە١٨٥٥.

**سەردار محی.**

(٢٩٠٠٠٥٨١٦)

## (٥٩)

**لە وەزارەتی ناوخۆوە بۆ حکومەتی کرماشان، یەکەمی رەبیع و لسانی ١٣٣٣.**

**وەزارەتی ناوخۆ، ژمارە ١٠٠٨، غەرە رەبیع و لسانی ١٣٣٣.**

حکومەتی بەرێزی کرماشان، لە بەدواداچوونی تێلگرافی پێشووی خۆتان لەمەڕ هاتنی وەزیرانی ئالْمان و نەمسا بۆ ناو خاکی ئێران، زەحمەت نەبێ، لەلایەن بەرێزتانەوە بۆ دابین کردنی ئاسایشی تێپەڕینی ئەوان لە قەسرەوە تا هەمەدان چ رێ و شوێنیکتان داناوە؟، چونکە بە پێی ئەو شتەی لەلایەن کارگێڕی بەغداوە گەیشتووە، لەم چەند رۆژەدا دەگەنە سەر سنوور. چاوەڕوانم لە وەڵامی ئەم تێلگرافەدا ئەو رێ و شوێنەم پێم رابگەیەنن، کە بۆ دابین کردنی ئاسایشی رێگا و پاراستی رێزی ئەوان دەیگرنە بەر. (واژۆ).

(٢٩٠٠٠٢٩٣٣).

(٦٠)

**(لە والی پشتکووهەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، یەکەمی رەبیع و لسانی ١٣٣٣)**

**بەڕێوەبەرایەتی حکومەتی پشتکووه غولامرەزاخان والی ئەمیر جەنگ، بەرواری غەرە مانگی رەبیع ولسانی ١٣٣٣.**

بۆ حزووری موبارەکی حەزرەتی بالاّ، شکۆمەند پایەبەرز و مەزن وەزارەتی ناوخۆ، سایەی بەردەوام بێ. نووسراوی حەزرەتی پایەبەرزمان زیارەت کرد. لە مانی شان و شکۆی حەزرەتی هێژا خۆشحالّ بووین و سوپاسی خوامان کرد. بەردەوام لە دەرگای خواوەندی یەکتا دلّسۆزانە دواکاری لە ژیاندا مانەوەی موبارەکتانین. سوپاس بۆ خوا کاروباری پشتکووهیش لە هەموو روویەکەوە رێك و پێك و سنووریش پارێزراوە. وەك ئەرکی پاراستن و وەفاداری هەمیشەیی بۆ دەولّەت بە هۆی نزیکی و هاوسێیەتی کە تازە تووشی کێشەی دەرەوە و بەصرە بووین، بۆ ئەوەی لە نەبوونی جەنابتاندا لە مەر خۆشەویستی دەولّەت و خزمەت بە کاربەدەستانی بالاّی دەولّەت، هەلّە و لادانێك لە سنوور روونەدات. ئەو ئۆردووەی پێکهاتووە لە دوانزە سێنزە هەزار سوارە و تفەنگچی و سوارەی پشتکووهی، وەرێمخستووە و تا کاتی نووسینی ئەم نامەیە، لە نزیك و پەنای ئاوی **کەرخە،** کە سنووری خودی دلّسۆزتانە نیشتەجێی بووم و بۆ رێك و پێك کردنی نەزمی **دیزفول** و ئاسایشی رێبواران و هاتوچۆی کاروان تا نزیك دیزفول کە بە **ئەیوانی کەرخە** بە ناوبانگە، بە رووی خاکی کەرخەدا کراوەیە و تا ناوەراستی رووبارەکە دەڕۆم، تا لەم سنوورەم، تکام وایە لە سایەی موژدەی سەلامەتی موبارەکتان هەر خزمەتێکی جەنابتان هەبێ لە عەرەبستان و پشتکووه مایەی شانازی و سەربەرزیمە. بە ئومێدی خوا دەمەوێ لەم سنوورەدا جۆرێك ئامرازی ئاسوودەیی خەلّك و بەندەکانی خوا وەدی بێنم، کە ببێتە هۆی شکۆ و ئاسوودەیی کاربەدەستانی دەولّەت و میللەت. شتێکی ترم نییە. (واژۆ) **غولاّمرەزا والی ئەمیر جەنگ.**

(١/٥٠٩٩)

## (٦١)

**(له حکومەتی کوردستانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ٢ ی رەبیع و لسانی ١٣٣٣)**

**بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، لە کوردستانەوە بۆ تاران، ژمارەی تێلگراف ١٠٧ بەرواری ناردن ٢٧، بەرواری گەیشتن ٢٨ ی دەلو١٣٣٣.**

تاران، مەقامی پایە بەرزی وەزارەتی ناوخۆ، هەر شکۆدار بێ. بە پێی راپۆرتی بەڕێوەبەرایەتی دارۆغا، **شێخ عارف**، کە لە ناوشار ماوەتەوە، دوای یەك هەفتە لە سەر داوای **شێخ حسامەدین** دەچێت بۆ جیهاد. تەنیا بۆ ئاگاداری بە خزمەتتانم راگەیاند. ٢٧ دەلو، ژمارە ١٨٥٤. **سەردار محی.**

(٢٩٠٠٠٥٨١٦).

## (٦٢)

**له حکومەتی کوردستانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ٣ ی رەبیع و لسانی ١٣٣٣**

**بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، لە کوردستانەوە بۆ تاران، ژمارەی تێلگراف ١١٦ بەرواری ناردن ٢٨، بەرواری گەیشتن ٢٩ ی دەلو١٣٣٣.**

تاران، مەقامی پایە بەرزی وەزارەتی ناوخۆ، هەر شکۆدار بێ. ئەمڕۆ **شێخ مەعروف** کە بەردەوام بە خزمەتتانم ناساندووە، لەگەڵ بیست لایەنگرانی خۆی، کە تفەنگی سێ تیر و پێنج تیری داوە بە دە کەسیان و، لەگەڵ عەلی ئەفەندی و چوار سەربازی عوسمانی بۆ جیهاد وەڕێکەوتوون. دوێنێ عەلی ئەفەندی رۆیشتووە بۆ **سەڵەوات ئاوا**، تا لایەگرانی خۆی بۆ جیهاد ببات. شابەندەر بە جیدی بایەخ بە ناردنی لایەنگرانی دەدات. تەنیا بۆ ئاگاداریتان بە خزمەتتانم راگەیاند. شەوی **٢٩** دەلو، ژمارە **١٨٦٧**، **سەردار محی.**

(٢٩٠٠٠٥٨١٦).

## (٦٣)

**(راپۆرتی سنورپارێزی، ٣ ڕەبیع ولسانی ١٣٣٣)**[1]

**وەزارەتی کاروباری دەرەوە، بەڕێوەبەرایەتی نووسراوەکانی عوسمانی، درێژەی نووسراوی سنوورپارێزی بۆ کارگێڕی کرماشان. بەرواری ٣ ی مانگی ڕەبیع و لئاخر ٢٩ ی دەلو، ژمارە ١٧٢.**

زیارەتی دەسنووسی موبارەکتانمان کرد، کە لە ڕێکەوتی **٢٨** ی مانگی ڕەبیع و لئەوەل بە ژمارەی **١٧٦٦** و ژمارە **١٧٥٦** نووسرابوون لەگەڵ زەرفی کارگێڕی خانەقین. زەرفەکەم نارد. هەروەها نووسیبووی و بەردەوام بابەتەکان بە بێ غەرەز و بەوپەڕی وردەکارییەوە رابگەیەنێ. ئاشکرایە بە پێی ئەو ڕێوشوێنانەی کارگێڕی، بە تەواوی لە بابەتێك نەکۆڵمەوە و تاوتوێی نەکەم، هەرگیز راپۆرتی بێ سەرچاوە بە خزمەتتان راناگەیەنم و هێچ نیازێکی لە پشتەوە نییە. فەرموویانە لەو بابەتانەی **صمصامولمەمالك** لە تێلگرافخانەوە بە حکومەتی پایە بەرزی راگەیاندووە و پێچەوانەی راپۆرت و تێلگرافی سنوورپارێزی بووە، سەری سوڕماوە. چەندی جار بە خزمەتتانم راگەیاندووە کە **صمصام ولمەمالك** بە رواڵەت لایەنگری عوسمانییەکانە و دەیەوێ لە خۆیان رازی بکات، لەم لایەنەوە کاتێك بانگهێشتی شاریان کردووە، خزمەتگوزاری و بایەخپێدانی خۆی راگەیاندووە. لەبەرئەوەی لەوەڕگاکەی لە خاکی عوسمانی دایە و هەندێك نووسراوی لە مەڕ یەککگرتن لەگەڵ عوسمانییەکان لەلایەن **حوجەت ولئیسلام** پێگەیشتووە، لە گفتوگۆکانیشی دا وادەردەکەوێ کە حەز لە هاورێییەتیان دەکات، لەبەرئەوە لە دەروونەوە پەیم بە بیروخەیاڵی ئێستای ئەو نەبردووە. ئەوەی کە لە زمانی خەڵکەوە دەیبستم و هەستی پێدەکەم و بە پێی ئەرکی سەرشانی خۆم، ناچارم راپۆرتەکەی بە زەینی موبارەکتانی رابگەیەنم، تا کاربەدەستانی باڵا پێشوەخت لە بیر و خەیاڵی هێندێکان ئاگادار بن و پێشیان پێبگرن، جگەلەوە هیچ نیازێکی ترم نییە . پێم وایە هەرکاتێك ترسێکی حکومەتی پایە بەرز لە ئارادا نەبێت، بە دڵنیاییەوە کێشەو گرفت دێنە ئاراوە. بۆ راپۆرت ناردن جگە لە گێڕانەوەی

---

١- بە پێی نامەی ژمارە( ١٤٣٤٢/٣٠١٨ ) بە ڕێکەوتی ١١ ی جەمادی یەکەمی ١٣٣٣، وەزارەتـی دەرەوە دەقی ئەم راپۆرتانەی خوارەوەی (بەڵگەنامەی ٦٣ و ٦٤) ناردووە بۆ وەزارەتی ناوخۆ (١/٤٠٧٥).

وتەی خەڵك و بیستنی بابەتاكانی سەرزاریان، ئامرازێكی ترم لەبەر دەست دا نییە، گومان ناكەم بۆ نووسینی راپۆرت بەڵگەنامەیەك دەسبەكەوێ. سەبارەت بە روونكردنەوەی ئەو پرسیارانەی كارگێڕی بەڕێز فەرموویەتی، بە جیا وەڵامیان دەدەمەوە. حەسەن سنوورپارێز.

لە پرسیاری یەكەمدا دەفەرموێ عوسمانییەكان لە خانەقین و زەهاو سوپایان چەندە؟

وەڵام: بە پێی ئەو نووسراوانەی لەلایەن **مەجیدخان سالاری باجەلان**[1] گەیشتووە، كە وەك خۆی پێشكەشتانی دەكەم[2]، و لێكۆڵینەوەی هەواڵگیرەكانمان لەم دەوروبەرە، گومانی تێدانییە كە ئێستا هەشسەت و پەنجا تا نۆسەت هەزار سەربازی عوسمانی، لە خانەقین و كانزا و سەر سنوور هەن. لە **قزل رەبات و شارەبان**یش سوپایان هەیە، لەبەرئەوەی دوورن بە تەواوی ژمارەیان نازانم، لێكۆڵینەوە لەم رووەوە ئەركی كارگێڕی خانەقینە.

پرسیاری دووەم: فەرموویانە بە چ مەبەستێك بیریان لە سنوور بەزاندن كردۆتەوە؟

وەڵام: هەرچەندە بەڵگەیەكم لەم بارەوە لەدەستدا نییە، بەڵام ئاشكرایە كە عوسمانییەكان هەوڵ دەدەن، خەڵكی ئەم سنوورە رەگەڵ خۆیان بدەن و بەشداری شەڕ بن. نووسین و ئاڵوگۆڕی نهێنی و ئاشكرایان لەگەڵ سەركردە سنوورپارێزەكان هەیە، دەرفەتێكیان پێداون تا لە هێڵی كوردستانەوە سوپای خۆیان بگەیەننە قەزوین.

پرسیاری سێهەم: فەرموویەتی جەنابی صمصام لە كۆشكدا چەند سواری ئامادەی هەیە و چەندیان دەتوانن لە كاتی پێویستدا ئامادە بن؟

وەڵام: بەڵێ جەنابی صمصام ولمەمالك بە سوارەكانی خۆی و كوڕەكانییەوە، لە **قەڵا سەوزە**وە تا **سەرپوڵی زەهاو** رەنگە سەت و سی تا سەت و پەنجا سواریان هەبێت. بەڵام ئەگەر داوا بكەن لە هۆزی **سنجابی**، كە لە **باغچە** و **قەتارن** و، داوا لە **سەردار ناصر**[3] و **سەردار موقتەدر**[4] بكەن كە لە كوێستان و گەرمەسێرن، سوارەكانیان ئامادە بكەن و، ئەگەر **قەڵخانییەكان**یش لە رووی مەعنەویەوە لەگەڵیان یەكبگرن، رەنگە پێكەوە ژمارەی

---

- لە شوێنی تر بە مەجید سالار سوڵتانی باجەلان و مەجیدخان ناوی هاتووە.(و/ ك) ١
- بڕوانە بەڵگەنامەی ژمارە ٦٤. ٢
٣- لە شوێنی تر بە قاسم سەردار نوسرەتی سنجابی ناوی هاتووە.
٤- لە شوێنی تر بە عەلی ئەكبەر سەردار موقتەردی سنجابی

هەشسەت نۆسەت سواری کارامە و باش ئامادە بکەن، کە ڕەنگە زۆربەی چەکەکانیان سێ تیر و پێنج تیر بێ.

پرسیاری چوارەم: سەبارەت بە کونسوڵی ئاڵمان فەرموویەتی ئاگاداری بکەینەوە کە چ دەڵێن و چی دەکەن؟

وەڵام: ئەم پلەدارەی ئەڵمانی[1] نزیکەی بیست ڕۆژە لە قەسرە و لەگەڵ جەنابی **صمصام** بە گەرمی ڕێککەوتون و ڕۆژانە پێکەوە بۆ ڕاو دەچنە دەرەوە و هێندێك جار کۆبوونەوەی نهێنییان هەیە. نۆکەرەکانی صمصام ولمەمالك لە چایخانە وتویانە صمصام ولمەمالك بە کونسوڵی وتووە: ئەگەر چەك و فیشەك بگەیەنیتە دەستم، دەتوانم لەم سەرسنوورە تا چوار هەزار کەس بۆ جیهاد و یەکگرتن لەگەڵ عوسمانییەکان ئامادە بکەم. دیار نییە هەردوولایان بە تەمان چیبکەن. وەك دەڵێن مانەوەی کونسوڵ لە قەسر بۆ ئەوەیە، کە هێندێك شمەك و دکتۆرێك و سێ چوار خزمەتگوزاریان لە **بەغدا** ماوە، چاوەڕوانی ئەوان دەکەن و لە ماوەی مانەوەیدا لە قەسر، هەموو ڕۆژێ خەریکی تێلگراف کردنی ڕەمزدارە بۆ عوسمانییەکان و شوێنی تر، ناردنی پەیامبەر و نەخشەکێش و گەران بووە بە دەورەبەری قەسردا.

ئاشکرایە نیازی دڵیان بەکەس ناڵێن. دوێنێ کە سەرەتای مانگی ڕەبیعولسانی بوو، کەسێکی فەرەنگی بەخۆی و سێ چوار چەکدار و هێندێك شتومەکەوە، لە خانەقینەوە گەیشتنە **قەسری شیرین** و چوون بۆ ماڵی کونسوڵ و وتوویەتی **ئاژانسێك** لە قەسر دادەنێم و خۆم دەچم بۆ کرماشان و لەوێشەوە بەرەو عێراق[2].

دوێنێ لەگەڵ ئەوەشدا کە باران بە خوڕ لە قەسر دەباری، خودی کونسوڵ لەگەڵ پیاوەکانی و چەند کەس لە سوارەکانی صمصام ولمەمالك، بە ڕێگای نهێنیدا چۆتە لای هاوەڵەکانی و پێم وایە میوانێکی لەگەڵ بووە و لە ڕێگەی (**ئاق داق**) ەوە بردوویانە بۆ کانزاکە، یا هاتۆتە ناو قەسر، یا لە شوێنێکی تر دایانناوە. بیستومە بە تەمایە چەند سوارێك بە کرێ بگرێ. صمصام ولمەمالك ئەم نیازەی لای خستە روو کە جەنابی کونسوڵ دەڵێ: هەرکە گەیشتمە کرماشان دەبێ سنوورپارێز و ئاژانس هەردوکیان لیرە نەمێنن.

پرسیاری پێنجەم: لە بارەی جەنابی **شێخ حەسەنەوە**؟

---

١- مەبەست شونمانە.

٢- لەدەقەکەدا ئەراك نووسراوە.

وەڵام: ئەم کابرایە خەڵکی کوردستانە و سونی مەزەبە، عوسمانیشە. **شێخولئیسلام** و ئەندامی ئەنجومەنی **ئیتحاد و تەرەقی** کەربەلا بووە. هێندێك نووسراوی زانایانی دینی و والی بەغدای لێرە بڵاوکردۆتەوە، هەروەها داوای لە خەڵك کردووە بۆ جیهاد بچن و لەگەڵ عوسمانییەکان یەکبگرن. چوار پێنج رۆژ لە قەسر بوو و دواتر رۆیشت بۆ کرماشان. جەنابی حەزرەتی **ئایەتوڵڵازادەی تارانیش** رۆژی کۆتایی رەبیعولئەوەل هاتۆتە ناو قەسر و خەڵك دەچنە خزمەتیان. گوایە مەبەستیان یەکییەتییە، هێشتا مەبەستەکانیان ئاشکرا نەبووە.

پرسیاری شەشەم: فەرموویان بەرپرسی ئیدارەکان و سەرۆك عەشیرەتەکانی سەر سنوور، لە چ رێگەیەکەوە هاتچۆ دەکەن؟

وەڵام: ئەندامانی ئیدارەکانی قەسری شیرین، یەك دوانێکیان نەبێ، ئەوانی تر هەموویان خەریکی جموجوڵ و واستە واستەکاری و ریککەوتنن لەگەڵ حاکمی قەسر. ئەگەر باسی بکەم، ئەوا بابەتەکە زۆر درێژ دەبێت و رەنگە ببێتە روونکردنەوەی روونکراوەکان. وەلێ روانگەی تێکڕای سەرۆك عەشیرەتەکان ئەمەیە: کە دەیانەوێ پێکەوەیە ریککەوون و لە هەر شوێنێك ئەسپ و تفەنگی چاکی لێبێت بە نرخێکی باش دەیکڕن. بەزۆری بەرژەوەندییەکانی خۆیان لە شۆڕش کردندا دەبینن و کەمتر حکومەتی بەتوانایان خۆش دەوێ. بەڵام هاتنی حکومەتی پایەبەرز و بڵاوبوونەوەی بزوتنەوەکەیان لە سەر سنوورەکان، هێندێکیانی زۆر ترساندووە. تایفەی **باجەلان سەفەرخان سوڵتان**، لەگەڵ تایفەی **جاف قادر مراد وەیسی** و جافی تایفەی **گۆران** و **فەتاح بەگ**، لەگەڵ **سەردار رەشید** سوێندیان خواردووە و یەکیان گرتووە و، لەگەڵ **سەردار نصرەتی کەڵهوڕ**[1] هاتوچۆیان هەیە و نێوانیان لەگەڵ سنجابییەکاندا نییە. لەمەڕ بارودۆخی کەڵهوڕ هەواڵێکی راست و دروستم نییە. وەلێ سەرۆکەکانی سەر سنوور بە باشی تێگەیشتوون، بە بوونیان لەگەڵ ئەم بەهێزییەی ویلایەتی پایە بەرزی کرماشانی سەرسنوور، باشتر دەبنە خاوەنی نەزم و ریك و پێکی.

پرسیاری حەوتەم: فەرموویانە **ئاژانسی** کونسوڵگەری رووس حاڵی چۆنە و چ دەکات؟

وەڵام: هێندێك کەس **ئاژانسی** رووسیان لە هاتنی ئەم کەسە ئەڵمانییە بۆ قەسری شیرین ترساندبوو، ئەویش وایدەزانی ئەم هاتنە بۆ ئەو مەترسیدارە و داوای لە حاکمی قەسر کردووە ئەمنییەتی بپارێزێ. جکومەتی قەسریش داوای لە کونسوڵی ئەڵمان کردووە، ئەویش بەفەرمی

١- لە شوێنی تر بە سلێمان سەردار نوسرەتی کەهلوڕ ناوی هاتووە.( و/ ك)

ئاسایشی ناوبراوی دابین کردووه، ئەوەش سەرەڕای ئەوەی دوو پیاوی **صمصامولمەمالك**، شەو و رۆژ لە لای ئاژانسن و ئاگایان لێیەتی و ئەگەر بێتە دەرەوەش ئەو دوو کەسە بەدوایەوەن، کەچی ژن و منداڵەکەی ناردووە بۆ کرماشان.

لە کۆتاییدا دەسنووسی موبارەکتانیان ناردووە، بە تێلگراف لە وەزارەتی شکۆمەندی کاروباری دەرەوە مۆڵەتی هاتنی بەندە گەیشتووە، کە تەتەرێك بە شێوەی کاتی هاتووە و بەخزمەتی گەیشتووم و زۆر حەز دەکەم پێداویستی سەفەرەکەم دابین بکەن تا زووتر وەڕێ بکەوم. بە پێی هەواڵێك کە لە بەغداوە بە **قەسری شیرین** گەیشتووە، نەخۆشی **تاعوون** لە بەغدا زۆر تەشەنەی کردووە.

(ئەم نووسراوە لەگەڵ دەقە سەرەکییەکە یەکە)

(ك٤٠٧٥ /٢ تا٧)

## (٦٤)

**(راپۆرتی مەجیدخانی باجەلان، ٢٩ ی رەبیع و لئەووەل)**

**وەزارەتی کاروباری دەرەوە، درێژەی کاغەزی مەجیدخان سوڵتانی باجەلان.**

بەقوربانت بم، سەبارەت بە دیداری دوێنێ و بەشێك لەو گفتوگۆیانە، بە تایبەتی پیاوم ناردووە بۆ **کانزای نەوت** وشوێنی پێویست تا زانیاری وەدەسبێنن. ئەمڕۆ یەك شەممە **٢٩** ی ئەم مانگە نێردراوەکانی بەندە گەڕاونەتەوە و دەڵێن سەت وپەنجا کەس لە کانزای نەوتن. سەد کەسیان لە سەر سنوور لە نێوان **کانی زەرد** و **قەلعە موعلیم** داناوە. شەشسەت کەسیش لە **خانەقینن**. ئێستا ئەو سێ خاڵە هەشسەت و پەنجا کەسی لێیە. ئەگەر دوایی ئەم ژمارەیە زیاد بکا، هەواڵگرەکە هەر لە کارەکە بەردەوامە و دوای وەدەستهێنانی زانیاری، هەواڵەکە بە بەڕێزتان رادەگەیەنم. لەوە زیاتر خزمەتێکی تر نییە بیکەم. خزمەتگوزارم، سەروەریتان بەردەوام بێ. **مەجید باجەلان**. (ك٤٠٧٥/٨).

## (٦٥)

**(لە وەزارەتی ناوخۆوە بۆ حکومەتی کوردستان، ٦ی رەبیع و لسانی١٣٣٣)**

**وەزارەتی ناوخۆ، بەشی نووسراوەکانی رۆژئاوا، بیٚ ژمارە، بە بەرواری ٦ ی رەبیع ولئاخر ١٣٣٣**

حکومەتی شکۆمەندی کوردستان. تلیٚگرافی وەڵام بە ژمارە ٩٨٠ سەرنج درا[١]، ئەو زانیارییانەی لەمەڕ ریٚکخستنی کاروبارەکانن، ئیٚستا بە هیچ شیٚوەیەك بابەتی ئەم گفتوگۆیە نین و پیٚویستە بە جیدییەتی تەواو خەریکی ئەنجامدانی ئەرکی حکومەت بن و، مەرجەکانی نیشتمانپەروەری و خۆشەویستی خۆتان بۆ دەوڵەت، لە مەڕ ئەو ئەرکانەی پیٚتان سپیٚردراوە کاملٚ بکەن، تا ئەنجومەنی نوێی وەزیران بتوانیٚ سەرکەوتووبیٚ.

(٢٩٠٠٠٤١٥٦).

## (٦٦)

**(لە وەزارەتی دەرەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ١٢ ی رەبیع ولئەوەلی ١٣٣٣)**

**وەزارەتی دەرەوە بەریٚوەبەرایەتی تەشریفات، بەرواری ١٢ی مانگی رەبیع و لسانی ١٣٣٣، ژمارە ١٣٨٥١/١٤١٠، بەپەلە.**

وەزارەتی شکۆمەندی ناوخۆ. بە پێی ئەو تێلگرافەی کە لە **ئەسلامبوولەوە** گەیشتووە، وەزیر موختاری ئەڵمان و نەمسا و دوو پلەداری سەربازی و وەرگیٚڕ، لە ریٚگەی بەغدا و هەمەدانەوە بەرەو تاران دەڕۆن و رەنگە تا دە رۆژی تر بگەنە سەر سنوور. لەبەر ئەوە تکا دەکەم بۆ ئاسان کردنی رۆیشتن و ئاسایشی ئەوانە تێلگرافیٚکی فەرمان بۆ شوێنە پیٚویستەکان دەربکەن. (مۆر) **محەممەد ئیبراهیمی غەفاری.**

(ك١/٨٦٨).

---

١ - لەم کۆمەڵە بەڵگەنامەیەدا بەدی نەکرا.

## (٦٧)

**(له حکومەتی کوردستانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ٨ ی رەبیع و لسانی ١٣٣٣)**

**بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، لە کوردستانەوە بۆ تاران، ژمارەی تێلگراف ٢٩، بەرواری ناردن ٤، بەرواری گەیشتن ٥ ی حوت ١٣٣٣.**

مەقامی پایە بەرزی وەزارەتی ناوخۆ، هەر شکۆدار بێ. **فەرید ودەولە** سەرۆکی ئەوقاف و کەفیلی دادوەری، کە ماوەیەکە بە پێچەوانەی پێویستی ئێستا و بەرژەوەندییەکانی دەوڵەت کار دەکات. بە تایبەتی ئەم رۆژانە خەڵکی کۆکردۆتەوە و بە جیدی خەریکی ئەوەیە تێلگرافێك بۆ دەوڵەت بنێرێ دژی بێلایەنی و بەشدار بوونی جەنگ، هەروەها شابەندەر وەخۆ کەوتووە و بانگهێشتی کردووە بۆ شابەندەرخانە و لە بارەی رێخستنی موجاهیدەکان و بەرێکردنیان، گفتگۆ دەکەن. ناڵێم یەکییەتی ئیسلامی ئۆمەت و هەستیاری خەڵك لەبەرچاو نەگیردرێ، وەلێ ئەم کارە لەلایەن نوێنەرێکی فەرمی دەوڵەت لە کوردستان دەبێتە هۆی زەحمەت و خراپکاری گشتی و رەنگە ئینگلیزەکان بەشێك لەو داوایانە بە هاندان بزانن لەلایەن دەوڵەتەوە. پێویست بوو بەخزمەتتان بگات. ٤ ی حوت، ژمارە **١٨٩٤**. **سەردار محی**.
(٢٩٠٠٠٥٨٠٣)

## (٦٨)

**(له حکومەتی کوردستانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ٩ ی رەبیع و لسانی ١٣٣٣)**

**بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، لە کوردستانەوە بۆ تاران، ژمارەی تێلگراف ٢٧، بەرواری ناردن ٥ ی حوت، بەرواری گەیشتن ٥ ی حوت ١٣٣٣.**

مەقامی پایە بەرزی وەزارەتی ناوخۆ، هەر شکۆدار بێ. هەروەك لە تێلگرافی رەمزداری ژمارە **١٨٩٤** دا بە خزمەتتانم راگەیاندووە[١]، کاریگەری کارەکانی **فەرید ودەولە** ئەوەیە، کە ئەمڕۆ **مەلا عەبدولحەمید** خەڵکی لە مزگەوت کۆکردۆتەوە و هانی داون بۆ جیهاد، هەروەها

---

١- بەڵگەنامەی ژمارە ٦٧.

رایگەیاندووە ئەگەر حکومەت ڕێگر بێ، خۆمان لەسەر لایەك ساغ دەکەینەوە. چوارەمی حوت، ژمارە **١٨٩٨**. **سەردار محی**.
(٢٩٠٠٠٥٨١٠)

## (٦٩)

**(لە وەزارەتی ناوخۆوە بۆ ویلایەتی لۆڕستان، ٩ ی ڕەبیع و لسانی ١٣٣٣)**

**وەزارەتی ناوخۆ. بەڕێوەبەرایەتی باشوور، بروجەرد، ژمارە ٩٢١، بەرواری ٥ حوت.**

ویلایەتی پایە بەرزی بروجەرد و لۆرستان و عەرەبستان، بە پێی ئەو زانیارییانەی گەیشتوون جەنابی **ئەمیر جەنگ** والی پشتکووە هێندێك مەیلیان گۆڕاوە. هەرچەند بە پێی دەوڵەتخوازی و جوامێری ناوبراو، باوەڕ ناکەم ئەم هەواڵە لە سەرچاوەیەکی ڕاستەوە بێ، چونکە ناوبراو لە پێش هەموو کەسێکەوە پێی لەسەر بەرژەوەندییەکانی دەوڵەت داگرتووە و هەرگیز نەمانبیستووە و نەمان دیوە بە پێچەوانەی چاوەڕوانکراو هەنگاوێکی نابێ، وەلێ پێویستە جەنابتان لەم ڕووەوە لێکۆڵینەوەی ڕاست و دروست ئەنجام بدەن، ئەگەر بە پێچەوانەی بەرژەوەندییەکانی دەوڵەت و بێلایەنی، هەستی جولابێ، وای لێبکە بەرژەوەندییەکانی دەوڵەت لەبەرچاو بگرێ و ئەنجامی لێکۆڵینەوە و کارەکانتمان بە زوویی بۆ بنێرە. مانگی ڕەبیعولئەول ژمارە **٥٩١٧**، (لە درێژەی ڕاپۆرتەکەدا بە خەتێکی تر نووسراوە) لەبەر ئەوەی باوڕناکەم، پێشتر لە بەرێزتانم نەپرسیوە و ڕاستەوخۆ تێلگرافم نەکردووە. ئاشکرایە کە زانیارییەکان ڕاستتر و کامڵ تر دەبن و ئێستا خودی والی لە کوێیە و هەر زانیارییەکت هەیە خێرا بینێرە. بە ڕەمز بنێردرێ. (واژۆ)
(٢٩٠٠٠٦٠٢٧)

## (٧٠)

**(لە حکومەتی کوردستانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ١٠ ی ڕەبیع و لسانی ١٣٣٣)**

**بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، لە کوردستانەوە بۆ تاران، ژمارەی تێلگراف ٣٧ بەرواری ناردن ٦ ی (حوت)، بەرواری گەیشتن ٦ ی حوت ١٣٣٣**.

مەقامی پایە بەرزی وەزارەتی ناوخۆ، هەر شکۆدار بێ. لە بەدواداچوونی تێلگرافە رەمزدارەکانی ١٨٩٤، ١٨٩٨[1] دەرئەنجامی کۆبوونەوەکە لە شابەندەرخانە ئەوەیە، کە لە سەرۆکایەتی شابەندەرخانە نووسینگەیەکی وەرگری فەریدولدەولە دابمەزرێ، تا یارمەتی کۆبکرێتەوە. هەروەها نووسینگەیەکی تر دانراوە بۆ بەرێکردنی خەڵك بە رێك و پێکی بۆ جیهاد و داوای لە خەڵك کردووە رۆژی هەینی لە مزگەوتی **مەلا عەبدولحەمید** کۆببنەوە و گفتگۆ بکەن و خەڵك بۆ کۆکردنەوەی یارمەتی بوروژێنن و رۆژی شەممە کۆمەڵێکی تریان ئامادە کرد تا رۆژانە جیهاد بکەن و ئەمرۆش **موشیر دیوانی وەکیلولمولك** و کۆمەڵێك ئەشرافی ناوچەکە هاتن و دەڵێن لە کاتێکدا دەوڵەتی ئێران بێلایەنە کەچی **فەریدولدەولە** کە ئەندامێکی فەرمی دەوڵەتە، رۆڵەکانی ئێمە بانگهێشت دەکا بۆ شابەندەرخانە و ئەو هەموو یارمەتییەی کۆکردۆتەوە و راستەوخۆ دەست لە کاروبار وەردەدات و، ناچارمان دەکات تێلگرافێکی رەتکردنەوەی بێلایەنی بنێرین بۆ حزووری موبارەکی هومایونی. ئەگەر تێلگرافەکە واژۆ نەکەین عوسمانییەکان رقمان لێدادەگرن و ئەگەر واژۆشی بکەین مانای وایە لەبەرامبەر دوڵەتدا کەمتەرخەمین. بەم کردارانەی **فەرید ولدەولە**، کە ئێمە قاچاغ دەکات چارمان چییە؟ تەنیا بۆ ئاگاداری بە خزمەتتانم راگەیاند. هەر چۆنێك ئەمر بفەرموون ئاوا وەڵامیان دەدەینەوە. شەوی ٧ ی حوت، ژمارە ١٩٠٢، **سەردار محی**.

(٢٩٠٠٠٥٨١٠)

## (٧١)

**(لە وەزارەتی ناوخۆوە بۆ حکومەتی کوردستان، ١١ ی رەبیع و لسانی ١٣٣٣)**

**وەزارەتی ناوخۆ، ژمارەی تۆماری نوسراو٨٥٦، ١١ رەبیع و لسانی ١٣٣٣**

حکومەتی بەرێزی کودستان، تێلگرافی رەمزداری جەنابتان بە شمارەی **١٦٢٨**[2] سەرنج درا. سەفارەتی گەورەی عوسمانی دڵنیایی دا[3] کە رەفتاری ئەم شابەندەرە لە شابەندەری پێشوو باشتر دەبێت. (واژۆ)؟

.(٢٩٠٠٠٥٧٩٣)

- بەڵگەنامەی ژمارە ٦٧ و ٦٨. ١

٢- بەڵگەنامەی ژمارە ٤٣.

٣- نەخوێندرایەوە.

## (٧٢)

**(له حكومەتی كوردستانەوه  بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ١٢ ی رەبیع و لسانی ١٣٣٣)**

**بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایه بەرزی ئێران، له كوردستانەوه بۆ تاران، ژمارەی تێلگراف ٤٩ بەرواری ناردن ٩، بەرواری گەیشتن ١١ ی حوت ١٣٣٣.**

مەقامی پایه بەرزی وەزارەتی ناوخۆ، هەر شكۆدار بێ. له بەدواداچوونی تێلگرافه رەمزدارەكانی **١٨٩٤**، **١٨٩٨**[١] ئەمڕۆ بەیانی كۆمەڵێك له زانایان و بازاڕیان و بازرگانان، له **مزگەوتی دارۆغه** كۆبوونەوه و دوای راوێژ و گفتوگۆ، بڕیاریاندا رۆژی شەممه پازدەی مانگ، دوكان و بازار دابخەن و ئەشراف و پیاوماقولان له **مزگەوتی جومعه** كۆبكەنەوه و یارمەتیان لێوەربگرن و بیدەن بەو كەسانەی له رووی لەش و لارەوه بەتوانان و بیانێرن بۆ جیهاد و ئەوەی مایەوه راستەوخۆ بیدەن به ئۆردوی عوسمانییەكان و دوای نیوەڕۆی ئەمڕۆش، ئەوانەی ناومان بردن له شابەندەرخانه كۆبوونەتەوه و دەرئەنجامەكەشی هەرچی بوو به خزمەتتانی رادەگەیەنم. شەوی ٩ ی حوت، ژماره ١٩٣٦, **سەردار محی.**

(٢٩٠٠٠٥٧٩٠).

## (٧٣)

**(له ویلایەتی لۆڕستانەوه بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ١٥ ی رەبیع و لسانی ١٣٣٣)**

**بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایه بەرزی ئێران، له بروجەردەوه بۆ تاران، ژمارەی تێلگراف ٤٩، بەرواری ناردن ١١، بەرواری گەیشتن ١٢ ی حەت ١٣٣٣.**

مەقامی پایه بەرزی وەزارەتی ناوخۆ، هەر شكۆدار بێ. زیارەتی تێلگرافی ژماره ٩٢١ مان كرد[٢]. خۆتان حاڵی تەمبەڵی و خۆویستی والی دەزانن، كه تا بۆی بكرێ ئاسایش و

---

١- بەڵگەنامەی ژماره ٦٧ و ٦٨.

٢- بەڵگەنامەی ژماره ٦٩.

خۆشگوزەرانی خۆی تێك نادات. ساڵی پار بەهۆی تایبەتمەندی و دۆستایەتی بەندە و پێداگرتنی خەڵکێکی زۆر، **ئەفراسیاب کوڕی فەراش باشی** یان نارد بۆ **لۆڕستان**، کە تارادەیەك لە بەرژەوەندی خۆشی دابوو، تا بۆی بکرێ نایەوێ بە پێچەوانەی فەرمان و ویستی دەوڵەت هەنگاو بنێ، وەك چۆن زانایانی دینی عێراق زانایەکیان نارد بانگهێشتی ناوبراوی کرد بۆ جیهاد، لە وەڵامدا وتی من نۆکەری دەوڵەتی ئێرانم و لەبەرئەوەی دەوڵەتی ئێران بێ لایەنە من بەشداری هیچ پرسێك ناکەم، باوەڕناکەم ئەو ئیسراحەتی خۆی تێك بدات. بە تەواوی دڵنیام پێچەوانەیە. پێم وایە ئەو وتانە و ناوبانگەکەی، یا لەلایەن ئەمیر موفەخەمەوەیە، یا بە هاندانی ئەو بووە. نەمدەویست لەم بارەوە هیچ شتێك بڵێم، وەلێ ئێستا ناچارم بە نهێنی بە جەنابی مەبارەکتان رابگەیەنم، ئەم پیاوە (**ئەمیر موفەخەم**) هەر لەسەرەتای دەسبەکار بوونی لە کرماشان، خەریکی خراپکردنی کاری لۆڕستان بوو، چونکە رەئی ئەمیرانی-[1] بەندە بوو و ساڵی پارەکەش بەشێوەیەك تەمێیان کردووە کە هێز و توانای تێدا نەمێنێ. **میرزا رەحیمی بیگلەربیگی** بانگ کرد بۆ کرماشان و پێشکەشی کرد و، ئەو بەڵێنی دا و دڵنیای کرد، **ئیبراهیم خانی کاکاوەندی** لە دژی **ئەعزەم و لسەڵتەنە** نارد و، ئێستاش پیلانی داناوە تا **والی** لەلای دەوڵەت دزیۆ و بکا و کاربەدەستانیش پشت گوێی بخەن. پێی وابوو بەم ئامرازانە دەتوانێ کاروباری لۆڕستان تێك بدات، وەلێ بە پشتیوانی خوا و ئاورلێدانەوەی حەزرەتی موبارەك و پایە بەرزتان، بەم شتانە کاروباری ئەم وڵاتە تێك ناچێ و بەتایبەتی ئەمڕۆ نامەیەکی دوورودرێژم بۆ والی نووسیوە و جەختم لەسەر بێلایەنی کردۆتەوە.

١٥ ی رەبیعولسانی، ژمارە ١٥٥٢، **رەزا قولی**.

(٢٩٠٠٠٦٥٢٧)

---

١- نەخوێندرایەوە.

## (٧٤)

**(لە حکومەتی کوردستانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ١٦ ی رەبیع و لسانی ١٣٣٣)**

**بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، لە کوردستانەوە بۆ تاران، ژمارەی تێلگراف ٦٣ بەرواری ناردن ١٢، بەرواری گەیشتن شەوی ١٣ ی حوت ١٣٣٣.**

مەقامی پایە بەرزی وەزارەتی ناوخۆ، هەر شکۆدار بێ. بەندە چەندین ساڵە تووشی نەخۆشییەکی درێژخایەن بووم، کە بۆ چەند جار دەچێ دەیگرمەوە و چەندین پزیشکی تارانیش ئاگادارن. ساڵی پار دیسان تووش بوومەوە و بەسەختی لە جێدا کەوتم و بەردەوام بۆ چارەسەری داوای موڵەت و هاتنی تارانم کردووە و پێش دامەزراندنی کابینەی پێشووی حەزرەتی ئەشرەف جەنابی **مستوفی لمەمالك** کە هەر شکۆدار بێ، هەم داوام لە شەخسی حەزرەتی پایە بەرز کردبوو، کە هەیئەتی دەوڵەت رازی بکات مۆڵەتی وەرێکەوتنم بدات، ئەمەش وارێکەوت لەگەڵ گۆڕینی کابینەی سەرۆك وەزیران و وزارەتی ناوخۆی حەزرەتی مستوفی لمەمالك مۆلەتی مەرحەمەت —[1] بۆ ئەوەی پێچەوانەی ئارەزووی جەنابی موبارەکیان نەبێ، مامەوە و بە زەحمەت و بەشێوەی کاتی چارەسەرێك کرام، شوکری خوا دەکەم کە لە ماوەی مانەوەم لەکوردستان، لەپاڵ ئەوەشدا[2] توانیم ئەو ئەرکانەی پێم سپێردراوە ئەنجامیان بدەم و نەزم بپارێزم. وەلێ دیسان ماوەیەکە تەندروستیم تێکچۆتەوە و ناتوانم بەکاروبارەکانم رابگەم و بەم دواییانە چەند جاری تر داوای مۆڵەتم کردووە و مەرحەمەتیان نەکردووە، تا ئاخیرەکەی حەزرەتی ئەشرەف جەنابی سەرۆك وەزیران داوای کرد خۆم لە تێلگرافخانە ئامادەبم و فەرمانی دا دەست لەبەرێوەبردنی کاروباری سەقز و بانە هەڵگرم و پێداگرتنم لەسەرکارەکەم لەبەرامبەر فەرمانی موبارەکی دا بە بێ ئەدەبی دەزانی، لەبەر ئەوە دیسان سەبرم گرت و بە نەخۆشی خەریکی پاکتاو کردنی کاروبارەکان بووم و حکومەتی سەقز و بانەم رادەستی جەنابی **موعتەمیدولملوك** کرد، کە لە کوردستان بە رەوشت بەرزی ناسراوە، ئەویش هەم جەنابی **میرزا محەممەد حوسێن خانی ئەمیر پەنجەی** برای و **میرزا مەسعود خانی** برازایان کە هەردووکیان

---

١- نەخوێندرایەوە.

٢- نەخوێندرایەوە.

کەسانی شایستەن، دوو رۆژی تر وەریَ دەخا. خراپکارانی **گوڵباخی** کە دەستیان کردبوو بە خراپەکاری، وەك لە راپۆرتێکی جیادا پێشکەش بە خزمەتتان کراوە سوپاس بۆخوا تەمیَ کراون، لەبەرئەوەی لە کوردستان جێگای نیگەرانی نییە و سەرەڕای ئەوەی نەخۆشی پێشووم لەوپەڕی توندی خۆی دایە و پێی چەپیشم شل بووە، دەترسم درێژە بکێشیَ و خراپتر بیَ، کە نەتوانم خۆم بگەیەنمە تاران و لە کوردستانیش بە بیَ پزیشکی و بیَ دەرمانی چارەسەرکردن مەحاڵە، لەبەرئەوە بەم تێلگرافە دەست لەکار کێشانەوەی خۆم پێشکەش بە مەقامی حەزرەتی موبارەکتان دەکەم، بەو لوتفەی لەگەڵ بەندە هەتانە داواکارم لەم هەفتەیەدا مۆڵەتم بدەن بەرەو تاران بێم، بەڵکو چارەسەر بکرێم و بتوانم خزمەتگوزاری دەوڵەت بم، ئەگەر بەم نەخۆشییەوە نەتوانم کاروبارەکان بەڕێوەبەرم، مانەوەی بەندە بەچ دەچیَ و ئەگەر مەرحەمەت نەفەرموون-[1] بە خزمەتتان رادەگەیەنم ئەگەر بەم نەخۆشییەشەوە بمتوانیبا لە کوردستان بمێنمەوە، خوا شاهیدە هەرگیز سەغڵەتم نەدەکردن و بۆ ئاسایشی داهاتووی خەڵکی کوردستان و ئاسودەبوونی کاربەدەستانی پایە بەرزی دەوڵەت، خزمەت کردنم لەم دەڤەرەدا دەخستە پێش ئاسوودەیی خۆم، وەلیَ بە داخەوە دەزانم بەم نەخۆشییەوە و بیَ چارەسەری بنبڕ، ناتوانم خزمەت بکەم، دەپارێمەوە دەست لەکار کێشانەوەکەم لەگەڵ مۆڵەتی وەڕێکەوتنم بەپەلە قبوڵ بفەرمون. **١٢** حوت، ژمارە **١٩٦٧**، **سەردار محی.** (٢٩٠٠٠٤١٥٦).

## (٧٥)

### (لە وەزارەتی ناوخۆوە بۆ حکومەتی کوردستان، ١٧ رەبیعولسانی ١٣٣٣)
### وەزارەتی ناوخۆ، ژمارەی تۆماری نوسراو ٩٤٩، ١٧ رەبیعولئاخر ١٣٣٣.

حکومەتی پایە بەرزی کوردستان. تێلگرافی رەمزداری جەنابتان ژمارە ١٩٣٦، سەبارەت بە وروژانی خەڵك و ئەو هەوڵانەی دراون بۆ کۆکردنەوەی یارمەتی، سەرنج درا.[2] دیارە لەگەڵ رەئی تەواوی حکومەت لەمەڕ پاراستنی بێلایەنی، پێویستە کاربەدەستانی دەوڵەت تا ئەو جێگایەی دەتوانن ئەم مەبەستە جێبەجیَ بکەن و خۆیان لە کاروبارێك وەرنەدەن کە کێشەیان

١- نەخوێندرایەوە.

٢- بەڵگەنامەی ژمارە ٧٢.

بۆ دروست دەکات. لەمەڕ **فەریدودەولە** و ڕێگرتن لە هەوڵەکانی گفتوگۆ لەگەڵ وەزارەتی پەیوەندیداردا کراوە. (واژۆ).
(٢٩٠٠٠٥٧٩٠).

## (٧٦)

**(لە حکومەتی کوردستانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ١٩ ی ڕەبیع و لسانی ١٣٣٣)**

**بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، لە کوردستانەوە بۆ تاران، ژمارەی تێلگراف ٨٤، بەرواری ناردن ١٥، بەرواری گەیشتن ١٦ ی حوت ١٣٣٣.**

مەقامی پایە بەرزی وەزارەتی ناوخۆ، هەر شکۆدار بێ. هێشتا وەڵامی تێلگرافی ڕەمزداری ژمارە **١٩٧٨**ی بەندە نەدراوەتەوە. نەخۆشییەکەم بەردەوام خراپتر دەبێت، ئەگەر دوا بکەوێ ڕەنگە بۆ گەیشتنە هەمەدان توانای سواربوونی ولاغم نەمێنێ و لە کۆتاییدا ببمە زەحمەتێکی زۆر. چاوەڕوانی وەڵامی خێرا و مۆڵەتی وەڕێکەوتنم، ئەگینا ناچارم خۆم وەڕێکەوم. **١٥** ی حوت، ژمارە **١٩٩٤**، **سەردار محی**.
(٢٩٠٠٠٥٧٩٠).

## (٧٧)

**(لە حکومەتی کوردستانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ٢١ ی ڕەبیع و لسانی ١٣٣٣)**

**بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، لە کوردستانەوە بۆ تاران ، ژمارەی تێلگراف ٨٩ بەرواری ناردن ١٧، بەرواری گەیشتن ١٧ ی حوت ١٣٣٣.**

مەقامی پایە بەرزی وەزارەتی ناوخۆ، هەر شکۆدار بێ. سێ شەو لەمەو بەر کاتژمێر حەوت، کە بەندە لە تاو نەخۆشی و ئازاری پێم هێشتا نەخەوتبووم، لە بینایەکەی بەرامبەر ژووری نوستنی بەندە، کە شوێنی پاسەوانەکانی قۆزاق و جبەخانەکەیانە، تەقەی تفەگ هات، بەهەر بەزەحمەتێك بوو ویستم خۆم بگەیەنمە نزیك پاسەوانەکانی قۆزاق و چەند فیشەکی تریشیان تەقاند، پاسەوانەکە وتی منی وەك تارمایی بینیوە و هەرچەند هاوارم کرد وەڵامی نەدایەوە. بە ئاسانی فیشەکێکی تێگرتم و لە کڵاوەکەمی دا، منیش چەند فیشەکێکم پێوەنا. **یەکەم** شەوانە بە وردی خەریکی گەڕان و پشکنینم، تا

بزانم شوێنێك هەیە بکرێ لێیەوە بچنە ناو دارلحکومە، یا ڕێگەی دەرباز بوون بێ، نەبوو. **دووەم** شوێنی فیشەکی کلاوەکە درێژ بوو، ئەگەر ئەو قۆزاقە نەکوژرابا، لانی کەم بریندار دەبوو، بەم حاڵەشەوە دوو ڕۆژ خەریکی لێکۆلینەوە بووین، سەرچاوەی ڕووداوەکەمان دەسنەکەوت. ئیتر ئەم تەقە کردنە بۆ چی بووە و پاشکۆکەی بەکوێ دەگات نازانم. ئەوەندەش تەنیا لە بەر ڕاگەیاندن بوو بە خزمەتی موبارەکتان. **١٧** ی حوت، ژمارە **٢٠٠٧**.

**سەردار محی.**

(٢٩٠٠٠٣٥٨٠)

## (٧٨)

**(لە وەزارەتی ناوخۆی حکومەتی کوردستان، ٢٢ ی رەبیع و لسانی ١٣٣٣)**

**وەزارەتی ناوخۆ، ژمارەی ٩٦٧، بەرواری ٢٢ ی ربیع ولئاخر ١٣٣٣**

حکومەتی کوردستان، تێلگرافی رەمزداری جەنابتان بە ژمارەی **١٩٩٤** سەرنج درا[١] . لەبەرئەوەی حەزرەتی ئەشرەف جەنابی سەرۆك وەزیران، چەند رۆژێکە لە خزمەت سەفەری همایونی دا تەشریف دەبەن بۆ جاجرود، کەمێك چاوەڕوان بکەن تا تەشریف دێنن و وەڵامی یەکجارەکی دەدرێتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا لەم کاتەدا چاوەڕوانی ئەم شتانەم نەدەکرد، وەلێ دیسان بە هەڵویستی حەزرەتی ئەشرەف سەرۆك وەزیرانەوە بەستراوەتەوە. (واژۆ)　　(٢٩٠٠٠٤١٥٦)

## (٧٩)

**(لە وەزارەتی ناوخۆوە بۆ حکومەتی کرماشان، ٢٤ ی رەبیع و لسانی ١٣٣٣)**

**وەزترەتی ناوخۆ، ژمارە ٩٩٧، بەرواری ٢٠ ی حوت ١٣٣٣**

حکومەتی پایە بەرزی کرماشان. وەزیر موختاری ئەڵمان و نەمسا، لە ڕێگەی بەغداوە وەرێکەوتوون و دێن بۆ ناو ئێران، بفەرموون لە رووی ڕێزگرتن و ئاسانکاری هاتوچۆیان، بایەخی پێویستیان پێ بدەن و پارێزگارییان بکەن و چەند سواریان پێویست بوو لە گەڵیان

---

١ - بەڵگەنامەی ژمارە ٧٦.

بنێرن، تا بە ڕێزەوە لە کرماشانەوە تێپەڕن. پێشتریش لەم بارەوە ڕێ و شوێنتان بۆ دیاری کردبووین و ئێستاش-[1] زەحمەتتان دەدەین کە دەبێ زۆر چاودێری دابین کردنی ئاسایشی ئەوانە بن. ڕاستترە ڕەمزدار بکرێ. (٢٩٠٠٠٢٩٣٣)

(٨٠)

**(ڕاپۆرتی کارگێڕی خانەقین، ٢٤ ی ڕەبیع ولسانی ١٣٣٣)[2]**

**وەزارەتی کاروباری دەرەوە، بەڕێوەبەرایەتی نوسراوەکانی عوسمانی، درێژەی ڕاپۆرتی کارگێڕی خا نەقین بۆ کارگێڕی کرماشان، بەرواری ٢٤ ربیع و لسانی ١٣٣٣، ژمارە ٩٢٨.**

دەسنووسی موبارەکتانمان زیارەت کرد، لەبەرئەوەی بە تێلگراف وەڵامەکەمان داوەتەوە خزمەتتان، ئیتر زاتی دووبارەکردنەوەی ناکەین، وەلێ تەنیا بۆ ئاگاداریتان بە خزمەتتان ڕادەگەیەنین، کە دوێنێ نزیکەی سەد پۆلیس چوونەتە ناو خانەقین و، بەپێی هەواڵێکی ڕاست، **مصطفی پاشا** کە یەکێکە لە پیاوماقوڵانی **خانەقین**، چەند ڕۆژ پێشتر چووە بۆ **مەندەلیج**، لەگەڵ **فەوزی ئەفەندی** کۆمیساری پۆلیس، سێ ڕۆژە ڕۆیشتوون بۆ کەڵهوڕ، بۆ لای **سلێمان خان سەردار نصرەت** و ئێستا لە کەڵهوڕن. وەلێ هێشتا هیچ زانیارییەکم لە بارەی گفتوگۆ و نیازەکانی ئەوان ئامادە نەکردووە. شتیکی ترم نییە بە خزمەتتانی ڕابگەیەنم. لەگەڵ دەقە سەرەکییەکەدا یەکن.

(ک٩/٤٠٧٥)

---

١- نەخوێندرایەوە.

٢- وەزارەتی کاروباری دەرەوە لە نامەی ژمارە٥٦٥٦/١٩٣ بەرواری ٣ی جەمادی ئەلسانی ١٣٣٣ ئەو ڕاپۆرتانەی خوارەوەی (بەڵگەنامەی ژمارە ٨٠ و ٨٥)ی بۆ وەزارەتی ناوخۆ ناردووە ٠ک١١/٤٠٧٥).

## (٨١)

**(راپۆرتی تێلگرافیی قەسری شیرین، ٢٥ رەبیع ولسانی ١٣٣٣)**

**بەرێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، لە قەسری شیرینەوە، بەرواری گەیشتن ٢٢حوت (٢٦ی رەبیع و لسانی) ١٣٣٣.**

راپۆرتی قەسر . ٢١ ی حوت. دوێنێ چوار کاتژمێری رۆژ مابوو، نزیکەی سەت سوار لە **عەشیرەتی دەلوی عوسمانی**، تەنیا بۆ خراپکاری هێرشیان کردۆتە سەر ئاوای **عەلی سەفەر**، کە دوو فرسەخ و نیو لە قەسر دوورە. تالآنیان کردووە و سوتاندویانە و دوو مێگەل مەڕیشیان بردووە. هەواڵ **بە سالار موقتەدر** نەوەی صمصام ولمەمالك گەیشتووە، لە گەڵ چەند سوارێك کەوتۆتە رێ و دەگاتە سەریان و، لە پێکدادانێك دا پیاوێکی **سالار موقتەدر** کوژراوە لەگەڵ دووکەسی ناو دێیەکە. تالآنییەکەیان لەگەڵ چەند تفەنگی پێنج تیری ئەڵمانی و شتی تر و چەند ئەسپیان لێ ستاندوونەتەوە. لە عوسمانییەکانیش سێ چوار کەس کوژراو و بریندار بوون و بەرە و شوێنی نیشتەجێی خۆیان هەڵاتوون. ئێوارەی دوێنێ شەو، سالار موقتەدر لەگەڵ سوارەکانی دەگەڕێتەوە بۆ **قەڵاسەوزە**. ئێستا کە دوای نیوەرۆی هەینییە، عوسمانییەکان دیسانەوە لە **چەشم شیر** کە لەسەر سنوورە شەڕیان لەگەڵ سالار موقتەدر دەسپێکردۆتەوە. **سەردار ناصریش** بە سوارییی، خۆی بە سالار موقتەدر گەیاندووە، وەلێ **صمصام و لمەمالك** بۆ **سەردار ناصری** نووسیوە، کە تا بۆی دەکرێ لەوە زیاتر پەرە بە ئاگری شەڕ نەدا و بە رێکوپێکی پێشیان پێبگرێ و بەرگری بکات. **عەلی ئەشرەف.**

(ك٤٠٥٤/٧)

## (٨٢)

**(له حكومەتی كوردستانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ٢٤ ی رەبیع و لسانی ١٣٣٣)**

**بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، لە كوردستانەوە بۆ تاران ، ژمارەی تێلگراف ١٠١ بەرواری ناردن ٢٠، بەرواری گەیشتن ٢٠ ی حوت ١٣٣٣.**

مەقامی پایە بەرزی وەزارەتی ناوخۆ، هەر شكۆدار بێ. تێلگرافی رەمزداری ژمارە ٩٦٧ مان زیارەت كرد[١]، كە فەرمووتانە ئەو چاوەڕوانییەتان لە بەندە نەدەكرد-[٢] حەزرەتی موبارەكتان شكۆی هەر بەردەوام بێ، دەزانن و ئومێدەوارم ئینشائەڵڵا لە ئەنجامدانی ئەركەكانم و رەزامەندی موبارەكتان و كاربەدەستانی باڵای دەوڵەتی هەرگیز درێغی و داوای نابەجێ نەكەم، بەڵام بە داخەوە نەخۆشییەكەم ئەوەندە لێ پیس بووە كە توانای خزمەت كردنی لێبڕیوم و جێگای مەترسییە، بەم حاڵەشەوە ئەم فەرمانەی موبارەكتان بەجێ دەگەیەنم و تا تەشریف هێنانی حەزرەتی ئەشرەف جەنابی سەرۆك وەزیران، خۆم لە بەرامبەر نەخۆشییەكە رادەگرم. بەڵام ئەوندە تكایەم هەیە كە زووتر مۆڵەتم پێبدەن، چونكە نەخۆشییەكە رەنگە لە هەفتەی داهاتوودا ناچارم بكات وەڕی كەوم. **٢٠** ی حوت، ژمارە **٢٠١٧**، **سەردار محی**.

(٢٩٠٠٠٤٥١٦).

## (٨٣)

**(له حكومەتی كوردستانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ٢٥ ی رەبیع و لسانی ١٣٣٣)**

**بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، لە كوردستانەوە بۆ تاران ، ژمارەی تێلگراف ١٠٨، بەرواری ناردن ٢٨، بەرواری گەیشتن شەوی ٢٢ ی حوت ١٣٣٣.**

مەقامی پایە بەرزی وەزارەتی ناوخۆ، هەر شكۆدار بێ. ئەمڕۆ ئیفتخار دیوانی سەقزی نووسراوێك دەنووسێ، كە عوسمانییەكان منیان بۆ حكومەتی **سەقز** داناوە و ئێستا خەریكی رێك و پێك كردنی نەزم و ئاسایشم و بە سەفارەتم راگەیاندووە كە دەبێ فەرمانەكەی لە

---

١- بەڵگەنامەی ژمارە ٧٨.

٢- نەخوێندرایەوە وێدەچێ (عذر) بێ.

ناوەندەوە دەربچێ و بینێرن و، بە پێی راپۆرتی گەیشتوو دەستدرێژی و خراپکاری خۆیان خستۆتە ئەستۆی خەڵك، لەبەر ئەوەی سبەینێ حکومەتی ئەوێ دەخەمە گەڕ، بفەرموون لە سەفارەتی گەورەوە رێ و شوێنی پێویست بۆ بەرپرسی سوپای ئەو ناوچەیە و شابەندەرخانە کوردستان دابنرێ و خێرا **ئیفتیخار دیوان** دەربکەن. ئێستا کە ئەو سنوورەیان کردۆتە گۆڕەپانی جەنگ، لانی کەم با دەست لە کاروباری وڵات وەرنەدەن. چاوەڕوانی وەڵامی بەپەلەم.
٢١ ی حوت، ژمارە **٢٠٣٢**، **سەردار محی**.
(٢٩٠٠٠٥٧٩٣).

(٨٤)

**(لە حکومەتی کوردستانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ٢٦ ی رەبیع و لسانی ١٣٣٣)**

**بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، لە کوردستانەوە بۆ تاران، ژمارەی تێلگراف ١٠٩ بەرواری ناردن ٢٢، بەرواری گەیشتن ٢٣ ی حوت ١٣٣٣.**

مەقامی پایە بەرزی وەزارەتی ناوخۆ، هەر شکۆدار بێ. لە بەدواداچوونی تێلگرافی رەمزداری ژمارە ٢٠٣٢ دا، بە خزمەتتان رادەگەیەنم گۆڕینی شابەندەرخانە سەقز، کە بە بەخشینی پارە بە کەسانی خراپکار و قاچاغ ئەو پلەیەی وەدەست هێناوە، بە بێ دەستێوەردانی **ئیفتخار دیوان** و تێکڕای کاربەدەستەکانی عوسمانی لە کارو باری حکومەتی، یەکسەر داوا لە سەفارەتی گەورە بکەن کە لەم بارەیەوە رێنوێنی بدەن بە کاربەدەستانی پەیوەندیدار، چونکە بارودۆخی ئێستا و کردەوەکانی وەکیلی شابەندەر دەبێتە هۆی گەندەڵییەکی زۆر گەورە. **٢٢**ی حوت، ژمارە **٢٠٥٤**، **سەردار محی**.
(٢٩٠٠٠٥٧٩٣).

## (٨٥)

**(راپۆرتی کارگێڕی کرماشان، ٢٧ ڕەبیع و لسانی ١٣٣٣)**

**وەزارەتی کاروباری دەرەوە، بەڕێوەبەرایەتی نوسراوەکانی عوسمانی، درێژەی راپۆرتی کارگێڕی کرماشان، بەرواری ٢٧ ربیع و لسانی١٣٣٣،ژمارە ٢٠٢٤.**

دوێنی دەمەو ئێوارە، هەواڵ گەیشتە کارگێڕی، کە کارگوزارێکی شابەندەرخانە عوسمانی کاتێك بەبەردەم کونسولگەری رووسدا تێپەڕ دەبێ، چێشت لێنەری کونسولگەری بە سەرخۆشی بە هەموو هێزی خۆی بەردێکی چەند **سیر**[1] قورس دەکێشێ بە شانی دا و زیانێکی زۆری پێدەگەیەنێ, کارگوزاری شابەندەرخانە بە هات و هاوار دەڕواتە شابەندەرخانە و سەربازەکانی شابەندەریش بۆ تۆڵە سەندنەوە بەرەو کونسولخانە هێرش دەبەن. لەبەرئەوەی کونسولگەری و شابەندەرخانە لێك نزیکن و کارگێڕیش کەوتۆتە راستی کونسولخانەی ناوبراو، یەکسەر بۆ پێشگرتن لە ئاگری ئاژاوە بە جیدی کەوتینە کار و بەڵێنی سزادانی چێشت لێنەری کونسولخانەم دا بە شابەندەرخانە. دوای ئەوە کەفیلی کونسولگەریم ئاگادار کردەوە، چونکە کەفیلی کونسولگەری دانی نا بە تاوانکاری ئەودا و نیشانەی کونسولگەری لە کلاوەکەی کردەوە و بۆ سزادان ناردی بۆ کارگێڕی و کارگێڕیش دوێنی شەو ناوبراوی زیندانی کرد و شابەندەرخانە ئاگادار کردایەوە. سوپاس بۆ خوا هەرایەکە بە خۆشی کۆتایی هات. کارگێڕیی سوپاسی ئەم هەقناسییەی کونسولگەری رووسی کرد لە ناو ئێران. **مەعازد ولەمالك**. لەگەڵ دەقە سەرەکییەکەدا یەکن.

(ك٤٠٧٥/١٠)

---

١- یەکەی ئەندازە گیرییە کە بریتییە لە (١٦) مسقاڵ واتە نزیکەی (٥٦) گرام.

## (٨٦)

**(راپۆرتی حکومەتی کرماشان بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ٢٧ رەبیع و لسانی ١٣٣٣)**
**بەرێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، ژمارەی نووسراو ٢٥، لە سەرپوڵەوە بۆ تاران، ژمارەی تێلگراف ٥، بەرواری ٢٤ی (حوت)، ٢٥ ی حوتی ١٣٣٣.**

مەقامی پایە بەرزی وەزارەتی ناوخۆ. ئەمڕۆ بیست و هەشتەمی رەبیع و لسانی چووم بۆ سەرپوڵی زەهاو. دە رۆژ لەوێ دەمێنمەوە. سەبارەت بە سنوور بەزاندنی عەشیرەتی **دەلۆی عوسمانی** و کێشەیان لەگەڵ **سنجابی** کە پێشتر بە ژمارەی ١٠١[1] بە خزمەتتانم راگەیاند، هەرچەندە ئێستا هەردوو لایان بێدەنگن، وەلێ ئەمڕۆ تێلگرافێك لە دەبیر هومایۆن کارگێڕی خانەقینەوە گەیشتووە، کە قایمقامی ئەوێ داوای بەشێك لە میراتی تالآن کراوی کوژراوەکان دەکاتەوە و ئاماژەی بەوە کردووە ئەگەر ئەم پرسە چارەسەر نەکرێ دوور نییە بە هۆی ئەو عەشیرەت و سەربازانەی لە خانقین کۆبوونەتەوە ئاژاوە بنێنەوە. لەم لایەوە سنجابییەکانیش زوڵمیان کردووە، کە ئەوان دەسپێشخەر بوون و گوندی **چەشم سیر**یان سوتاندووە، مەڕوماڵاتیان بردوون و چەند کەسیشیان لێ کوشتوون وبریندار کردوون. هەرچۆنێك بێ لەم بارەیەوە هەنگاوی پێویست هەڵدەگرین و دەرئەنجامەکەی بە خزمەتتان رادەگەیەنم. بیست و هەشتەمی رەبیع و لسانی. ژمارە ١٠٦ **ئەمیر موفەخەم**.

(٥/٤٠٥٤)

١- لەم بەڵگەنامانەدا بەدی نەکرا، بەڵام دەتوانین بۆ ئەم مەبەستە سەرنج بدەینە بەڵگەنامەی ژمارە ٨١.

(٨٧)

**(ڕاپۆرتی کارگێڕی کرماشان، ٣٠ ڕەبیع و لسانی ١٣٣٣)**[١]

**وەزارەتی کاروباری دەرەوە، بەڕێوەبەرایەتی نووسراوەکانی عوسمانی، درێژەی تێلگرافی ڕەمزداری کرماشان، بەرواری ٣٠ ربیع و لسانی١٣٣٣، ژمارە ٨١٤.**

ئەو کێشەیەی بەم دواییانە لە نێوان عەشیرەتی **دەلۆ** و **سنجابییەکان**دا ڕوویداوە، کە درێژەکەی بە تیلگرافی ژمارە ٢٠١١ بەخزمەتتان گەیشتووە، بە پێی ڕاپۆرتێکی حکومەتی **قەسر**، زەرفێك لە سوارەیەکی کوژراوی بەجێماوی عوسمانی دەست سنجابییەکان کەوتووە، کە وەك خۆی ناردوویانە بۆ کرند پێش جەنابی **ئەمیر موفەخەم** و ئەویش بۆ کارگێڕی ناردووە. زەرفەکە دوو نوسراوی تورکی مۆرکراوی تێدایە. یەکێکیان شەش بڕگەیە و ئەویتریشیان نووسراوێکی کورتە بۆ شابەندەر و پشتیوانی شابەندەر دەکا لە جێبەجێکردنی ناوەرۆکەکەی، کورتەکەی لە ژێرەوە وەرگێڕدراوە بۆ فارسی:

لە **مەندلیج**[٢] **٢٣** ی شوبات بەرامبەر **٢٢** ی ڕەبیعولسانی **١٣٣٣** بۆ **کرماشان** شابەندەرخانە عوسمانی. **ماددەی یەکەم:** لەو کاغەزەی بە بەرواری **١٩** ی شوبات ناردبووم ڕوونم کردبۆوە کە کاروباری باشووری ئێران لە لایەن حکومەتی عوسمانییەوە خراوەتە ئەستۆی بەندە.

**ماددەی دووەم:** بەم پێیە لە کرماشان بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکانی دەوڵەتی سونی و لە ناوبردنی کاربەدەستانی ڕووس و ئینگلیز، کە بەپێچەوانەی جموجوڵ و بەرژەوەندییەکانی ئێمە دەستیان کردووە بە ساختەکاری و خراپە، یوزباشی **ئیسماعیل حەقی بەگ** وجێگرێك و جێگرێکی پزیشك لەگەڵ چل و دوو کەس بۆ ئەوێ نێردراون. ئەم پلەدارانە مافی فەرماندانیان هەیە بەو کەس و پلەدارانەی لەوێن (بۆ ڕیێدانی **حەقی بەگ** و لە پێشەنگی ڕێکخراوەکانی یەکییەتی ئیسلامی کە دروستی کردووە، پێکەوە هاوکاری **بەها بەگ**یان کرد).

---

١ - وێنەی ئەو بەڵگەنامانەی بەم نیشانەیە دیاری کراون، لە پاشکۆی ئەم بەڵگەنامانەدا چاپ کراوە.

٢- مەبەست شارۆچکەی مەندەلییە لە باشووری کوردستان.

**مادده‌ی سێهه‌م:** وه‌ده‌ست هێنانی گشت ئه‌و به‌رژه‌وه‌ندی و واسیتانه‌ی دوژمنان له کرماشان هه‌یانه. دامه‌زراندنی په‌یوه‌ندی تێلگرافی له‌گه‌ڵ خانقین، له ناوبردنی که‌سانی زیانبه‌خش و دابین کردنی فه‌زایه‌کی ئاسوود و گونجاو، له‌گه‌ڵ هه‌رشێوه‌یه‌کی لێپرسینه‌وه، ئه‌رکی ناوبراوه.

**مادده‌ی چواره‌م:** له به‌جێگه‌یاندن و جێبه‌جێکردنی مه‌به‌سته گرنگه‌کان که له‌سه‌ره‌وه باسکران، هه‌رچۆنێك بێت، به‌ڵێنی ئاسانکاری و یارمه‌تیدانیان داوه، ئه‌و ڕێ و شوێن و ته‌گبیرانه‌ی ناوبراو خستوونیه روو، ئه‌نجامدانیان ئاساییه و له ئه‌رك و پێویستییه‌کانی سه‌رشانی ئێوه‌ن. به گشتی پرسه‌که‌یان به گه‌وره سه‌فیری تاران راگه‌یاندووه. مادام بارودۆخه‌که به ته‌واوی له‌گه‌ڵ ئه‌من و ئاسایشدا نییه، وه‌ك باکووری ئێران په‌له و هه‌ڵه‌شه‌یی تێدا ناکه‌ین. له‌به‌رئه‌وه ئه‌م بابه‌ته به شێوه‌یه‌کی گونجاو بۆ سه‌فیر روون بکه‌نه‌وه.

**مادده‌ی پێنجه‌م:** چ بۆ چالاکی خۆتان چ بۆ ده‌سکه‌وت، به مه‌به‌ستی ئه‌و فیداکارییانه‌ی ئه‌نجامی ده‌ده‌ی، هیزه گه‌ڕۆکه‌کان پشتیوانتانن.

**مادده‌ی شه‌شه‌م:** ئه‌گه‌ر پێویست بێ پاره و پولی ئه‌و سه‌ربازانه‌ی له وێن-[1] بده‌وه که له شابه‌نده‌رخانه و دادگا قه‌رزیان کردووه، که هه‌مووی خۆم داومه. کۆمیسار ئه‌نجومه‌نی سه‌فه‌ری، **حوسێن ره‌ئوف** له مه‌ندلیجه‌وه **٢٣** شوبات ره‌بیع و لسانی **١٣٣٣**.

له کرماشان شابه‌نده‌رخانه هه‌واڵگری عوسمانی، بۆ دابین کردن و لایه‌نگیری به‌رژه‌وه‌ندییه‌کانی ده‌وڵه‌ت، له کاتی هه‌ر جموجوڵێکدا وه‌ئه‌ستۆ گرتووه و، یارمه‌تیدان و هاوکاری ئه‌و به‌ڕێزه پێویسته. له‌به‌رئه‌وه رێنوێنی ته‌واو پێشکه‌ش به جه‌نابتان ده‌که‌ین که له‌م رووه‌وه هه‌وڵی داوه و هیمه‌تی کردووه. سوپاسی نیشتمانپه‌روه‌ری ئه‌و به‌ڕێزه و پشتیوانی ئه‌و دۆستایه‌تییه‌ی ده‌که‌م. کۆمیساری هێزی گه‌ڕۆك **حوسێن ره‌ئوف**.

ئه‌سڵه‌که‌شی ئه‌مرۆ به پۆست به ژماره **٢٠٠٤٤** نارده خزمه‌تتان. **٢٩** ی ره‌بیعولسانی، ژماره ٢٠٥١ [2]، **مه‌عازید ولمولك**. (ك٤٠٥٤/٩و٢).

---

١- له‌و نامه‌یه‌دا که بۆ وه‌زاره‌تی ناوخۆ نێردراوه، نووسراوه سپییه (واته هیچ نه‌نووسراوه/ وه‌رگێڕ)، به‌ڵام لـه نامه‌که‌ی ترداکه له کتێبی سه‌وزدا بلاوکراوه‌ته‌وه (به‌ڵگه‌نامه‌ی ٢٩٧ و ١٢٩) (حاصلات) نووسراوه,

٢- دوا رسته- ئه‌صڵه‌که‌ی...ژماره ٢٠٥- له کتێبی سه‌وزدا نه‌هاتووه.

## (٨٨)

**(له حکومەتی کوردستانەوە  بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ٤ جەمادی یەکەم ١٣٣٣)**

**بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، لە سەرپوڵی زەهاو بۆ تاران ، ژمارەی تێلگراف ١٣ بەرواری ناردن ٢٩، بەرواری گەیشتن ٣٠ حەمل ١٣٣٣.**

مەقامی وەزارەتی پایە بەرزی ناوخۆ، تێلگرافی بەرێز، ژمارە **١٠٩** سەبارەت بە هاتنی وەزیرانی ئاڵمان و نەمسا بۆ ناو خاکی ئێران، هەرکاتێك گەیشتن لەبەر ئەوەی خۆم لە **سەرپوڵی زەهاوم**، لە وێوە تا سەر سنووری **قەسر** پێنج شەش قۆناغەرێ پتر نییە، لێرەوە بەوپەڕی رێزەوە پێشوازییان لێدەکەین و چەند سوارێکیش دەنێرم بچن بەرەو پیرییان، تا بەرێزەوە لە کرماشان تێبپەڕن. ئەگەر پێویست بکا رێزی لەوە باڵاتریان لێ بگیرێ، بە تێلگراف رێنوێنیمان بکەن تا بەو پێیە هەنگاو بنێین. **٤** ی جەمادی یەکەم، ژمارە **١٣٠**، **ئەمیر موفەخەم.**

(٢٩٠٠٠٢٩٣٣).

## (٨٩)

**(لەسەردار محی بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ٥ ی جەمادی یەکەم ١٣٣٣)**

**بەرێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، لە قروە بۆ تاران، ژمارەی تێلگراف ١٠، بەرواری ناردن یەکەم، بەرواری گەیشتن شەوی ٣ی حەمل ١٣٣٣.**

تاران، مەقامی پایە بەرزی وەزارەتی ناوخۆ، هەر شکۆدار بێ. دوای گەیشتنی تێلگرافی موبارەکتان و ئامادەکردنی ئامرازەکانی پاراستنی نەزمی ویلایەت، لە کاتی نەبوونی خۆمدا بە بەرپرسیاری جەنابی **موشیر دیوان**، بە حاڵەتێکی نەخۆشی لە رادەبەدەر وەرێکەوتم و ئەمڕۆ چوارەمین رۆژە گەیشتوومەتە **قروە**. ئینشائەڵلا سبەینێ بەرەو **هەمەدان** وەرێ دەکەوم.

ئەو زانیارییانەی دوای وەرێکەوتنی بەندە گەیشتوون: **موختار بەگ** بە بیست سوارەوە هاتۆتە کوردستان و هاوکاری **عەبدوڵلاخانی سەقزی** دەکا کە لە ئاژاوەچیانی ناودارە. لە کاتی

هاتنی بۆ ناو کوردستان بەندە دەسگیرم کرد و دوای چەند مانگ دوورم خستەوە. لەبەر ئەوەی ئەم پیاوە ئاژاوەگێڕ و فێڵبازە، دڵنیام بۆ مەبەستی خۆی خراپکارییەکی زۆر لە کوردستاندا ئەنجام دەدا، هەروەها کاغەزێکمان لە ماڵەکەیدا دۆزیوەتەوە بە دەسنووس و واژۆی خۆی کە بۆچەند کەسی نووسیوە، پێشتر لەگەڵ خۆیدا بوون، ناوەڕۆکی نووسراوەکە وەك خۆی بەخزمەتتان دەگەیەنم: بە ناونیشانی **سەفەر عەلی** و **ئیبراهیم عەبدولرەحمان**، بە گەیشتنی کاغەزەکە ئەوەندەی دەتوانن ئەسپ و تفەنگ و هەرچی دەستانکەوت بیهێنن و وەرن بۆ لای من و ئەگەر بکرێ سەردار **محی** بکوژن و راکەن، چوار هەزار تمەن پاداشتان بۆ وەردەگرم. **عەبدوڵلا کوردستانی**. ئەوە کاغەزەکەیە و وتەکانی **عەبدوڵلاخانم** لە روانگەی شەخسییەوە بە خزمەتان رانەگەیاندووە[1]، چونکە دوای لوتفی خوا، هەرگیز بایەخم بەم وتانە و ئەم جۆرە کەسانە نەداوە و دواتریش بایەخیان پێنادەم، وەلێ لە رووی دەوڵەتخوازیی و پاراستنی نەزمی کوردستان، پێویست بوو سەرنجی کاربەدەستانی باڵای دەوڵەت و بیروهۆشتان لەم کات و ساتەدا بۆ لای کوردستان رابکێشم، کە ئەوانە بەهۆی کەسانێکی ناسراوەوە، بە ئارەزووی چەند مانگەی خۆیان نەگەن، کە نانەوەی ئاژاوەیە لە کوردستان، پێویستە بە پەلە بۆ دوورخستنەوەی **عەبدوڵلاخان** هەنگاوی جیدی و خێرا بنرێ، تا خەڵکی بێچارەی کوردستان تووشی گرفتاری نەبن. شەوی یەکەمی حەمل، **سەردار محی**.

(٢٩٠٠٠٥٨٠)

---

١- لە دەقەکەدا (دەمگەیاند)ە.

(٩٠)

**(راپۆرتی سنوورپارێز، ٩ ی جەمادی یەکەم ١٣٣٣)**[1]

**وەزارەتی کاروباری دەرەوە، بەڕێوەبەرایەتی نووسراوەکانی عوسمانی، درێژەی راپۆرتی سنوورپارێزی زەهاو بۆ کارگێڕی کرماشان، ژمارەی تێلگراف، بەرواری ٩ ی جەمادی ١٣٣٣**

دوای گەیشتن بە خزمەتی موبارەکی ویلایەتی پایەبەرز، گەڕامەوە قەسری شیرین. لە بارەی کۆبوونەوەی عوسمانییەکان لە کانزای نەوت، لێکۆڵینەوەی پێویستم ئەنجام داوە. **مەحموود پاشای** سەرۆك تایفەی جافی مورادی، بە دووسەت سێسەت سواری عەشیرەتی جافی مورادییەوە، لەگەڵ تێکڕای سەربازەکانی سوپا و سوارەکانی عەشرەتەکانی خۆی و **باجەلان** و **شەرەفبەیانی** و **شیخ حەمید** و **جافەکانی گۆران**، کە نزیکەی هەزارو پێنسەت کەس دەبن، هاتوون بۆ ئەو شوێنە. ئێستا سێ تۆپی مەترالیۆزیان لە کانزای نەوت هەیە، هەروەها خەریکن تواناکانی خۆیان زیاد بکەن. گوایە بە هۆی باران بارینی بەردەوام و لافاوی ئاوی **سیروان**، هێشتا هێزەکانیان پێنەگەیشتووە. **حەسەن، سنوورپارێزی زەهاو**.

(ك١٢/٤٠٧٥).

---

١- وەزارەتی کاروباری دەرەوە لە نامەی ژمارە٥٦٥٤/١٩١ بەڕێوەبەرایەتی نووسراوەکانی عوسمانی بەرواری ٣ ی جەمادی ئەلسانی ١٣٣٣ ئەو راپۆرتانەی خوارەوەی... (بۆ ئاگاداری تەواوی بەرپرسانی ئەو وەزارەتە پایە بەرزە سەبارەت بە بارارودۆخی سنووری ...) ناردووە (١٣/٤٠٧٥).

## (٩١)

**(راپۆرتی حکومەتی کرماشان، ١١ جەمادی یەکەم ١٣٣٣)**[1]

**وەزارەتی ناوخۆ، درێژەی تێلگرافی رەمزداری حکومەتی کرماشان، ژمارە ٨، بەرواری١١ ی جەمادی یەکەم.**

مەقامی وەزارەتی پایە بەرزی ناوخۆ. لە بەدواداچوونی ئەو تێلگرافە رەمزدارەی سەبارەت بە ناکۆکی نێوان تایفەی **دەلۆی عوسمانی** و **سنجابی** و ئەو کۆمەڵە عوسمانییەی لە کانزای نەوتی **قۆرەتوون**، بە پێویستی دەزانم بە خزمەتانی رابگەیەنم، کە لەو رووەو هیچ رێنوێنییەك بە بەندە نەگەیشتووە تا لێرە هێزو توانامان پێببەخشێت، لە لایەکی ترەوە پرۆپاگەندەچی و جارچییەکانیان لە عەشیرەتەکاندا خەریکی هاندانی خەڵکن. هەرچەندە حەز لە خۆهەڵکێشان ناکەم، وەلێ هەر ئەوەندە بەکورتی دەڵێم ئەگەر نەهاتبام بۆ سەر سنوور، ئێستا ئەم سەر سنوورەیان کردبۆ پاشکۆی تەورێز و عەربستان. مەبەست ئەوەیە کە بەگشتی لەگەڵ سەفارەتی عوسمانی هەوڵێك بدەن تا دڵنیا بن، لوتف بفەرموون بە پەلە پارەو هێز و پێداویستی بۆ بەندە بنێرن، چونکە بە بێ پێداویستی زەحمەتە لە کاروبارەکانمدا پێشکەوتن بەدەیت بێنم. چاوەڕێی رێنوێنی بەپەلە و گەیاندنی پێداویستییەکانی کارم. **٧** جەمادی یەکەم، ژمارە**١٣٥**، **ئەمیر موفەخەم.**

(ك٤٠٥٤/٨).

---

١- وەزارەتی ناوخۆ لە نامەی ژمارە٥١/٥٢٠ بەرواری ١٤ ی جمادی یەکەم ١٣٣٣ درێژەی راپۆرتی ژێرەوەی بۆ وەزارەتی دەروە نارد. (ك٤٠٥٤/١)

## (٩٢)

**(له وەزارەتی دەرەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ١٥ ی جەمادی یەکەم ١٣٣٣)**

**وەزارەتی کاروباری دەرەوە، بەرێوەبەرایەتی رووس، بەرواری ١٥ ی مانگی جەمادی یەکەم ١٣٣٣،ژمارە١٦٧٢/٥٣٢٦.**

وەزارەتی پایە بەرزی ناوخۆ، لە سەفارەتی رووسیاوە، لەپاڵ ئەو نووسراوەی بە وەزارەت دەرەوە گەیشتووە، نووسیویانە ئەڵمانییەکان بڕی چل هەزار تفەنگیان، لە ڕێگەی کرماشان و کوردستانەوە هێناوە بۆ ئێران تا بەسەر ویلایەتەکاندا دابەشی بکەن. لەبەر گرنگی ئەم پرسە، تکایە لە راست و دروستی ئەم هەواڵە بکۆڵنەوە، ئایا هیچ زانیارییەك بەو وەزارەتە پایەبەرزە گەیشووە؟ ئەگەر راست بێت بۆ رێگرتن لە دەرئەنجامە خراپەکانی چیبکەین باشە؟. ئایا کاربەدەستانی حکومەتی و سنوورپارێزی کرماشان کە رێگەیان بەم کارە داوە بەرپرسیار دەبن یان نا؟ تکام وایە ئەو شتانە تۆمار بکرێن کە لەو زانیارە وەدەست هاتووان و وەڵامی پێویست بدەنەوە. (مۆری) وەزارەتی دەرەوە. (ك٤٣٣٨).

لە پەراوێز نووسراوە: بە نهێنی لێکۆڵینەوە لە حکومەتی کرماشان بکرێت.

## (٩٣)

**(لە وەزارەتی دەرەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ١٨ ی جەمادی یەکەمی ١٣٣٣)**

**وەزارەتی کاروباری دەرەوە، وڵاتانی نادراوسێ، بەرواری ١٨ ی جەمادی یەکەمی ١٣٣٣، ژمارە ١٦٧/٥٣٧١، بەپەلە.**

وەزارەتی ناوخۆی پایەبەرز، وەك بە وەزارەتی کاروباری دەرەوە گەیشتووە، لە نێوان ئەو سوارانەی **مسیۆ شونمانی** ئەڵمانی لە کرماشان بە کرێی گرتوون، لەگەڵ **مامانۆف** پاسەوانی قۆزاقخانە و قۆزاقە ئێرانییەکان، دەمەقاڵێیەکی توند هاتۆتە ئاراوە و ئەو وەزارەتخانەیە بۆ رێگرتن لەو جموجوڵانە و رەفتاری نابەجێی شونمان و سوارەکانی، هەوڵی پێویستی داوە و

بەدوای پرسەکەوەیە، وەلێ لەبەر ئەوەی کارگێڕی لە لایەن **مامانۆفەوە** ئاگادار کراوە، کە هەرکەسێك لە ناو شار چەك هەڵبگرێ، چەك دەکرێ، کارەکەی زەحمەت کردووە. لەلایەن ئەو وەزارەتە پایەبەرزەوە فەرمان بە کاربەدەستانی ناوچەکە بدرێ، کە وریا و بە پارێز بن، تا کردەوەیەکی چاوەڕوان نەکراو روونەدات. (مۆر) وەزارەتی پایە بەرزی کاروباری دەرەوە.

(لە پەراوێزەکەیدا نووسراوە)[1] بەپەلە بە حکومەتی کوردستان رابگەیەنرێ، کە زۆر بایەخ بە پاراستنی نەزم و ئاسایشی شار بدات و تێلگراف بۆ **ئەمیر موفەخەم** بکرێ لەم بارودۆخەدا زووتر کارەکانی سنوورپارێزی تەواو بکات و بێت بۆ ناوەندی فەرمانڕەوایی.

(ك٢/٨٦٨).

## (٩٤)

**(وەزارەت ناوخۆ بۆ حکومەتی هەمەدان، ١٩ ی جەمادی یەکەمی ١٣٣٣)**

**وەزارەتی ناوخۆ ژمارە ١١٢، بەرواری ١٩ ی جەمادی یەکەمی ١٣٣٣.**

حکومەتی پایە بەرزی هەمەدان، بە پێی ئەو زانیارییەی گەیشتووە، بەرپرسی دارۆغای ئەوێ بێ لایەنی دەوڵەت لەبەر چاو ناگرێت، چار چییە؟. راستی و دروستی ئەم راپۆرتە زووتر بە تێلگراف بنێرن. (واژۆ)

(٢٩٠٠٠٣٥٧٥).

---

١ - ئەم جۆرە روونکردنەوانە لە وەزارەتی ناوخۆوەیە، مەگەر باسی بابەتەکانی تر بکرێ.

## (٩٥)

**(راپۆرتی حکومەتی کرماشان، ٢٤ ی جەمادی یەکەمی ١٣٣٣)**

**بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، لە سەرپوڵی زەهاو بۆ تاران، ژمارەی تێلگراف ٥٣، بەرواری ٢٠ حەمل/٢٤ جەمادی یەکەم، بەرواری گەیشتن ٢١ ی حەمل ١٣٣٣.**

لەلایەن جەنابی فەزڵوڵڵاخان. مەقامی پایە بەرزی وەزارەتی ناوخۆ، لەبەرئەوەی داوای زارەکی دەوڵەتی پایە بەرزی عوسمانی، سەبارەت بە چارەسەری پرسەکانی سنوور ئەوەبوو، کە کەسێك بنێرین بۆ قەسر تادیدار و گفتوکۆی رووبەروو بکات، دوێنێش وەزیرموختارانی دەوڵەتی شکۆمەندی ئەڵمان و نەمسا لە ئوردووی سەرپوڵی زەهاو بوون، ئەم پرسەیان پشت راستکردەوە. لەبەرئەوە جەنابی **موختار ولسەڵتەنە** سەرکردەی لەشکرم نارد بۆ قەسر، کە لە خاڵێکی نێوان قەسر و خانەقین، لەگەڵ کاربەدەستانی دەوڵەت عوسمانی دیدارێکی دۆستانە و گفتوگۆ بکات، بەڵکو خوابکا ئەم پرسانە چارەسەر بکرێن. ئەنجامەکەی بەهەر کویێ بگات بە خزمەتتانی رادەگەیەنم، لەبەرئەوەی ناردنی جەنابی موختار و لسەڵتەنە پێویست بوو، ئەگەر لەسەر رێپێدانی وەزارەتی جەنگ وەستابایین، دەرفەتەکەمان لەدەست دەچوو، لەبەر ئەوە تکام وایە بابەتەکە باس مەکەن و وەزارەتی پایە بەرزی جەنگ ئاگادار بکەنەوە بەفەرمی بە تیلگراف مۆڵەتی گفتوگۆکردن بۆ جەنابی **موختارولسەڵتەنە** دەربکات. **٢٤** ی جەمادی یەکەم، ژمارە **٢٠٥**، **ئەمیر موفەخەم**.

(ك٠٨٠٤/٢).

## (٩٦)

**(راپۆرتی بەڕێوەبەرایەتی گومرگی کرماشان، ٢٤ جەمادی یەکەمی ١٣٣٣)**[١]

**وەزارەتی دارایی بەڕێوەری کابینە، درێژەی راپۆرتی بەڕێوەبەرایەتی گومرگی کرماشان، بەرواری ٢٤ ی جەمادی یەکەمی ١٣٣٣، ژمارە ١٣٦٣.**

لە وەڵامی تێلگرافی ژمارە ٥٤١٥ ی ئێوەدا، پێتان رادەگەیەنم بە ئاشکرا و بەفەرمی بابەتێك تۆمار نەکراوە و هیچ شتێك دەستی بەسەردا نەگیراوە. وەلێ لەم بارەیەوە هیچ گومانی تێدا نییە کە ئەڵمانییەکانی دانیشتووی کرماشان، بێ پسانەوە چەکوچۆل[٢] و پێداویستی، لە خاکی کەڵهوڕەوە دێننە ناوەوە و رۆژانە دانیشتوانی ناوچە و عەشیرەتەکان هاندەدەن، واز لە بێ لایەنی بێنن. ئاشکرایە کە هەوڵ دەدەن ئامادەکاری بۆ هاتنی نهێنی سەربازەکانی عوسمانی بکەن. ئەگەر لەلایەن دەوڵەتەوە هەوڵێکی چڕ دژی هاندەران نەدرێت، مەترسی ئەوە هەیە رۆژ بە رۆژ بارودۆخەکە خراپتر بێت و یاخی بوون و هەڵگەڕانەوەی گەورە رووبدات. واژۆی (دۆرت)

(مۆر) ی کابینەی وەزارەتی درارایی.

لەگەڵ دەقە سەرەکییەکەدا یەکن.

(ك٤٣٣٨).

---

١- وەزارەتی دارایی لە نامەی ژمارە ١٢٥٩٤ دا بەرواری ٢١ حەمل/٢٥ جەمادی یەکەم ١٣٣٣ درێژەی ئەم راپۆرتە نێردراوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ و راگەیاندراوە، کە ئەم راپۆرتە وەڵامی ئاگادارییەکە کە دوای وەرگرتنی نامەی سەفارەتی رووس دراوەتەوە. سەفارەتی رووس لەرێگەی وەزارەتی کاروباری دەرەوە (... لەبارەی ئەو چل هەزار تفەنگەی ئەڵمانییەکان بە خاکی کرماشاندا هێناویانەتە ناوەوە داوای روونکردنەوەمان لە وەزارەتی دارایی کرد...) کردبوو٤٣٣٨٠/بۆ ئاگاداری لەو نامە هاوشێوەیە کە وەزارەتی دەرەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆی ناردووە. ر. ك بەڵگەی ژمارە ٩٢.

٢ - لە دەقە سەرەکییەکەدا نووسراوە اصلحە.

## (٩٧)

## (راپۆرتی کارگێڕی کرماشان، ٢٩ ی جەمادی یەکەمی ١٣٣٣)[١]

**وەزارەتی کاروباری دەرەوە، بەڕێوەبەرایەتی نووسراوەکانی وڵاتانی نادراوسێ، درێژەی راپۆرتی کارگێڕی کرماشان، بەرواری ٢٩ ی جەمادی یەکەمی ١٣٣٣، ژمارە ١٧١.**

وەك بە تێلگراف بە خزمەتتان راگەیەندرا، جەنابی وەزیر موختاری ئەڵمان و نەمسا، دوێنی رۆژی سێ شەممە دوای نیوەڕۆی **٢٦** ئەم مانگە هاتنە ناو کرماشان. لە لایەن کارگێڕی و حکومەتەوە هەم گالیسکەیەکی سێ ئەسپی و چل سوار کە بەزەحمەت جل و بەرگیان بۆ دابین کرابوو، تا یەك فرسەخی نێردران بۆ پێشوازی ئەو بەڕێزانە. بەڵام لە سەر داوای دۆستانەی شابەندەر و **مسیۆ شونمان**، لەلایەن خەڵکەوە ژمارەیەکی زۆر سوارە و پیادە تا نیو فرسەخی شار بۆ پێشوازی رۆیشتبوون. ژمارەیەکی زۆریش لەو سوارە نوێیانەی **مسیۆ شونمان**، کە بە شێوەی فەخری و نافەخری دایمەزراندبوون تا یەك فرسەخی دەرەوەی شار رۆیشتبوون. شابەندەرخانە عوسمانیش بەخۆی و هەموو لایەنگرانی عوسمانییەوە پێشوازیان لێکردن. لەبەرئەوەی لەم چەند رۆژەدا شابەندەر زۆر پێی داگرت بەندە بچم بۆ پێشوازی و جگە لەوەش تێلگرافی رەمزدار ژمارە **٢٠٢**[٢] هانیدام هەزار هەنگاوێك تا دەرەوەی شار بەرەو پیریان بچم. چونکە وا وێنا دەکرا ئەگەر نەچم، ساردییەك بێتە ئاراوە و لەگەڵ وەزیرانی موختار ئامانجی پێویست دەستەبەر نەکەین. لە کۆتاییدا بەم شێوەیە وەزیرانی موختار هاتنە ناو شار.

---

١- وەزارەتی کاروباری دەرەوە بە پێی نامەی ژمارە ٥٧٥٢/٢٤٩ بەرواری ١١ جەمادی ئەلسانی ١٣٣٣ ئەم نامەیەی خوارەوەی بۆ وەزارەتی ناوخۆ نارد. لەم نامەیەدا هاتووە کە (...وەزارەتی کاروباری دەرەوە سەبارەت بەم کردەوەیەی شونمان کە هەرهەنگاوێك کە واجب بووە ناوییەتی. رێگرتن لە خەڵك و پێش گرتن بەم جۆرە کردەوانە لە ئەرکەکانی وەزارەتی پایە بەرزی ناوخۆیە کە ئێستا ئاگادار و چاودێرە تا فەرمانی تایبەت لەم بارەیەوە دەربکەن).

لە پەراوێزی ئەم نامەیە لە لایەن وەزارەتی ناوخۆوە نووسراوە: (ئیدارە) ی رۆژئاوا، تێلگرافی رەمزی تایبەت بە حکومەتی کرماشان دەربکرێ. (ك٦/٤٣٤٤).

٢ - لەم کۆمەڵە بەڵگە نامەیەدا بەدی نەکرا.

لەگەڵ چوونمدا ئەو دوو بەڕێزانەم بینی و، نزیکەی نیو کاتژمێر بە تەنیا لەگەڵ جەنابی وەزیر موختاری ئەڵمان بە ئامادەبوونی وەزیر موختاری نەمسا دانیشتم، بە هۆی وەرگێڕیی **مسیۆ لیتین** کونسوڵی تەورێز، ناوەڕۆکی تێلگرافی موبارەکتانم لەگەڵ کردەوەکانی ئەم چەند ڕۆژەی عوسمانییەکان لە قەسر و زیانەکانی بەکرێگرتنی سەربازی سوارە لەلایەن مسیۆ شونمانەوە، بە ناوبراو ڕاگەیاند. لە بەشی یەکەمدا کە تایبەت بوو بە دەسدرێژی عوسمانییەکان تەواو بێ دەنگ بوو، وێدەچوو لە جموجوڵی عوسمانییەکان لەسەر سنوور خۆشحاڵ نەبێت، یا وەڵامێکی پێ نەبێ. لە کۆتاییدا بەندە تکام کرد کە داوای وەزارەتی مەزنی خۆمان لە بەرێزیان ئەوەیە بە هۆی سەفارەتی گەورەی ئیمپراتۆری نیشتەجێ لە بابی عالی، مەترسی فەرمانبەرانی عوسمانی لە سنووری ڕۆژئاوا بە دەرباری ئەسلامبوڵ بگەیەنێ، تا ڕێگە نەدا کاربەدەستانی بەغدا ئەم دەسدرێژییانە ئەنجام بدەن. سەرەتا فەرمووی بە هۆی پچڕانی سیمی پەیوەندی قەسر، ناکرێ لێرەوە تێلگراف بکرێ. پێمان وتن تێلگرافەکە لە تێلگرافخانەوە بنێرن. لەلایەن کارگێڕییەوە تێلگراف دەکەن بۆ جەنابی ئەمیر موفەخەم، کە بەهۆی نامەبەر یەکسەر تێلگرافەکە لە زەهاوەوە بگەیەننە خانەقین، تا لەوێوە بە تێلگراف بگەیەنرێ. فەرمویان تێلگراف بۆ سەفارەتی تاران دەکەم، کە بە ڕەمز بابیعالی ئاگادار بکەنەوە. لەو کاتەدا مسیۆ شونمان گەیشت، چەند خولەکێك بە زمانی ئەڵمانی لەگەڵ ناوبراو گفتگۆی کرد و دواتر بە بەندەی ڕاگەیاند هەرچی لەم بارەیەوە پێویست بێ بە تێلگراف بە سەفارەتی تاران و ئەسلامبوڵی ڕادەگەیەنم.

دوای ئەوەی ڕاپۆرتی تەواوی سەبارەت بە سوارە بەکرێگرتنی مسیۆ شونمانی بیست، فەرمووی وتەکانی تۆ بە تەواوی پێچەوانەی وتەکانی جەنابی موفەخەمە، چونکە ناوبراو وتوویەتی قۆزاقەکانی ئێران لە کرماشانن، **مسیۆ شونمان** بۆ پارێزگاری خۆی، پێویستی بەو چەند سوارەیە. هەرچەند لەلایەن کارگێڕییەوە داکۆکی کرا وەلێ بێ ئاکام بوو. تەنیا ئەوە نەبێ، ئەو دوو کەسەی ڕەفتارە ناشیرینەکەیان ئەنجا دابوو و مسیۆ شونمان نیشانی سەفارەتی لە کڵاوەکەیان کردبۆوە، هەردووکیانی لە کارەکەیان دەرکرد. لەبەرئەوەی یەکێکیان خراپکارێکی ناوداری شاربوو، لە ترسان ڕایکرد. ئەمڕۆش بیستمان چەند کەسێکی تریشیان دەرکردووە، وەلێ هێشتا ڕاستی و دروستی ئەم کارە بۆ کارگێڕی ئاشکرا نەبووە.

به کورتی دوای کۆتایی هاتنی گفتوگۆی رووبەڕوو، داوام لە سەفیرانی بەڕێز کرد کە شەوی پێنج شەممە ٢٨ ی جەمادی یەکەم، لەگەڵ تێکڕای پلەدارانی یاوەریان لە **دارلحکومە** داوەت بن و بانگهێشتی کارگێریان پەسەند کرد و شەوی رابردوو هەموویان لەگەڵ مێجەر **نیسترم** و مێجەر **دمارە**[1] پلەدارانی سویدی و **رەفیق بەگ شابەندەر و شەوکەت بەگ** کە لە شابەندەرخانە پلەی فەرمانبەری هەیە، لەگەڵ چەند شازادەی بەڕێز و پیاوماقوڵانی شار و جێگری حکومەت، کە ژمارەیان لەگەڵ وەزیرەکان و دوازدە یاوەرەکانیان گەیشتە ٢٢ کەس، میوانی کارگێڕی بوون. وەزیرانی موختار بە هۆی **لیتن** کونسولی پێشووی ئازەربایجان وتاری شیعر ئامێزیان خوێندەوە، لەمەڕ دۆستایەتی و یەکییەتی نێوان هەردوو دەوڵەتی ئەڵمان و نەمسا، لەگەڵ دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران و دوعای بۆ سەلامەتی وجود موبارەکی عەلاحەزرەت شەهریاری کرد و، خۆشحاڵی خۆی دەربڕی بۆ ئەو میواندارییەی لێیان کراوە. بەندەش وتارێکم خوێندەوە بۆ پیرۆزبایی لە هاتنی ئەو بەڕێزانە و نزای بەردەوامی دۆستایەتی و یەکییەتی و خۆشەویستی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران لەگەڵ ئەو دەوڵەتانە و لە کۆتاییدا بە هۆی ئامادەبوونی پلەدارانی سویدی، سوپاسی خزمەتگوزاری بەرپرسانی پۆلیسم کرد و دانیشتنەکە بە بایەخپێدانی کارگێڕانی وەزارەتی پایە بەرز، بە خۆشی کۆتایی هات. بڕیار بوو ئەمڕۆ بەیانی بەرەوە تاران وەرێکەون و بە هۆی نەبوونی گالیسکە، رۆژێك دواکەوتن. ئێستا کارگێڕی خەریکە ئامراز و پێداویستییەکانی سەفەریان بۆ ئامادە دەکات، رەنگە سبەی بەیانی بێ دواکەوتن بەرەو هەمەدان بڕۆن. **مێجەر نیسترم** لەگەڵ تێکڕای ژاندارمەکان تا هەمەدان لە خزمەت ناوبراواندا دەبن. **ئیسماعیل مەعازد ولدەولە**.

لەگەڵ راپۆرتە سەرەکییەکە یەکن. (مۆر) وەزارەتی دەرەوە. بەڕێوەبەرایەتی نووسراوەکانی وڵاتانی نادراوسێ.

(ك٣/٤٣٤٤و٤ و٥).

١- لە دەقەکەدا (مار) ە.

## (٩٨)

**(لە وەزارەتی کاروباری دەرەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ٢ ی جەمادی دووەمی ١٣٣٣)**

**وەزارەتی کاروباری دەرەوە، بەڕێوەبەرایەتی ئینگلیز، بەرواری ٢ج٢ (جمادی ئەلئاخر) ی ١٣٣٣، ژمارە ٥٦٢٢/١٦٢.**

بەپەلەیە. وەزارەتی شکۆداری ناوخۆ، لقی بانکی کرماشان بە تێلگراف بۆ بەڕێوەبەرایەتی ناوندی تاران، سەبارەت بە ئالۆزی بارودۆخی ئەوێ و ئامادە بوونی سەت و پەنجا ئەڵمانی، کە بە درێژی بۆ ئاگاداری ئەو وەزارەتە پایەبەرزە ڕەوانە دەکرێ[1]، لەبەر ئەوەی ئەم هەواڵە لە سەرچاوەیەکی فەرمی وەزارەتی دەرەوە نەگەیشتووە، تا ڕاستی و ناڕاستی دەرنەکەوێ، وەزارەتی دەرەوە لەگەڵ سەفارەتی ئەڵمان دا ناکەوێتە گفتوگۆی فەرمی. بەڵام پێویستە فەرمانی جیدی و بە پەلە بە تێلگراف بۆحکومەتی کرماشان دەربکرێ، کە خێرا ئامرازەکانی پێویستی ئاسایشی بانك بە شێوەیەك ئامادە بکرێ، کە لقەکانی بانکی کرماشان نیگەران نەبوونی خۆیان بە بانگی تاران ڕابگەیەنن، هەروەها تکام وایە لێکۆڵینەوەیەکی قووڵ لەبارەی ناسنامەی ئەم کەسانەدا بکەن و دەرئەنجامەکەی بۆ وەزارەتی دەرەوە بنووسن. (مۆر) وەزارەتی پایە بەرزی کاروباری دەرەوە.

(ك٢٧٧٦/٦).

## (٩٩)

**(راپۆرتی سەرۆکی بانکی شاهنشایی کرماشان)**

**وەزارەتی کاروباری دەرەوە، درێژەی وەرگێڕدراوی تێلگرافی سەرۆکی بانکی کرماشان بۆ بانکی ناوندی، پێچراوە و درێژییەکەی بە ژمارە ٥٦٢٢/١٦٢**

بارودۆخ لەمە خراپتر نابێت، بڕیارمانداوە پارەی سەرەکی گەنجینەی ئێرە لە ٩ی ئابریل ٢٣ ی جەمادی یەکەم ببەین بۆ هەمەدان، مامەڵەکانتان لەگەڵ ئێمە ڕابگرن، چونکە دوور

---

١ - بگەڕێوە بۆ بەڵگەنامەی ژمارە ٩٩.

نییە ئێمەش ئەگەر بۆمان بکرێ وەڕێ کەوین. مەگەر دەوڵەتی ئێران هەوڵێکی بەپەلە بدات بۆ لێك دابڕینی ئەڵمانییەکان، کە ژمارەیان گەیشتۆتە سەت و پەنجا کەس. لەگەڵ دەقە سەرەکییەکەدا یەکن. (مۆر) وەزارەتی کاروباری دەرەوە. بەڕێوەبەرایەتی نووسراوەکانی ئینگلیز.

(ك٢٧٧٦/٧).

## (١٠٠)

**(لە وەزارەتی کاروباری دەرەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ٢ ی جەمادی دووەمی ١٣٣٣)**

**وەزارەتی کاروباری دەرەوە، بەڕێوەبەرایەتی نووسراوەکانی ئینگلیز، بەرواری ٢ی جەمادی دووەمی ١٣٣٣، ژمارە ٥٦٢٣/١٦٨، هاوپێچ لەگەڵ وەرگێردراوی نووسراوی بانکی شاهنشاهی.**

وەزراەتی پایە بەرزی ناوخۆ. لە بەدواداچوونی ناوەرۆکی تێلگرافی ژمارە **٥٦٢٢** زەحمەتتان دەدەین، لە بانکی شاهنشاهییەوە دوو برگەی نووسراو بە وەزارەتی کاروباری دەرەوە گەیشتووە، کە بە درێژی دەخرێتە بەردەم بەڕێزتان[١]. تکا دەکەین ڕێنوێنی فەرمانەکان بە تێلگراف بە مسۆگەری بۆ حکومەتی کوردستان و هەمەدان بنێرن، تا بۆ پێش گرتن بە لەگرێژنە چوونی کاروباری ئەوێ، ئامرازی ئاسایش و پاراستنی بانك ئامادە بکەن و ئەنجامەکەیمان پێ ڕابگەیەنن. (مۆر) وەزارەتی پایە بەرزی دەرەوە. لەمەڕ پرسی تۆپ و ڕەشاش وەك باس دەکرێ، دوو ئەڵمانییان هێناوە، لێکۆڵینەوەی تەواویان کردووە، ڕاستی و ناڕاستییەکەمان پێڕابگەیەنن. (مۆر) وەزارەتی پایە بەرزی کاروباری دەرەوە.

(ك٢٧٧٦/٤).

١- بگەڕێوە بۆ بەڵگەنامەی ژمارە ١٠١.

## (١٠١)

**(نامە بۆ بەڕێوەبەری  بانکی شاهنشاهی)**

**وەزارەتی کاروباری دەرەوە، بەڕێوەبەرایەتی ئینگلیز، درێژەی وەرگێڕدراوی نووسراوی سەرۆکی بانکی شاهنشاهی، بەرواری ١٥ ئابریل (٢٩ ی جەمادی یەکەم ١٣٣٣.**

سەبارەت بە پەیامی خۆم لە ڕێکەوتی ٦ ی ئەم مانگە بە شانازییەوە بە جەنابی موبارەکتان رادەگەیەنم، کە ئەمڕۆ لە لقی بانکی شاهنشاهی کرماشان تیلگرافێك گەیشتووە دەڵێ: لەو دەڤەرە بانك داخراوە و بەشەکانی گوێزراونەتەوە و بەرەو هەمەدان وەرێکەوتوون. هەروەها وەرگێڕدراوی نووسراوی ١٥ ئابریل: لە تەواو کردنی نامەکەمدا بەرواری ئەمڕۆ زەحمەتان دەدەین کە ئێستا ئەم تێلگرافەی خوارەوە لە بەڕێوەبەری بانکی هەمەدانەوە گەیشتووە:

داخستنی بانکی کرماشان بۆتە هۆی پەرێشانی خەڵکی ئێرە. لێرە مەترسی ئاژاوەیەکی گشتی دەکرێ. دەترسم خەڵك شالاو بێنن بۆ سەر بانك و پارەی نەقد لە بەرامبەر ئەسکیناس داوا بکەن. ئەگەری ئەوە هەیە لە هەرئان و ساتێکدا ناچاربم ئێرە بەجێبهێلم. سێ ئەڵمانی هاتوونە ئێرە و وەك دەبیستین دوو تۆپ رەشاشیان[١] پێیە.

## (١٠٢)

**(لە وەزارەتی ناوخۆوە بۆ حکومەتی کرماشان، ٥ ی جەمادی دووەمی ١٣٣٣)**

**وەزارەتی ناوخۆ، بەڕیوەبەرایەتی رۆژئاوا بۆ کرماشان، ژمارە ١٨٧٦، بەرواری ٣٠ حەمل( ٥ی جەمادی دووەم ١٣٣٣.**

بەپەلە. حکومەتی پایە بەرزی کرماشان. بە پێی وتەکانی بانکی شاهنشاهی لقی بانك لەوێ داخراوە بەشەکانی بانك هەڵاتوون بۆ هەمەدان. لەبەر ئەوە زەحمەت نەبێ رێگە نەدەن

---

١- رەنگە مەبەست رەشاشی مەترالیوز بێ.

هیچ جۆرە بشێوییەك لە كاروباری بانكدا رووبدات، ئامراز و پێداویستییەكانی بانك بە تەواوی ئامادە بكەن(1). جەمادی دووەم، ژمارە **٣٣٣٩**[1]
(ك٢٧٧٦/٢).

## (١٠٣)

**(وەزارەتی ناوخۆ بۆ وەزارەتی دەرەوە، جەمادی دووەمی ١٣٣٣)**

**وەزارەتی ناوخۆ، ژمارەی تۆماری نووسراو٣٥٢/١٨٧٥، تاران شاری، بەرواری ٥ جەمادی ئاخری ١٣٣٣.**

وەزارەتی پایە بەرزی كاروباری دەرەوە، نووسراوەكانتان بە ژمارەی **٥٦٢٢/١٦٢** و ژمارەی **(٨) ٥٦٢٦/١٦**[2]، سەبارەت بە وتەكانی بانكی شاهنشاهی پەیامەكەی رازاندەوە و بە فەرمانڕەوایانی **كرماشان** و هەمدانمان راگەیاند و جەختمان كردەوە لە سەر دابین كردنی ئامرازەكانی پاراستن و ئاسایشی بانك و بەشەكانی لە هەموو روویەكەوە.
(ك٢٧٧٦/٣).

## (١٠٤)

**(راپۆرتی حكومەتی كرماشان، ٣ ی جەمادی دووەمی ١٣٣٣)**

**بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، ژمارەی نووسراو ٨٨، لە كرماشانەوە بۆ تاران، ژمارەی تێلگراف ١٥٥، بەرواری ٣٨، (حەمل/ ٣ ی جەمادی دووەم، بەرواری گەیشتن ٢٨ ی حەمل ١٣٣٣.**

---

١- لە پراوێزەكەی دا نووسراوە (ئەمڕۆ كە بانكی كرماشان داخراوە بەشەكانی بانك رایان كردووە بۆ هەمەدان، حكومەتی كرماشان بۆ چارەسەری ئەم شێواویە چی بكات). دیارە لەو دەقەدا كە بۆ حكومەتی كرماشان نێردراوە (وەزارەتی ناوخۆ، ژمارەی تۆماری نووسراو ١٨٧٦/٣٣٩، ٣ جەمادی لئاخر ١٣٣٣ هەمان بابەتی سەرەوە بێ روونكردنەوە خراوەتە پەراوێزی تێلگرافەكە. (ك٢٧٧١/١)

٢- بڕوانە بەڵگەنامەی ژمارە ٩٩- ١٠٢ .

مەقامی پایە بەرزی وەزارەتی ناوخۆ. دوو سێ ڕۆژ لەمەوبەر، کە بڕیار بوو پرسەکانی سەرسنوور و ڕووداوەکان لە کرندەوە ڕاستەخۆ بە خزمەتتان ڕابگەیەنم و هەیئەتی دەوڵەت ئاگادار بکەمەوە، لەبەر ئەوەی هێڵی تێلگراف خراپ ببوو بۆم نەکرا، دوو ڕۆژیش لە کرند مامەوە تا هێڵەکە چاك بکرێتەوە و بابەتەکان بە خزمەتتان ڕابگەیەنم، دیسانەوە ئەو هێڵە چاك نەکرایەوە، لەبەر ئەو ڕووداوانەش نەکرا بە تێلگراف بە درێژی بە خزمەتانی ڕابگەیەنم، دوور نەبوو ببێتە هۆی نیگەرانی جەنابی موبارەکتان. هەروەها ئەوەی دەرکەوت ئەوە بوو، ئەم ئۆردووە بەو ناوەی کە جیهادی میللییە و یارمەتی لە برایانی موسوڵمانی خۆی وەردەگرێت و دێنە ناوخاکی پیرۆزی ئێران و ناو کرماشان و دەڵێن لە وێوە دەڕۆین بۆ **ئەفغانستان** و موسوڵمانانی ئەوێ لەگەڵ خۆمان دەبەین و **هیندوستان** داگیر دەکەین و ئێستا گەیشتوونەتە سەرپوڵی زەهاو و بەردەمی **تاق**، بە پێی ڕێنماییەکانی هەیئەتی دەوڵەت دەبوو بێ لایەنی خۆم بپارێزم، هێڵی تێلگرافی کرندیش خراپ ببوو تا داوای ڕێنمایی بکەم، لەبەرئەوە ئوردوم لە کەرندەوە بەرەو **هارون ئاباد**[1] برد و ئینشائەڵڵا دووسبەی ڕۆژی دووشەممە دەچمە ناو کرماشان، چونکە ئەم ئۆردووە بگاتە هەرشوێنێك داوا لە خەڵك دەکات ڕەگەڵی کەون یا ناچارییان دەکات، جگەلەوە سوارەکانی عەشایریشی لەگەڵە کە خەڵك زۆر ئازار دەدەن، ئەوانە بوونەتە هۆی پشێوی و ڕاپەڕین و ترساندنی گشتی و خەڵکی ناوچەکە ڕایانکردووە و ماڵ و حاڵیان بە چۆڵی بەجێهێشتووە. ئەم کارەش لە کرماشان دەبێتە هۆی ڕوودانی کاری نارەوا و گرفتی سەرەکی. ئێستا پێش هاتنە ناو کرماشان ئاگادارتان دەکەمەوە و، ڕۆژی سێ شەممەی پێنجی مانگ، ڕۆژێك دوای هاتنمان بۆ کرماشان، هەر سەعاتێك دیاری بفەرموون لە تێلگرافخانە ئامادەم تا پرس و جۆ بکەم و بۆم ڕوونبکەنەوە پێش ڕوودانی هەر کارێکی نارەوا بزانم چێبکەم و چۆن دەسبەکار بم، لە هەمووشیان گرنگتر پارەیە، کە سەرەڕای خەرجییەکانی ئۆردو و هیتر، مووچەی مانگی حەوت و حەمل و سوار، هی بەختیاری و کاربەدەستانی حکومەت لێرە نەدراوە، دارایی بە ئومێدی ئەوە بوو لە باج و خەراجی دواکەوتووی عەشایر و ساڵی نوێی و هیتر، مووچەی ئەوانە بدات، بەڵام بە هۆی ئەم ڕووداوە و هاتنی ئۆردووی عوسمانییەکان بۆ ناو خاکی ئێران، ڕایەڵکەی نەزم و نیزام پچڕا و بەهانە کەوتە دەست خەڵك و لەم ڕووەوە بە گشتی بێ ئومێدین و لە سندوقی دارایی دا هیچ پارەو پولێك نەماوە تا مووچەی پێ بدەم. لەم

[1] ١- لە دەقەکەدا (ئارون ئاباد)ە.

ماوەیەدا پێویستە بەپەلە پارە بگەیەنرێتە دارایی، تا مووچەی ئەم دوو مانگە بدەین، ئەگینا خودی ئەم پرسە کارەساتی لێدەکەوێتەوە، لە کۆتاییدا بە خزمەتتان رادەگەیەنم کە مۆڵەتی **سەردار نصرەت** و تەمیٚ کردنی **سنجابییەکان**، بیانوویەك بوو بۆ دەسدرێژی و هاتنە ناوخاکی ئێران. بەم پێیە نەمویست سەردار نصرەت مۆڵەت لەوان وەربگرێت، خۆم مۆڵەتم پێدا تا بڕوا کاروباری دارایی پێویستی خۆی رێك و پێك بکات و ئەوان بیانوویان نەمێنیٚ، هەروەها راست و رەوان بە خزمەتتان رادەگەیەنم بەندە بە چ زەحمەتێك ئەم ئۆردووەم گەیاندۆتە کرماشان، ئەگەر بە پەلە پارەیان پیٚ نەگات، تا مووچەکەیان ورگرن و دەست لە خراپکاری هەڵگرن، بە دڵنیاییەوە گومانی ئەوە دەکریٚ هێندێك کردەوەی ئەوتۆ بنوێنن، بیٚ نەزمی و ناخۆشی لێبکەوێتەوە و بەندەش ئەوەندەی بۆم کرابیٚ قەرزم لە بازرگانەکان وەرگرتووە و بە داراییشم راگەیاندووە چیتر قەرزمان پێنادەن و، پیٚ ویستە بەپەلە پارە بگاتە دارایی ئەگینا کێشەی سەرەکی و کارەسات بۆ دەوڵەت دروست دەکەن. **٢** ی جەمادی لئاخر، ژمارە **٢٢٦.**

**ئەمیر موفەخەم.**

(ك١٣٣٩/ ٦و ٧و ٨).

**(١٠٥)**

**( وەزارەتی ناوخۆ بۆ حکومەتی همدان، ٣ ی جەمادی دووەمی ١٣٣٣)**

**وەزارەتی ناوخۆ، ژمارە ١٣٤، بەرواری جەمادی لئاخری ١٣٣٣**

**حکومەتی** پایە بەرزی هەمەدان. بە پێی ئەو هەواڵەی دراوە بە وەزارەتی ناوخۆ، بەشەکانی بانکی شاهنشاهی ئەویٚ، بەهۆی هەڵاتنی کاربەدەستانی لقی بانکی **کرماشان** بۆ **هەمەدان،** ترساون و رەنگە کاروباری بانکی ئەوێش بە هەمان شێوە پشێوی تێبکەویٚ، لەبەر ئەوە بە پێویستی دەزانم بنووسم کە بە ئامرازی پێویست ئەم پشێویە لە کاروباری بانکدا نەهێڵن، و پێداویستەکانی ئاسایش و پاراستنی بانك لە هەر روویەکەوە دەستەبەر بکەن، هەورەها زانیاری گەیشتووە کە سیٚ کەسی ئەڵمانی بە دوو تۆپی رەشاشەوە هاتوونە ناو هەمەدان و راستی و ناراستی ئەم پرسەش زووتر بە تێلگراف رابگەیەنن. (واژۆ)

(٢٩٠٠٠٥٧٩٩).

## (١٠٦)

**(وەزارەتی ناوخۆ بۆ حکومەتی پشتکووە، ٧ ی جەماجی دووەمی ١٣٣٣)**

**دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، وەزارەتی ناوخۆ، ژمارەی تۆماری نووسراو٢٣٨٣/٣٦٢، تاران کرماشان، ٧ ی جەمادی لئاخری ١٣٣٣.**

جەنابی پایەبەرز ئەمیری جەنگ والی پشتکووە هەربەختەوەر بێ، نامەی جەنابی پایەبەرزتان گەیشت. بە سەلامەتی بە رێزتان خۆشحالْم. لەمەڕ تێچووی دروستکردنی چەند قەڵایەکی سنووری، لەبەرئەوەی دەبێ ئەم جۆرە تێچووانە بە ئاگاداری وەزارەتی پایە بەرزی دارایی بێت، بۆیە نووسراومان بۆ ئەو وەزارەتە بەرێزە نووسیوە و رێنمایی پێویست دراوە بە کارگێڕی دارایی کرماشان، کە بە پێی رەئی و ئاگاداری جەنابعالی کار بۆ دروست کردنی ئەو قەڵایانە بدرێ.

(ک٢/٨٣٤).

## (١٠٧)

**(لە والی پشتکووهەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ)**[1]

لە بارەی تێچووی دروست کردنی قەڵای سنووری کە نووسیبوتان، مۆڵەتی دەرکردنی حەواڵەی پارەکەی دراوە بەوەزارەت دارایی و ئەمەش پێزانیی بەندەی دلسۆزتانی پتر کردووە و ئاشکرایە خێرخوازی مەزنی جەنابتان سەبارەت بە خەڵکی ئێران بە تایبەتی لەلای کاربەدەستانی دڵسۆزی سنوورپارێز، گەیشتۆتە باڵاترین پلەی خۆی. لە خواوەندی مەزن دەپاڕێمەوە وجودی موبارەکتان بۆ خەڵکی ئێران و ئەمەکناسان بپارێزێ.

**غوڵامرەزا والی ئەمیر جەنگ**

(ک٣/٨٤٣)

---

١- ئەم بەڵگەنامەیە نیشانەکانی ئاسایی نەبوون.

## (١٠٨)

**(له وەزارەتی ناوخۆوە بۆ زانایانی ئاینی کرماشان، ٧ ی جەمادی دووەمی ١٣٣٣)**

**وەزارەتی ناوخۆ، ژمارەی تۆماری نووسراو ٢٣٠٤/٣٥٤، له تارانەوە بۆ کرماشان، ٧ی مانگی جەمادی دووەمی ١٣٣٣.**

بەرێزان، پیاوچاکان، پیاوانی دینی، زانایان، سلاوی خواتان لێ بێ. بە پێی ئەو زانیارییانەی گەیشتوون، لەم بارودۆخەدا کە حکومەتی پایەبەرز بۆ ناو شاری کرماشان گەڕاوەتەوە ، لەلایەن هێندێك کەسەوە چەند داواکارییەك هەیە، کە لە راستیدا بە تەواوی بۆ ئێمە جێگای سەرسوڕمانە و بە پێی ئەو زانیارییانەی کە ئێوە بەرێزان هەتانە، پێویست بە روونکردنەوە ناکات، کە لەم کاتە ناسکەدا تێوەگلان لە گفتوگۆ و هەوڵەکان تاکوێ زیانبەخش و چ دەرئەنجامێکی خراپی دەبێت، لەبەر ئەوە ئێوە سەرەڕای ئەرکی دینی و روحانی، لەم جۆرە کاتانەدا پاراستنی بەرژەوەندی دەوڵەتیشتان لە ئەستۆ دایە و پێویستە خەڵك لە چاك و خەراپی خۆیان ئاگادار و رێنوێنیان بکەن، بە پێویستی دەزانم ئەزێتتان بدەم کە بەو زانیارییە تۆکمەیەی سەبارەت بە بارودۆخەکە هەتانە، ئەرکی سەرشانتانە ئامۆژگاری دڵسۆزانەی خەڵك بکەن و، ئاگاداریان بکەنەوە لەو ئەرکەی لەسەر شانیانە و تێیان بگەیەنن لەم کاتەدا کە خەڵکی کرماشان تەنیا ئەرکیان ملکەچ بوونە بۆ فەرمانەکانی دەوڵەت، نابێ فریوی فێڵ و ئامرازەکانی فریودانی هێندێك کەس بخۆن و بە پێچەوانەی بەرژەوندی و پێویستییەکانی وڵات بیربکەنەوە و بجوڵێنەوە کە کێشە و گرفت بۆ وڵات دروست بکا و بەرەو مەترسی ببات. دەوڵەت، پیلانگێران و ئەو ئاژاوەچیانە دەناسێ، کە هەمیشە بازاری شێواویان دەوێ و لە فیتنە و خراپەکاری و شێواندنی ویلایەتەکان بەولاوە مەبەستێکی تریان نییە. دڵنیابن دەوڵەت لە راوەدوونان و تەمێ کردنی ئەوانە چاوپۆشی ناکات. وەلێ لەگەڵ ئێوەی پیاوچاك دایە کە لە دنیای خێرخوازی دا خەڵك لە ئەرکی دەوڵەتخوازی و خۆیان ئاگادار بکەنەوە و گوێڕایەڵ بن و بڕیارەکانی دەوڵەت بکەن بە سەرمەشق.

(ك٢٣٤٢/٤).

## (١٠٩)

**(لە کارگێڕی کرماشانەوە بۆ وەزارەتی دەرەوە، ٨ ی جەمادی دووەمی ١٣٣٣)[١]**

**وەزارەتی کاروباری دەرەوە، درێژەی تێلگرافی رەمزداری کرماشان، بەرواری ٨ ی مانگی جەمادی دووەمی ١٣٣٣.**

خەڵك دژی حکومەتی جەنابی موفەخەم راپەڕیون و ئەو پەیامانەی لەم دوو رۆژەدا داویانە بە حکومەت، لە نزاکەت بە دەرە و گومانی تەواو ئەوەیە، کە شوئمان هاندەری سەرەکییە. هەرچەندە خەڵك هەریەکەیان لەبەر هۆیەك لە حکومەت تۆراون، ئێستا کردەوەی خەڵك لە سنوور دەرچووە و زۆر زەحمەتە دووبارە متمانە بەیەکتر پەیدا بکەنەوە. ئەگەر دەکرێ بە پەلە فەرمانداریێك دیاری بکەن و بە زەبری هێز بینێرن. چونکە جگە لە خەڵکی شار عەشیرەتەکانیش لە حکومەت نارازین، ئەگەر پێش دیاری کردنی فەرماندار حکومەت ئامادە بکەن، بە نەبوونی پۆلیس پاراستنی ئاسایشی شار تا رادەیەك زەحمەتە. لەلایەکی تریشەوە ئەگەر حکومەت نوێ نەکرێتەوە، دوور نییە دەست بدەنە مانگرتنی گشتی و هەنگاوی تر بنێن، کە خوێنرشتنی لێبکەوێتەوە. بەندە ئەوەندەی لە دەستم بێت هەوڵی هێورکردنەوەی خەڵك دەدەم، بە مەرجێك ترسی خەڵك لەم هەوڵە سەرپێیی و جموجوڵی **شوئمان** رێگە بدات. دواتریش پەیوەستە بە رەئی پرشنگداری بەڕیوەبەرانی کاروبار.

ئەمڕۆ لە لایەن حکومەتی پایەبەرزەوە، چەند پەیامێکمان بە خەڵك راگەیاندووە و کورتییەکەی ئەوەیە، کە بارودۆخەکە ناسکە و نزیك بوونی سەربازەکانی عوسمانیش، جگە لە پەشیمان بوونەوە، دەرئەنجامێکی تری نابێت. باشتر وایە، کۆبوونەوەکان بڵاوە پێبکەن و داواکارییەکانیان بە هۆی دوو پێشەوای دینی بە حکومەت رابگەیەنن، تا هەنگاو بۆ چارەسەرکردنیان بنرێ. هەروەها بەندە هەرچی بۆ وڵات باش و خێر بوو پێم راگەیاندن، دوای

---

١- وەزارەتی کاروباری ناوخۆ بە پێی نامەیەکی بێ ژمارە بە رێکەوتی ٨ ی جەمادی دووەم، دەقی ئەم راپۆرتەی خوارەوەی (بەڵگەنامەی ژمارە ٢٥) ناردووە بۆ وەزارەتی ناوخۆ و، وەبیری دێنێتەوە کە بە پێی گرینگی شوێنەکە، بۆ هێوڕ کردنەوەی پرسەکە و رێگرتن لە شۆرش، هەنگاوی بەپەلە پێویستە.

گفتوگۆیەکی زۆر بڕیاردرا دەکەس لە ناوخۆیان هەڵبژێرن و مۆڵەتیان پێ بدەن، سبەینێ مەبەستەکانی خەڵك لە ڕێگەی بەندەوە بە حکومەتی پایەبەرز بگەیەنن و ڕێوشوێنێك دابنێن بە ئاشتیانە کوتایی بێت. دەرئەنجامی گفتوگۆکان سبەینێ بە درێژی بە خزمەتتان رادەگەیەنم و لە کۆتاییدا تکام وایە و پێویستە هەرچی زووتر ژمارەیەك پۆلیس لە بروجەردەوە بنێرن، یا ئەوانەی لەگەڵ **ئەمیر موختار** ڕۆیشتوون بۆ هەمەدان بگەڕێننەوە بۆ کرماشان. ٦ی جەمادی دووەم، ژمارە ٢٣٠، **مەعازید لدەولە**.

## (١١٠)

**(کارگێڕی کرماشان بۆ وەزارەتی دەرەوە، ٨ ی جەمادی دووەمی ١٣٣٣)**

**وەزارەتی کاروباری ناوخۆ، بەرواری جەمادی دووەم ١٣٣٣.**

تێلگرافی کرماشان، خەڵك سوێندیان لە سەر یەکگرتن خواردووە و بەڵێنیان داوە، ئەگەر سەربازەکانی عوسمانی بێنە ناوشار بە جیدی ڕێگەیان لێبگرن. هەرکاتێك لە لایەن حکومەتەوە ئەزییەتی یەکێکیان بدرێت هەموویان دژی رادەپەڕن. ئەنجامگیری ئەوە دەکرێ لە نێوان شونمان و شابەندەرخانە لە سەر هاتنی سەربازەکانی عوسمانی ناکۆکی دروست بووبێ. ئەڵمانییەکان دەیانەوێ بە نهێنی ڕێگە لە سەربازەکانی عوسمانی بگرن. ئەگەر خەڵك لەگەڵ رەئی شونمان بن، ئەوا شابەندەر لەو پێشهاتە زۆر دڵتەنگ دەبێ. صمصامولمەمالکی سنجابیش لەو رووەوە لەگەڵ خەڵکەکە دایە. شابەندەر حەز لە مانەوەی حکومەتی جەنابی **موفەخەم** دەکا، خەڵك بە ئاشکرا و شونمان بە نهێنی کار بۆ گۆڕینی ناوبراو دەکەن. **٧** ی جەمادی دووەم، ژمارە **٢٣٤**، مەعازید و لمولك.

(ك١١١/٤٠٨٥)

## (١١١)

**(وەزارەتی ناوخۆ بۆ زانایانی کرماشان، ٩ ی جەمادی دووەم ١٣٣٣)**

**وەزارەتی ناوخۆ/ ژمارەی تۆماری نووسراو ٣٧٩، بەپەلە، لە تارانەوە بۆ کرماشان ٩ ی جەمادی لئاخر ١٣٣٣.**

جەنابینە، پیاوچاکانی شەرع بەدەست، زانایان، سڵاوی خوای مەزنتان لێبێ. تیلگرافی ئێوەی پیاوچاك و پایەبەرز، بە هۆی نوێنەرانی بەڕێزی کرماشانەوە گەیشت. سەبارەت بەو بابەتەی فەرمووبوتان، لەم دوو رۆژەدا وەك پێویست چارەسەر و فکری ئێوەی بەرێز ئاسوودە دەکەین. وەلێ سەبارەت بە بارودۆخی کرماشان، وەك چەند رۆژ لەمەوبەر بە تێلگراف بە ئێوەی بەڕێزم راگەیاند، ئەو هەواڵانەی لە وێوە بە ناوەندی دەوڵەت دەگات، لە رابەدەر سەیر و سەرسوڕهێنەرن، کە چۆن بە ئەم هەموو پیاوە مەزن و پایەبەرزانەوە، کە بە باشی ئاگاداری راستییەکانن و دەیانبینن، هەندێك کەس بتوانن نیازی خراپی خۆیان لە ناو خەڵکدا بڵاوبکەنەوە و خەڵك وەدوای نیازی خراپی خۆیان بدەن. لە کاتێکدا ئەوانە دەبێ بزانن پەیڕەوی کردن لەو ئاژاوەگێڕانە، سەرەڕای ئەوەی یاخی بوونە لە فەرمانی دەوڵەت، ئەگەر هەر رووداوێکیش رووبدات، پێش هەمووان داوێنی خەڵکی کرماشان دەگرێت. بەهەر حال هەیئەتی دەوڵەت چاوەڕوانە، ئێوە بە ئامرازی خێرا و بە توندی رێگە لەو کەسانە بگرن، کە بە پێچەوانەی بەرژەوەندییەکانی دەوڵەت هەنگاو دەنێن و خەڵك لە ئەنجامی ئەو کارانە ئاگادار بکەنەوە. هەروەها بە پێی ئەو هەواڵانەی گەیشتوون، هەندێك بە هۆی ئەو دوژمایەتییە کۆنەی لەگەڵ عەشیرەتی سنجابی هەیانە، دەیانەوێ ناکۆکی بخەنە نێوان ئەوان و عەشیرەتەکانی سەرسنوور، تا لەو نێوەندەدا بە مەبەستی خۆیان بگەن. ئاشکرایە ئێوە باشتر دەزانن کە لەم کاتەدا سەرهەڵدانی ئەو ناکۆکیانە لە نێوان عەشیرەتەکاندا، چەند زیانبەخشە و چ دەرئەنجامێکی خراپی لێدەکەوێتەوە. لەم رووە داوا لە ئێوەی بەڕێز دەکەم بە ئامرازی پێویست رێگە لەو رووداوە بگرن و بایەخیان پێبدەن، رێگە نەدەن بە پێچەوانەی چاوەڕوانی روو بدەن.

(ك١٣٤١/٥)

## (١١٢)

**(لە صمصام ولەمالكی سنجابی بۆ نوێنەرانی كرماشان، ٨ ی جەمادی دووەمی ١٣٣٣)**

**بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، ژمارەی نووسرا و ٢٣، لە كرماشانەوە بۆ تاران، ژمارەی تێلگراف ٣١، بەرواری ٣ ی گا/ ٨ ی جەمادی دووەم ، بەرواری گەیشتن ٤ ی گا ١٣٣٣.**

بۆ خزمەت نوێنەرانی بەڕێزی كرماشان. عوسمانییەكان بە لەشكرێك لە عشیرەتەكانی عوسمانی و ئێرانی كە كە بوونەتە لایەنگریان وەك **كەڵهوڕ** و **گۆران** و **باجەلان** و **فەتاح بەگ** لە هەموو لایەكەوە بۆ كوشتاری سنجابییەكان دێنە سەر ماڵ وحاڵمان. هەڵەی ئێمە ئەوەیە كە پەیڕەوی بیروڕای ئەوانمان نەكردووە و شەرفی دەوڵەت و بەهێزكردنی حكومەتمان لەدەست نەداوە. ئاخیرەكەی حكومەتی فریودا و ئێمەی بە ئەوان فرۆشت، ئەو پارەو بەڵێنەی ئەوان، سەر سنووری بەبادا. بۆ بڕینی بیانوو هاتم بۆ كونسوڵخانەی ئاڵمان و ئەوانم كرد بە ناوبژیوان، كەڵكی نەبوو. ئەگەر دەوڵەتیش بە چەند ساڵ خزمەتەوە گوێ نەداتە رەعییەت و نۆكەری خۆی، ناچارین بجەنگین تا دەكوژرێین. ئێوە وەكیلی خەڵكن بە پەلە چارەیەك بدۆزنەوە.

**صمصام و لەمالك.**

(ك١١/٣٧٢١)

## (١١٣)

**(لە حكومەتی هەمەدانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ٩ ی جەمادی دووەمی ١٣٣٣)**

**بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، لە هەمەدانەوە بۆ تاران، ژمارەی تێلگراف ٤٧، بەرواری ناردن ٤، بەرواری گەشتن شەوی ٥ی گا١٣٣٣.**

مەقامی پایە بەرزی وەزارەتی ناوخۆ، هەر شكۆدار بێ. دەسنووسی تێلگرافی ژمارە **١٣٤** جەنابتمان زیارەت كرد[١]. پشێوی لقی بانك چارەسەر كراوە، باسی سێ ئەڵمانی بە تۆپ و

١- بەڵگەنامەی ژمارە ١٠٥.

ڕەشاشەوە کە گەیەنراوە بەو وەزارەتە پایەبەرزە، ڕاست نەبوو. باسەکە هەر ئەوەیە کە پێشتر بە خزمەتتان گەیشتووە. دوو ئەڵمانی ماوەیەك لەمەوبەر هاتوون و چاوەڕوانی هاتنی وەزیر موختار بوون، هەرکە وەزیر موختار ڕێگای هاتنی خۆی گۆڕی، یەکێك لەوانە لەگەڵ **میسیۆ ڤیبەر** نوێنەری کۆمپانیای فەرشی ئەڵمانی ڕۆیشت بۆ **مەلایر** و، ئەوی تریان کە ناوی **فان پاشنە**، نەخۆش کەوتووە و لەبەر لاوازی لێرە ماوەتەوە. **٩** ی جەمادی دووەم، ژمارە ٢٧، **عەبباس سالار لەشکر؟**

(٢٩٠٠٠٢٩٣٣)

## (١١٤)

**(لە وەزارەت ناوخۆ بۆ حکومەتی کرماشان، بێ بەروار)**

**(بێ سەربەرگ) زۆر بەپەلە، ژمارە ١٠١٩، بێ بەروار**

حکومەتی پایە بەرزی کرماشان. تێلگرافی وەڵام بۆ جەنابی پایەبەرز ژمارە**١٣٠**، سەبارەت بە هاتنی وەزیرموختارەکان بینرا[١]. بە پێویستم زانی بڵێم، ژمارەی ئەوکەسانەی لەگەڵ خۆتیان دەبەی، پێویستە ژمارەیەکی بەرچاو بێ، تا بە سەلامەتی و ڕێزەوە لە خاکی **کرماشان** تێبپەڕن. هاتنی ئەوان بە کرماشان ڕابگەیەنە.

(٢٩٠٠٠٢٩٣٣)

## (١١٥)

**(لە حکومەتی کرماشانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ١٠ ی جەمادی دووەمی ١٣٣٣)**

**بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، ژمارەی نووسراو ٧١، لە کرماشانەوە بۆ تاران، ژمارەی تێلگراف ٤٩، بەرواری ناردن ٥ ی گا/ ١٠ ی جەمادی دووەم، بەرواری گەیشتن ٥ ی گا ١٣٣٣.**

---

١- بەڵگەنامەی ژمارە ٨٨.

تاران، بە هۆی جەنابی **میرزا فەزلوڵلاخان**. مەقامی پایەبرزی وەزارەتی ناوخۆ، هەر شکۆدار بێ, لەم یەك دوو ڕۆژەدا دوای دڵنیا بوونەوە، کەم و کوڕییەکانم بە خزمەتتان گەیاند و هێشتا هیچ وەڵامێکم وەرنەگرتۆتەوە و نازانم چیبکەم، لەبەر ئەوەی وەڵامی تێلگرافی جەنابی کومیسار لە ڕێنوێنییەکەدا نەبوو، دواخستنی وەڵامەکەم بە باش نەزانی، ئەمەش وەڵامەکەیە کە دۆستانە وەڵامم داوەتەوە و بۆ جەنابی موبارەکتانی دەنووسم:

جەنابی پایەبەرز و دۆستمان **حوسین ڕەئوف بەگ**، کۆمیساری ئۆردووی سەفەر هەر بەختەوەر بێ. تێلگرافەکەی جەنابتان سەبارەت بە یەکگرتن پەسەندەو بە ڕێزەوە وەرگیرا. ئاشکرایە بەهێز کردنی پەیوەندی نێوان هەردوو دەوڵەت و ڕێککەوتنی دوو دەوڵەتی ئیسلامی لای کەس شاراوە نییە و ئەرکی کاربەدەستانی ئەم دوو دەوڵەتە شکۆدارەیە، کە بۆچوون و ڕێبازی خۆیان بکەنە بنەمای دادوەری و کاملکردنی دۆستایەتی. لە تێلگرافەکانی خۆمدا باسی ئەو ڕێکەوتنەی جەنابتم بە دەوڵەت ڕاگەیاندووە، چونکە کاربەدەستانی دەوڵەت، جگە لە جێبەجێکردنی فەرمانەکانی دەوڵەت ئەرکێکی تریان نییە، ئەمەش خۆشەویستیمە بۆ ڕێبازی کارکردن و چاودێری ڕێنوێنییەکانی کاربەدەستانی باڵای دەوڵەت، ژمارە ٤٥، **ئەمیر موفەخەم**.

لە کۆتاییدا تێلگرافی پێشووی خۆم وەبیر جەنابی موبارەکتان دێنمەوە، لەمەڕ بێ پارەیی و ڕێ وشوێنی ئێستا، هەروەها ناردنی پێویستییەکان بۆ نیشتەجێ کردنی لەشکر، چاوەڕێی هەنگاوی کاریگەرم. جەمادی دووەم، ژمارەی ٤٦، **ئەمیر موفەخەم**.

(ك١٣٣٩/١٨).

## (١١٦)

**(لە وەزارەتی ناوخۆوە بۆ حکومەتی هەمەدان، ١٢ ی جەمادی دووەمی ١٣٣٣)**

**وەزارەتی ناوخۆ، ژمارەی تۆماری نووسراو ١٦٩، بەرواری ١٢ی جەمادە لئاخر ١٣٣٣.**

حکومەتی پایە بەرزی هەمەدان. **مسیۆ فۆختی** ئەڵمانی لە ڕێگەی کوردستانەوە هاتووە بۆ هەمەدان، پێویستە چاودێری کاروبارەکانی ئەم کابرایە بیت و، لە هەر کات و ساتێکدا هەواڵەکانی بەراپۆرت بنێرن. (واژۆ)

(لە پەراوێزدا: باشترە ڕەمزدار بێ). (٢٩٠٠٠٥٨٠٦)

## (١١٧)

**(لە حکومەتی کرماشانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ١٣ی جەمادی دووەمی ١٣٣٣)**

**بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، لە کرماشانەوە بۆتاران، ژمارەی تێلگراف ٦٧، بەرواری ناردن ٨ ی گا/ ١٣ جەمادی دووەم، بەواری گەیشتن شەوی ٩ی گا ١٣٣٣**

بە هۆی جەنابی **فەزلۆلاخانەوە**. مەقامی پایە بەرزی وەزارەتی ناوخۆ. لە وەڵامی تێلگرافی ژمارە ٤٠٦ [١] دا، بە جەنابی موبارەکتان رایدەگەیەنین، کە یەکەم پرسی **شێرخانی سنجابی**[٢] پەنابردنی بۆ کونسوڵخانەی ئەڵمان، هەرگیز پەیوەندی بە حکومەتەوە نەبووە و پەیوەندی بە پرسی نێوان عەشیرەتی **دەلۆی عوسمانی** و **سنجابییەوە** هەیە، کە **حوسێن بەگ** کردوویەتی بە دەسپێکی هاتنی خۆی بۆ کرماشان و بە جیدی بەدواداچوونی بۆ دەکات. بە تایبەتی ئەمڕۆ لەگەڵ زانا ناودارەکان کۆبۆتەوە و لەو بارەوە دانووسانی لەگەڵ کردوون، بڕیارە بە هۆی ئەوانەوە دڵنیا بێت و واز مانگرتن بێنن. ماوەیەکە لەگەڵ شابەندەرخانە لەم بارەیەوە خەریکی گفتوگۆم، تا بڕیارێك بۆ چاککردنی ئەم پرسە بدرێت. ئاشکرایە تایفەی **سنجابی** هەمیشە خزمەتگوزار و ملکەچی دەوڵەت بوون و لەلایەن حکومەتەوە بەتەواوی خۆشەویسەتییەوە مامەڵەیان لەگەڵ دەکرێ. هەروەك کاربەدەستانی باڵای دەوڵەت فەرموویانە، کە لەم رووەوە هەوڵی کاریگەر دەدەن، تا لەگەڵ سەفارەت دانووسانی پێویست بکەن و پێویستییەکانی چارەسەر کردن و کۆتایی هێنان بەم ئاژاوەیە دابین بکەن. **١٤** جەمادی دووەم، ژمارە **٦١ ئەمیر موفەخەم**.

(ك١٢/٣٢٧١)

---

١- لەم بەڵگەنامانەدا بەدی نەکرا.

٢- مەشهورە بە صمصامولمەمالك.

## (١١٨)

**(لە حکومەتی کرماشانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ١٦ی جەمادی دووەمی ١٣٣٣)[١]**

**بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، لە کرماشانەوە بۆتاران، ژمارەی تێلگراف ١٠٥، بەرواری ناردن ١١ ی گا/ ١٦ جەمادی دووەمی، بەرواری گەیشتن شەوی ١٢ی گا ١٣٣٣**

مەقامی وەزارەتی پایە بەرزی ناوخۆ، هەر شکۆدرا بێ. لەمەڕ پرسی سنجابییەکان، کە بەردەوام بە خزمەتتانم ڕاگەیاندووە، لەلایەن حکومەت و دەوڵەتەوە هەرگیز سەغڵەت ناکرێن، هەموو جۆرە ئامرازێکی دڵنیا کردنەوەی ئەوانم دابین کردووە، ئەوەی هەیە تەنیا ئەوەیە کە شابەندەرخانە بە پێی وتەی حوسێن ڕەئوف دەڵێ: لەبەر ئەوەی پەنای بۆکونسولگەری ئەڵمان بردووە، چارەسەر کردنی ئەم کارە مەحاڵە، زەحمەت تر دەبێت. کونسوڵی ئەڵمانیش بە نووسراوی شابەندەرخانە نەبێ، ڕێگەی دەرچوونی نادات. لەم ڕووەوە ئێستا دیبلۆماسی ئەڵمان و شابەندەرخانە بە تەواوی ناکۆکن، بەم شێوەیە ئەم مەسەلەیە بە هەوڵەکانی حکومەت چارەسەر ناکرێ. **١٦** جەمادی دووەم.

**ئەمیر موفەخەم.**

(ك١٠/٢٣٧١).

١ - وەزارەتی ناوخۆ بە پێی نامەی ژمارە٣٠٠/٤٧٥ بەرواری ١٧ ی جەمادی دووەمی ١٣٣٣، دەقی ڕاپۆرتی خوارەوەی ( بەڵگەنامەی ژمارە١١٨) ی ناردووە بۆ وەزارەتی ناوخۆ و ڕایسپاردووە کە (...لەگەڵ شوێنی پێویست گفتوگۆ بکەن و دەرئەنجامەکەشی بە زووترین کات بە وەزارەتی ناوخۆ ڕابگەیەنن...) تا وەڵامی تێلگرافی ئەمیر موفەخەم بدرێتەوە. (ك٩/٣٢٧١)

## (١١٩)

**(لە حكومەتی كرماشانەوە بۆ سەرۆكایەتی وەزیران، ١٦ جەمادی دووەمی ١٣٣٣)**

**بەڕێوەبەری تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، ژمارەی نووسراو ١٦، لە كرماشانەوە بۆ تاران، ژمارەی تێلگراف ٧٦،بە رواری ١١ی گا/ ١٦ جەمادی دووەم، بەرواری گەیشتن شەوی ١١ ی گا ١٣٣٣.**

بەهۆی جەنابی **فەزلوڵلاخان**. مەقامی پایەبەرزمان، حەزرەتی ئەشرەف، جەنابی سەرۆك وەزیران، هەر شكۆدار بێ. بابەتەكە زۆر گرنگ و بەپەلەیە، دەبێ راستەوخۆ بە خزمەتتانی بگەیەنم، ئەگەر كاتژمێرێك دوا بكەوێ، دەبێتە هۆی پەشیمانی گشتی و كێشەی سەختی لێدەكەوێتەوە. پێویستە حەزرەتی ئەشرەف پێش نیوەڕۆ كاتژمێرێك تەشریف بێنن بۆ تێلگرافخانە، تا پێش سەرهەڵدانی هەر رووداوێك، كە نەكرێ پێشی پێ بگیرێ، بابەتەكە بە خزمەتتان رابگەیەنم. بەیانی رۆژی شەممە **١٦** ی جەمادی دووەم، **ئەمیر موفەخەم**.

(ك١٣٣٩/٤)

## (١٢٠)

**(لە حكومەتی كرماشانەوە بۆ سەرۆكایەتی وەزیران، ١٦ جەمادی دووەمی ١٣٣٣)**

**بەڕێوەبەری تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، ژمارەی نووسراو ١٦، لە كرماشانەوە بۆ تاران، ژمارەی تێلگراف ٧٦، بەرواری ١١ی گا/ ١٦ جەمادی دووەم، رووبەڕوو ١١ ی گا ١٣٣٣.**

بۆ حەزرەتی ئەشرەف جەنابی سەرۆك وەزیران، هەر شكۆدار بێ. دوای رێز و حورمەت، سەرنجی مۆبارەكتان بۆ گرنگی بارودۆخی ئەمڕۆ رادەكێشم و داواكارم بە راوبۆچوونە قووڵەكانتان چارەسەرێكی بەپەلە بدۆزنەوە. لەگەڵ هاتنم پرسە ناكۆكی لەسەرەكانی سەر سنوور و دەسدرێژییەكان، بێ ئەوەی تاكە وشەیەكم پەڕاندبێ، لە ئەنجومەنی پیشوودا رامگەیاندووە، وەلێ دڵنیام حەزرەتی ئەشرەف دەرفەتی ئەوەی نەبووە چاویان پێدا بخشێنێ و پێداچوونەوەیان بۆ بكات. بەڵام بە مسۆگەری بابەتەكە روون و ئاشكرایە و پێویستی بە

روونکردنەوە نییە، لەلایەکی تر بە باشی ئاگاداری ئاژاوەی ناوشار و بارودۆخی ئێستای کرماشانن و لەو تێلگرافەی بە خزمەتتانم گەیاندووە هۆکارەکانی ئەم رووداوە و بناغەی ئەم کەموکوریانەت زانیوە. گەورەترین کەموکوڕیی کە بە هیچ شێوەیەك چارەسەری ناکرێ، بێ پارەییە، ئەگەر تێکڕای ئەم گرفتانەش چارەسەر بکرێن، بە پەنجا هەزار تمەن قەرز و گەندەڵییەوە ناتوانم لەسەر پێ راوەستم و دیسانەوە بۆ بەرژەوەندی دەوڵەت و خێرخوازی، بە سەرنجدانی ئەوەی کە لەشاردا خراپەکاری و ئاژاوەی ناوخۆ نەبێتە سەرباری کەم وکوڕییەکان، بەپەلە ئۆردو و سوارەکانیانم بردۆتە یەك قۆناغە رێ دوور لە شار، من لە تێلگرافخانە چاوەڕوانی جەنابتم، فەرمان بدەن چیبکەم و، بۆ ئەوەی دەوڵەت کات و دەرفەتی هەبێت، چوار شەو لە دەرەوەی شار چاوەڕوان دەبم. ئەگەر گەیاندنی بەپەلەی پارە و نەهێشتنی گرفتەکان، بۆ دەوڵەت کارێکە دەکرێ ئەنجام بدرێ و بەندەتان بۆ بەڕێوەبردنی کاروبارەکان پێویستە، بەملکەچی تەواوەوە ئامادەم، ئەگەر رایەکی ترتان هەیە و رێوشێنێکی ترتان دیاری کردووە، هەرچی زووە چارەسەری یەکلایی دیاری بکەن و پتر کاروباری دارایی شار و سەرسنوور بە خراپی مەهێڵنەوە. لەم چەند رۆژەی نەبوونی مندا رەنگە **موعتەصەم ولمولك** جێگری حکومەت لە شار دابنێم، هەروەها هەرکەسێك لە سەرۆك فەرمانگەکانی دەوڵەت یا هەرکەسێکی شارە کە بە باش دەزانن خێرا دایبنێن، راشکاوانە بە خزمەتتان رادەگەیەنم، لەو کاتەوە کە شار بەجێدەهێڵم، هیچ جۆرە بەرپرسیارییەکم لە ئەستۆ دا نییە و پێویستە ئەم پرسە هەرچی زووە لەلایەن دەوڵەتەوە بە یەکجاری یەکلایی بکرێتەوە.

**ئەمیر موفەخەم**. (ك١٢,١٣/١٣٣٩).

## (١٢١)

**(له حکومەتی کرماشانەوە بۆ میرزا سلێمانی مەیکەدە)**

**بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، لە کرماشانەوە بۆ تاران، رووبەڕوو[١] ١٣٣٣**

بۆ خزمەتی جەنابی **میرزا سلێمان خان**[٢] ، هەر بەختەوەر بێ، دوای سڵاو و دلسۆزی لە لوتفی جەنابتانەوە زۆر خۆشحاڵم، بە تایبەتی کە بەرێزتان لایەنی گفتوگۆن، ئینشائەڵڵا زووتر بە ئەنجام بگەین. بابەتەکان هەر ئەوانەن کە بە درێژی بە خزمەتی سەرۆك وەزیرانم راگەیاندووە و بێ گومان ئەمڕۆ وەڵامی یەکجارەکی ناگات. وەلێ لەبەر ئەوەی لەگەڵ ئوردو وەرێکەوتووم و ئەم شەویش ناچارم بڕۆم بۆ ئۆردوگا و چاوەڕوانم هەرچی زووتر وەك پێویست چارەسەر دیاری بکرێت، تا کاروباری مەملەکەت هەروا بە شێواوی نەمێنێتەوەو گیرو گرفت دروست نەبێت. **ئەمیر موفەخەم.**

(ك٩/١٣٣٩).

## (١٢٢)

**(له حکومەتی هەمەدانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ١٦ جەمادی دووەمی ١٣٣٣)**

**بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، لە هەمەدانەوە بۆ تاران، ژمارە ١٥٢، بەرواری ١٠، بەرواری گەیشتن ١٠ی گا ١٣٣٣).**

---

١- بێ بەروارە، وەلێ بە گوێرەی ناوەرۆکی تێلگراف و ژمارەی تۆمارکردن، دەبێ بەڵگەنامەکە لە دەوروبەری ١٤ بورجی گا دەرچوو بێ.

٢- رەنگە مەبەست میرزا سلێمان خانی مەیکەدە بێ، کە لەو سەردەمەدا پۆستی جێگری وەزارەتی ناوخۆی لە ئەستۆ دابووە.

مەقامی وەزارەتی پایە بەرزی ناوخۆ، هەر شکۆداربێ. تێلگرافی موبارەکی ژمارە **١٦٩** بەرێزتانمان زیارەت کرد[١]، **مسیۆ فۆخت** و **مسیۆ پاشن** ئەو دوو کەسە ئەڵمانییەن کە پێشتر لە ژمارە **٢٧** دا بە خزمەتانم راگەیاند. مسیۆ فۆخت لە هەمەدانەوە رۆیشت بۆ مەلایەر تا بچێت بۆ لای وەزیر موختار. مسیۆ پاشن لەبەر نەخۆشی لە هەمەدان مایەوە، **مسیۆ ڤیبەریش** کە خەڵکی سویسرایە، نوێنەری کۆمپانیای فەرشی ئەڵمانییە، نووسیومانە، لەلایەن وەزیر موختارەوە **پاشن شانسل** بووە بە کەنسوڵی دەوڵەتی ئەڵمان و، مۆڵەتی بەرزکردنەوەی ئاڵایان پێداوە. لەم بارەیەوە لەلایەن وەزارەتی دەرەوە، هیچ زانیاریی و فەرمانێك بە کارگێڕی نەگەیشتووە، تکایە ئەو بابەتە بە وەزارەتی دەرەوە راگەیەنرێ و فەرمانی هەنگاوی پێویست بدەن، تا بەرەبەرە گرفتی سەخت نەیەت پێش. **١٦** جەمادی دووەم، ژمارە **٢٨**، **عەباس سالار لەشکر**.

(٢٩٠٠٠٥٨٠٥).

## (١٢٣)

**(لە وەزارەتی ناوخۆوە بۆ حکومەتی کرماشان، ١٨ ی جەمای دووەمی ١٣٣٣)**

**وەزارەتی ناوخۆ، ژمارەی تۆماری نووسراو ٣٢١٦/٥٠٧، لە تارانەوە بۆ کرماشان، بەرواری ١٨ ی جەمادی دووەم ١٣٣٣)**

حکومەتی پایە بەرزی کرماشان، تێلگرافی ناڕاستوخۆی جەنابی باڵامەقام گەیشت، وەك ئاگادارن دەستم بە کار کردووە[٢]، ئینشائەڵڵا تا رۆژی سێ شەممە لە ئەنجومەنی بەڕێزی وەزیران سەبارەت بە بابەتەکاتی جەنابی پایەبەرزتان بڕیاری یەکجارەکی دەدرێ و ئەنجامەکەی بە خزمەتی بەڕێزتانی رادەگەیەنم. ناردنی لە **١٣** ی **گا**.

(ك١٣٣٩)

---

١ - بەڵگەنامەی ژمارە ١١٧.

٢ - لەکتێبی دەوڵەتەکانی سەردەمی مەشروتییەتدا لە نووسینی جەمشیدی زرغام بروجەنی (تاران لاپەڕە ٩١) کابینەی عەین و لدەولە لە ١٦ ی جەمادی دووەمی ١٣٣٣ بە ئەنجومەن ناسێنرا. عەبدولحوسەینی فەرمانفەرما پۆستی وەزارەتی ناوخۆی لەئەستۆ دابوو.

## (١٢٤)

**(له به ڕێوەبەرایەتی پۆلیسەوە بۆ وەزارەت ناوخۆ، ٢٤ ی جەمادی دووەمی ١٣٣٣)**

**بەڕێوەبەرایەتی ڕێکخراوەکانی دەوڵەتی ئێران، بەرواری ١٩ ی بورجی گا(٢٤ ی جەمادی دووەمی ١٣٣٣)، ژمارەی ٦٦٢.**

مەقامی پایە بەرزی وەزارەتی ناوخۆ، هەر شکۆدار بێ. بە هۆی ئەو ڕاگەیەنراوەی ئێستا لەبەر دەست دایە، بە پێی تێلگرافی بریکاری سەرکردەی فەوجی حەوتەم، بە جەنابی موبارەکتان ڕادەگەیەنم، کە **٢٤٩** کەس بۆ هێزەکانی هەمەدان و **٨٣** کەس بۆ هێزەکانی کرماشان زیاد بووە. لەبەر ئەوە تکا لە حەزرەتی ئەشرەف دەکەم، داوا لە وەزارەتی دارایی بکا بۆ پێدانی بڕی دانەوێڵەی پێویست فەرمان بدا بە ئەمیندارانی دارایی هەمەدان و کرماشان. وێڕای ئەوە تکایە ڕێز و حورمەتی بێ کۆتاییمان پەسەند بکەن.

ئیدوال جێگری سەرۆکایەتی ڕێنماییەکانی بەڕێوەبەرایەتی پۆلیسی دەوڵەت.

(ك١/٩١٩)

## (١٢٥)

**(له سەرۆکانی کەڵهوڕەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ٥ ی ڕەجەب ١٣٣٣)**

**بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، ژمارەی نووسراو ١٤٠، لە کرندەوە بۆ تاران، ژمارەی تێلگراف ٢، بەرواری ٢٩ ی (گا/ ٥ ی ڕەجەب)، بەرواری گەیشتن شەوی ٣٠ گا ١٣٣٣.**

مەقامی پایە بەرزی سەرۆك وەزیران، هەر شکۆدار بێ. پێنج کۆپی وەزارەتی ناوخۆ، ڕۆژنامەی **نەوبەهار**، **عصری ئینقلاب**، **شورا**، **ئیرشاد**. گیانمان بە قوربانتان، هەمیشە ملکەچی فەرمانەکان و بەندەی ملکەچی ئەعلا حەزرەت شەهریاری شاهنشای ئێران بووین و هەین، بە باشی ڕوونە کە ئۆردووی ئیتحادی ئیسلامی نیازی خێرخوازی و کورتکردنەوەی دەستی ڕووس و ئینگلیزە، لە داوێنی نیشتمانی پیرزی ئیسلامی. بەداخەوە بە هۆی خزمەت کردن بەم مەبەستە پیرۆزە، بەندە سەرزەنشت دەکەن. لە بری ئەوەی گیانفیداتان لە یاوەری و یارمەتی

ئۆردوی ئیتحادی ئیسلامی دابڕن، نازانین چ زیانێکی لێدەکەوێتەوە ئەگەر موسوڵمانان وەك برا لە خاڵێکدا یەکتر بگرنەوە و بیانەوێ ئەم وڵاتە ئیسلامییە لە گوشاری ستەمکارانەی رووس و ئینگلیز رزگار بکەن. باشترە بە هۆی هەڵبژاردنی کاربەدەستێکی موسوڵمان و نیشتمانپەروەر و ناردنی هێزێك کە لەگەڵ مەبەستەکانی ئێستای ئێمە دابێ، ئینشائەڵڵا دەستێوەردانی رووس و ئینگلیز ناهێڵین و لە بری ئەوە تۆڵەی ئەو تاوان و دڕندایەتییەیان لێدەکەینەوە. کە دەڵێن دەوڵەتی ئێران بێلایەنە، چۆنە لە مەشهەدەی موقەدەسەوە تا دەڤەری ئازەربایجان و کەناراوەکانی **کەنداوی فارس** و **موحەممەرە** لە ژێر داگیرکاری رووس و ئینگلیز دایە و بۆچی لە نیشتمانی موسوڵمانان وەدەریان نانێن و ئەو حکومەتانەی[1] لە لایەن دەوڵەتەوە دراون بە ویلایەت و ئەیالاتەکان جگە لە جەور و ستەم، چ بیریکیان لەم میللەتە بەدبەختە کردۆتەوە؟ کە لوتف و مەرحەمەتتان کردووە و بەڵێنتان داوە لە داهاتوودا شتێکم بۆ بکەن، زۆر سوپاستان دەکەم ، وەلێ ئەو کاتەی لە ژێر زنجیری دیلی دابووم بۆچی سەریکتان نەدام؟[2] جێگەی داخە لە کاتێکدا لە ئێران کەس گیان و ماڵی خۆی لە رێگەی دلسۆزی ئەم میللەتە ماڵوێرانە دانانێ، چۆن خۆشەویستی و ئەرك و غیرەتی دینی، رێگە دەدات من لە بەدەستهێنانی ئەم شانازییە بێ بەش بکەن؟ بە کورتی من موسڵمانم و بۆ پێشکەوتنی ئیتحادی ئیسلامی تا زیندووبم هەوڵ دەدەم و لە خواوەندی مەزن داواکارم هەمووومان بەرەو رێگای هەق رێنمایی بکات. **سلێمان و عەباس کەڵهوڕ**.

(ك١٠٨٥/١٤٦و ١٤٧)

---

١- لە دەقە ئەصلییەکەدا: (حکومەتان) ە.

٢- ئەمیر موفەخەم لەو کاتەی ویلایەتی کرماشانی بە دەستەوە بوو ژمارەیەك سەرکردەی هۆزی کەلهوڕی بەند کردبوو.

## (١٢٦)

**عەریزەی مەجیدخان سالار سوڵتان سەرۆکی تایفەی باجەلان)**[1]

قوربانی وجوودی موبارەکتان بم. بە خزمەتی جەنابی پایەبەرزتان رادەگەیەنم، سوپاس بۆ خوا کە ئەمڕۆ سەروەر و حوجەتی یەکەمی موسوڵمانانن، پێویست بوو زاتی ئەوە بکەم، باسی حاڵی خۆم کە ئەو کارەساتەی کۆمیسار و سەربازەکانی عوسمانی بەسەریان هێنام، بەخزمەت جەنابی موبارەکتانی رابگەیەنم. هەرچەندە خودی بەندە و ویلایەتی پایەبەرزیش رووداوی ماڵوێرانی بەندەی بە نووسراو و تێلگراف بە خزمەت کاربەدەستانی پایە بەرزی دەوڵەت راگەیاندوە، وەلێ لە دنیای پارێزگاری ئیسلامەتی دا، کە ئەرکی حەرزەتی باڵایە، راپۆرتی ئەو بەسەر هاتەم بە خزمەت ئەو وەکیلانەی خەڵکی کرماشان بگەیەنی کە لە **دارالخلافەی** تارانن، تا لە کاربەدەستانی دەوڵەت بپرسی بەندە چاری چییە و گفتوگۆیان لەگەڵ بکەی و بڵێی تاکەی بەندە لەم زەلیلی و پەرێشانی و بێ پارەییدا، لەگەڵ ماڵ و منداڵی رووت و قوتدا لە شاردا وێڵ و سەرگەردان بم، لەبەرئەوەی جەنابی موبارەکتان بە باشی ئاگادارن لەوەی بەسەر بەندە هاتووە، بابەتەکەتان لە خوارەوە تەنیا بۆزانین پێڕادەگەیەنم.

پارساڵ، لەو کاتەدا کە کۆمیسیۆنی هەردوو دەوڵەت سنووریان دیاری کرد، تێکڕای دەڤەری **قۆرەتو** و **کانزای نەوت** کە لەژێر دەستی بەندە دابوو، بەر پشکی عوسمانییەکان کەوت، تەنیا ئەو لادێیەی خۆمان و دوو لادێی تر، لای قەسری شیرین بۆ بەندە مایەوە. ئەمساڵ لە دوو مانگی رابردوودا، عوسمانییەکان دوو ناوەندی سەربازییان لە ناوچەی کانزای

---

١ - ئەم عەرز وحاڵە لە لە ٧ ی رەجەبی ١٣٣٣، لەلایەن رەحیمی موجتەهید پێشکەش بە وەزارەتی ناوخۆ کراوە. (ك١/٧٨٧٨) وەزارەتی ناوخۆش بە نووسراوی ژمارە ٤٣١١/٩٢٤ بەرواری یەکەمی سەرەتان ١٣٣٣ وەڵامی مەجیدخان سالار سوڵتانی داوەتەوە کە (... دەوڵەت بۆ قەرەبوو کردنەوەی ئەو زەرەرو زیانەی بەرتان کەوتووە، هەنگاوی پێویست هەڵدەگرێ، لەمەڕ مووچەی سوارەکانیش رێنمایی پێویست دراوە بە حکومەتی پایەبەرز، کە سەرێکیان بدە تا کاروبارەکان جێبەجێ بکەن). (٨٧٨).

نەوت دامەزراند، کە نیو کاتژمێر لە دێیەکەی بەندەوە دوورە، کومیساری ئۆردوی کانزای نەوت، کە ناوی عەلادین بەگە، بە نهێنی ویستبووی هۆز و عەشیرەتە ئێرانییەکانی خۆمان هانبدات، چ ئەوانەی دانیشتووی گەرمێن بوون و چ ئەوانەی هاتبوونە لەوەڕگای زستانە و وتبووی دەوڵەتی ئێران و عوسمانی بە تەواوی یەکیان گرتووە و ئێوەش وەرن لەگەڵ ئێمە یەکبگرن، کە هەردوولامان موسوڵمانین و بڕۆن بۆ جیهادی دینی دژی کافران. وردە وردە دەیویست گفتوگۆ لەگەڵ بەندەش بکات و داوای بەڵێنی دیداری لێکردم، بەندەش بە پێی ئەرکی نۆکەریم و ئەمەگناسیم بۆ دەوڵەتی پایەبەرز، راپۆرتی باسی ئەو دیدارەم بە تێلگراف بە ویلایەتی پایەبەرز هەرپایەدار بێ راگەیاند و لەلایەن حەزرەتی جەنابی ئەمیر موفەخەم بە تێلگراف رێگەیان پێدام دیداریان لەگەڵ بکەم. بەندەش دوای ئەوەی مۆڵەتم وەرگرت رۆیشتم، کۆمیسار **بەهادین بەگ**م بینی، هەرچەندە هانی بەندەی دا، وەلێ بەندە لەگەڵ راگەیاندنی بێلایەنی دەوڵەت و میللەتی ئێران وتم: هەر کاتێك ویستت من یاوەرت بم، مۆڵەتی دەوڵەت و ویلایەتم بۆ وەربگرە ئەوسا ئامادەم، ئەگینا ئەوە مەحاڵە و تا گیانم لەبەر بێ لەگەڵ بێلایەنی ئێراندا دەبم. ئەویش تێگەیشت کە دەستی لە کەمەری بەندە گیر نابێ (واتە هیچی لەگەڵ بەندە پێناکرێ) بێ دەنگ بوو، لەبەرئەوەی برایەکان و هەموو تایفەکەم لە سنووری ئەودا بوون، بە دوای **حەمیدخانی** برامی دا نارد و بردی بۆ کانزای نەوت ناو ئوردووەکەی خۆی، خەریکی دنەدانی ئەو بوو. دوای ئەو گفتوگۆیە کە والی ویلایەتی پایەبەرز هاتن بۆ سەر سنوور. هەرکە گەیشتنە سەرپوڵ بە دوایاندا ناردم. بەندەش خێرا بە خزمەتی گەیشتم. لەبەر ئەوەی جێگایەك بۆ بەندە نەمابوو بە پێ فەرمانی وەزارەتی ناوخۆ ناوچەی **جگەرلو**یان بۆ بەندە دانا، کە تایەفە و برایەکەم لە هاوینی داهاتوودا دوای هەڵگرتنەوەی بەروبووم بگوێزمەوە بۆ جگەرلو و لەوێ نێشتەجێ بن. سوارە و پیادەی دەوڵەتیان چەك کرد و لە گەڕانەوەی بەندە بە شەو کۆمیسارێك دووبارە حەمیدخان بانگ دەکا بۆ کانزاکە و زۆر ئەشکەنجەی دەدات تا نووسراوی هاوڵاتیبوونی ئەوان مۆر بکا و پیادەی عوسمانی ببات و تفەنگ وەربگرێت. ئەویش وەڵام دەداتەوە و دەڵێ ئێمە ئێرانین و هەرگیز نابینە هاوڵاتی دەوڵەتێکی تر، ئەوەندە دەرفەتمان پێبدەن دوای هەڵگرتنەوەی خەرمان دەڕۆینەوە بۆ ناو خاکی ئێرانی خۆمان. کۆمیسارەکە یەکسەر ناوبراو لەگەڵ دوازدە خانی خانەدانەکان زیندانی دەکات، سێ شەو لە زیندان دەمێنێتەوە و دواتر بەشە و حەمیدخان لەگەڵ حەوت خان لە

کەسەکانی من لە سێدارە دەدەن و شەهیدیان دەکەن. بەیانی بەندە بێ خەبەر هاتبووم بۆ قەسر بۆ تێلگرافخانە تا تێلگرافێك بۆ ویلایەت بکەم، هەواڵ گەیشت کە ئۆردووی عوسمانی هێرشی هێناوە بۆ سەر دێیەکەتان، هەمووی تالآن کردووە و براکەتی لەگەڵ حەوت کەس لە سێدارە داوە. لەو گفتوگۆیە دابووین، هەواڵ گەیشت کە خاوخێزانی بەندە بە پێی پەتی لە ئاوایی وەدەرکەوتوون و هاتوون بۆ قەسر. لەبەر ئەوە ناچار لەگەڵ ئۆردو هاتووین و یەك دیناریشمان پێ نییە خەرجی بکەین. تالآن کراوین و لەناو شار وێڵ و سەرگەردانین. چل سوارم لەگەڵە و نازانم چیبکەم، بەڵام لە سەروبەندی هاتنی عوسمانییەکاندا هەرچەند هاوارم کرد و تیلگرافم بۆ ویلایەت نارد، یا هێزم بۆ بنێرێ یا ڕێگە بە خۆم و عەشیرەتەکان بدات نەهێڵین ئۆردوی عوسمانییەکان دەسدرێژی بکەن و بێرەدا تێپەڕن، چونکە لە لایەن دەوڵەتەوە مۆڵەتی نەبوو مۆڵەتیان بە بەندەش نەدا. ئەمە باسی حاڵ و بەسەرهاتی بەندەیە و لەو ڕۆژەوە کە لەگەڵ ماڵ و منداڵم هاتووم بۆ ناو شار، چ لەلایەن خۆمەوە و چ لەلایەن ویلایەتی پایەبەرزەوە تێلگراف بۆ وەزارەتی ناو خۆ و شوێنی تر کراوە و هێشتا وەڵام نەدراوەتەوە، تا بەندە بزانێ چی بکات. بەم پێیە پێویست بوو بە حەزرەتی موبارەکتانی رابگەیەنم، کە بەندە بەم ماڵ وێرانییەوە، کە خۆم و براو تایفەم کردۆتە قوربانی دەوڵەت و میللەت و نیشتمانی خۆشەویست و پیرۆزی خاکی ئێران، ڕێگەیەکم بۆ دیاری بکەن چیبکەم. بۆ غوڵام بە فیرۆ نارِوا، چاوەڕێی ڕێنمایی تەواوە، پتر لەوەش جەسارەت کردنە. گیان فیدای نیشتمان: **مەجید باجەلان** (مۆرکراو) **مەجید سالا ولسوڵتان**.

(ك ٨٧٨)

## (١٢٧)

**(لە جکومەتی کرماشانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ٧ ی ڕەجەبی ١٣٣٣)**

**بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەت پایە بەرزی ئێران، لە کرماشانەوە بۆ تاران، ژمارەی تێلگراف ٣، بەرواری ناردن ١، بەرواری گەیشتن ا جوزای ١٣٣٣)**

مەقامی وەزارەتی پایە بەرزی ناوخۆ، وەك پێشتر راگەیەنرا بوو، مووچەی لەشکری **ساخلوی** ئێرە دواکەوتووە، سەرەڕای ئەوە بەڕێوەبەرایەتی پۆلیسی ئێرەش پارەیان پێویستە،

چونکە دارایی باج و بەخشین و دەسکەوت و شتی تر کە وەریدەگرن، دیار نییە چۆن سەرف دەکرێ و چەند رۆژ لەمەو پێش وەك فەرمانی وەزارەتی پایە بەرزی دارایی، لێرە داوای لیستم کرد(مەبەست لیستی داراییە/ وەرگێڕ) کەچی نەیاندامێ و وتیان ناتوانین ناڕاستەوخۆ لیست بدەین، بۆ ئەمەش گفتوگۆم لەگەڵ کاپیتان **سەن سۆن** کرد، رەئیان ئەوە بوو کەسێك لەلایەن بەڕێوەبەرایەتی پۆلیس و یەکێکیش لەلایەن کەفیلی کاروباری نۆکەرتان، بە کاروباری داراییدا بچنەوە. ئەگەر پەسەندیان کرد، مۆڵەتم پێ بدەن تا دەسبەکار بم و ئەوەی لە دارایی دەستمان کەوت، بۆ کاروباری دەوڵەتی خەرجی بکەین. **٧** ی رەجەب ولمورەجەب، ژمارە **٣٥**، **سەردار جەلال**.

(٢٤٠٠٠٤٥٥٢)

## (١٢٨)

**(لە حکومەتی هەمەدانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ٧ی رەجەبی ١٣٣٣)**

**بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایەبەروی ئێران، لە هەمەدانەوە بۆ تاران، ژمارەی تێلگراف ٢٠، بەرواری ناردن ٢، بەرواری گەیشتن ٢ ی جوزای ١٣٣٣**

مەقامی پایە بەرزی وەزارەتی ناوخۆ، سایەی هەر بەردەوام بێت. دوێنێ لە پەراوێزی ژمارە **٣١** دا، دەرکەوتنی چەند قۆزاقی رووس و وروژانی خەڵك بە هاتنی ئەوان، بە خزمەتتانم راگەیاند. ئەمرۆ کونسولی رووس لە کرمانشان بە هۆی وەرگێڕەوە پەیامێکی زارەکی نارد، کە ئەمڕۆ پلەدارێك بە خۆی و سی و سێ سوارەوە کە فەرمانبەرەکانی کونسولگەری رووسن لە کرماشان، کاتژمێرێك پێش رۆژئاوان بوون دێن. لەم کاتەدا بە باشم زانی جەنابی موبارەکتان لە تێکڕای کاروبار و بارودۆخ و راوبۆچوون و ترسو لەرزی گشتی، ئاگادار بکەمەوە و هەر بەشێکی جێگای سەرنجتان بێ و لەلایەن بەرپرسانی کاروبارەوە بەپەلە چارەسەرێك بدۆزرێتەوە تا دواتر گرفت نەخولقێنن. بەگشتی ترسی خەڵکەکە لەوەیە هەندێك لە رووسەکان بێن و لە هەمەدان نیشتەجێ بن، شابەندەرخانەی عوسمانیش کە پەیامی بۆ زۆربەی زانایان ناردووە، یا رێگە لەهاتنی ئەو رووسانە بگرن، کە دێن بۆ هەمەدان، یا داوا لە حکومەت بکەن، یا من خەریکی کۆکردنەوەی هێز بم لە کوردستان. ناوبراویش ژمارەیەکی

هێناوه و دواتر رووسەکانیش ژمارەی هێزەکانی خۆیان زیاد دەکەن و هەمەدانیش وەك **سەڵماس** دەبێتە مەیدانی جەنگ. دیارە ئەم پەیامەی کونسوڵی رووس ناردوویەتی قەناعەت بە بەندە دەکات، وەلێ چۆن ئەو خەڵکە قەناعەت پێ بکەم کە بەرهەڵستکارن، ئەگەر ئەوانە بۆ کونسوڵگەری کرماشانن، بۆ لە هەمەدان نیشتەجێ دەبن. ئەگەر بۆ کونسوڵگەرین کە کونسوڵی نوێ بە پێی راپۆرتی خۆی هێشتا نەگەیشتۆتە قەزوین. ئەگەر ئەمانە وتەی کونسوڵگەرین، بۆ چاوەڕوان نەبوون تا کونسوڵ دەگاتە **قەزوین**. لەگەڵ کونسوڵ وەرن تا یەکسەر بڕۆن بۆ کرماشان.

لەم ماوەیەدا کە لە هەمەدان بوون ئاسایشی کاربەدەستانی بیانی و بیانییەکان لە هەموو روویەکەوە پارێزراو بووە، و بە وتەی خۆیان یەك توز ناخۆشییان نەدیوە ، منی نۆکەرتان، شەو و رۆژ ساتێکیش غافڵ نەبووم، ئێستاش کە خەڵك بە گشتی پتر وروژاون و تا ئەو ئەندازەیەی لە توانای نۆکەرتان دابووە، بەهەر زمان و گوتارێك هەوڵم داوەر رێگە نەدەم، ئێستاش بۆ ئەوەی[1] کاتی و خراپتر دۆزینەوەی رێگاچارەیەکیش لەلایەن کاربەستانی باڵاوە پێویستە، کە لە ئێستاوە تا ئەوکاتەی کونسوڵەکانی **کرماشان** و بەرپرسی بانکەکان دەگەڕێنەوە، ئەم سی و سێ کەسە بگەڕێنەوە بۆ **قەزوین**، لەوێ بمێننەوە تا ئەو رۆژەی کاربەدەستانی بیانی کرماشان دەیانەوێ بڕۆن، لەگەڵ ئەوان وەرێکەون. ئەگینا خەڵکەکە بەهیچ شێوەیەك ئارام ناگرن و ئەگەری ئەوە هەیە مانگرتنی گشتی رووبدا، کاربەدەستانی باڵای کاروبار لەم کاتەدا کە هەزاران ئەرکی سەرەکیان لەبەردەمە، تووشی دەردەسەری بکات. ژمارە **٣٢**، **٧** ی رەجەب، **عباس**.

**(٢٩٠٠٠٥٤٨)**

---

١- وشەیەك لە رەمزەکەدا نەدۆزرایەوە.

## (١٢٩)

**(لە حکومەتی هەمەدانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ١٠ی رەجەبی ١٣٣٣)**

**بەرێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەروی ئێران، لە هەمەدانەوە بۆ تاران، ژمارەی تێلگراف ٧٨، بەرواری ناردن شەوی ٥، بەرواری گەیشتن ٥ ی جوزای ١٣٣٣**

مەقامی پایە بەرزی وەزارەتی ناوخۆ، سایەی هەر بەردەوام بێت. ژمارەیەك سوارەی رووس رۆیشتوون بۆ **نەغەدە**، هیچ هەواڵێکی گەڕانەوەیان نییە، بە هۆی تێلگرافی هیوا بەخشەوە خەڵك ئارامن، بەڵام ئەگەر بەپەلە هەولێك بۆ گەڕانەوەی ئەوان نەدرێت، وەك لە تێلگرافی ژمارە **٣٢** بە خزمەتتان گەیشتووە، کێشەی[1] ئەوتۆی لێدەکەوێتەوە، کە چارەسە کردنیان زەحمەت دەبێت، سوارەکانیش هیچ جۆرە بەهانەیەکیان بۆ نەگەڕانەوەیان نییە. ژمارە **٣٣**، دەهەمی رەجەب، **عەباس**.

(٢٩٠٠٠٥٤٨)

## (١٣٠)

**( لە حکومەت کرماشانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ١١ رەجەبی ١٣٣٣)**

**بەرێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، لە کرماشانەوە بۆ تاران، ژمارەی تێلگراف ٥٢، بەرواری ناردن ٥، بەرواری گەیشتن ٦ ی گا ١٣٣٣.**

مەقامی پایە بەرزی وەزارەتی ناوخۆ. نزیکەی مانگ و نیوێکە مووچەی فەوجی **کەمەرە** دواکەوتووە و رۆژانە کێشە دروست دەکات و تائێستا چەند جار ئاژاوەیان ناوەتەوە و هەر چۆنێك بووە قەناعەتمان پێکردوون، تەنانەت لە بیری ئەوەدا بوون لە شابەندەرخانە مان بگرن، کارێکی وامان کرد واز لەو کردەوەیەش بێنن، ئێستاش کە کاپیتان **سەن سۆن** پیاوی خۆی لە دارایی داناوە، هەرپارەیەك بگات، پێشوەخت مووچەی پۆلیسی لێ هەڵدەگرێ، ئەمەش کێشەکەی قووڵتر کردووە. هێندێك سەرباز، کە ژمارەیان پێنسەت کەس دەبوو و زۆربەیان

---

١- بەڵگەنامەی ژمارە ١٢٨.

مێرمندالْ یا پیر بوون، که هیچیان له دەست نایات، سەرەرای ئەوە، حەفتا سەربازی **زەنگەنە** و نزیکەی حەفتا سەربازی تۆپچیش لێرەن، بەم کەمی پارەو پول و توندڕەوی سەربازەکانەوە، ئەگەر رێگەیەك بۆ وەدەستهێنانی پارە نەدۆزرێتەوە، گیر و گرفت دروست دەبێت، ئەگەر کارێکی وا بکرێ ژمارەیەك پۆلیس، بۆ ئەم پۆلیسانەی ئێستا زیاد بکرێ، تا ژمارەیان بگاتە چوارسەت یا چوارسەت و پەنجا سوارە و پیادە و ئەم سەربازانەش دەرکەن، نزیکەی سەت و پەنجا کەسی گەنج بۆ پاسەوانی دام و دەزگاکانی حکومەت رابگیرێ و ئەوانی تر سەرلەشکر چەکەکانیان لێوەرگرێ و دەریان بکەن. هەرچەندە لەم کاتەدا هێز بۆ ئێرە زۆر گرنگە، بەلام لەبەر ئەو هۆیانەی پێشکەش کران بوونی ئەو سەربازانە نە خێریان هەیە نە قازانج، بەم تێبینییە ئەوە بە خزمەتتان رادەگەیەنن کە هەم بۆتە هۆی بە هەدەر دانی بوجەی لەشکر و هەم پارەیەك دەدرێت بەوان کە هیچ کارێکیان لەدەست نایات. دووەم مووچەی **قەرەسوارانی** رێگای چەمچەمالْ و ناوچەکانی تر دواکەوتووە، ئەگەر بەپەلە نەدرێت، ئەوا رێگاکە چۆلْ دەکەن و کاری پۆستە و کاروانەکان گرفتیان بۆ دروست دەبێت، یا فەرمان بدەن لە ناوەندەوە پارە بگات، یا چارەیەك بدۆزنەوە بۆ لە ناوبردنی ئەم گرفتانە، تا لەم بارودۆخە ناسکەدا کێشە دروست نەبێت. چاوەڕوانی هەولْی بەپەلەین. **١١** رەجەب، **سەردار جەلال**. (٢٩٠٠٠٤٥٥٢)

## (١٣١)

**(لەوەزارەتی دەرەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ١٩ ی رەجەبی ١٣٣٣)**

**وەزارەتی کاروباری دەرەوە، بەڕێوە بەرایەتی نوسراوەکانی عوسمانی، بەرواری ١٩ ی مانگی رەجە و لمورەجەبی ١٣٣٣، ژمارە ٥٠٣، پاشکۆی دریژەی تێلگرافەکە.**

وەزارەتی پایە بەرزی ناوخۆ، لەکارگێڕی دەرەوەی کرماشان تێلگرافێکی رەمزدار لە بەرواری **٧** ی رەجەب بە وەزارەتی کاروباری دەرەوە گەیشتووە، ئەوە دەگەیەنێ کە **حوسێن رەئوف بەگ** باسێکی بۆ حاکمی پایە بەرزی گۆران نوسیوە و هەرەشەی لێکردووە کە لە گەلْیدا بێت. وا درێژەی تێلگرافەکەتان[1] بۆ دەنێرین، بە شێوەیەك کە لە کۆتاییەکەیدا دەبینن

١- بگەڕێوە بۆ بەلْگەنامەی ژمارە ١٣٢.

لە کاتێکی ئاوادا کە سەرۆك عەشیرەتەکان رەزامەندیان بۆ **حوسێن رەئوف** نیشان نەداوە کارێکی باشە و، پێویستە رێ و شوێنێك بگیرێتە بەر کە سەرۆك عەشیرەتەکان لە لایەن کاربەدەستانی دەوڵەتی خۆیانەوە، پشت گوێ نەخرێن وبە هەرشێوەیەك بێ دەسخۆشییان لێ بکرێ، تا گوێ نەدەن ئۆردوی عوسمانی و بە یەکجاری جلەوی دەسەڵات و رابەرایەتی کردنی سەرۆك عەشیرەتەکان لە دەست دەرنەچێ و، دەوڵەت نەکەوێتە بارودۆخێکی خراپتر لە ئەمڕۆ. سەرنجی ئەم وەزارەتە پایە بەرزەتان رادەکێشین بۆ دانانی رێ و شوێنی ورد و پێویست، ئێوەش ئاکامەکەی بە وەزارەتی کاروباری دەرەوە رابگەیەننەوە.

(ك٨٥٤٠/٧٩).

## (١٣٢)

**(لە کارگێڕی کرماشانەوە بۆوەزارەت دەرەوە، ١٩ ی رەجەبی ١٣٣٣)**

**وەزارەتی کاروباری دەرەوە، بەڕێوەبەرایەتی نووسراوەکانی عوسمانی، درێژەی تێلگرافی رەمزداری کرماشان، بەرواری ١٩ رەجەبولمورەجەبی ١٣٣٣، ژمارە ١٤١٣.**

هەر ئێستا نوسراوێك بە پاشکۆی نامەی **حوسێن رەئوف**، لە جەنابی سەردار موعەزەم حاکمی گۆرانەوە بە کارگێڕی گەیشتووە و بەپەڵە داوا دەکات چی بکات. لەبەرئەوەی پرسەکە گرنگ بوو خودی نامەکەی رەئوفمان لە خوارەوە نووسیوە، تا دوای ئەوەی کەوتە بەر سەرنجی موبارەکتان، هەربڕیارێکتان دا بە پەلە وەڵامی ناوبراو دەدەینەوە.

دەقی نامەی **حوسێن رەئوف:**

پایەبەرز و شکۆدار جەنابی ئاغای سەردار موعەزەم، بەخت هەر یاوەرت بێ. دیارە لای جەنابتان ئاشکرایە کە ئێمە بۆ ناسینی دۆست و دوژمنی خۆمان، لێرە ماوینەتەوە. ئێستا بۆ جەنابی پایە بەرزتان پێنشنیاز دەکەم، خودی بەرێزتان و جەنابی **سالار مەنسور** بە پەلە تەشریف بێنن بۆ ناو ئۆردو. ئەگەر لە هاتنتان سەرفی نەزەر بکەن یا بیانوویەك بهێننەوە ئەوا پێچەوانەی پەیماننامەیە و ئەوسا ئێمە بە هەموو هێزمانەوە بەرەو **گەهوارە** وەڕێ دەکەوین و، ئەگەر بوو بە هۆکاری ماڵوێرانیی ئێوە، ئەوا مافی ئەوەتان نییە هیچ بڵێن. چاوەڕوانم بەزوویی وەڕێکەون. **١٤** ی رەجەب سەرداری گشتی لەشکری ئیتیحادی ئیسلامی، **حوسێن رەئوف**.

ئەگەر بەپەلە چارەسەرێکی ناوبراو نەکرێت، ئەوا تێکڕای عەشیرەتەکان بێلایەنی خۆیان دەشکێنن. **١٧** ی رەجەبی. ژمارە **٦٠٤ معازدلەمالك**.

لەگەڵ دەقی نامەکەدا یەکە.

(ك٤٠٨٥/٨٠)

## (١٣٣)

**(لە وەزارەتی ناوخۆوە بۆ وەزارەتی دەرەوە، ٢١ی رەجەبی ١٣٣٣)**

**وەزارەتی ناوخۆ ژمارەی تۆماری نووسراو٥٨٥١/٩٥٧، بەشی نووسراوەکانی رۆژئاوا، بەرواری ٢١ ی رەجەب (١٥ ی جوزا) ١٣٣٣.** بەپەلە. وەزارەتی پایە بەرزی ناوحۆ، نامەی بەرێزتان بە ژمارە **٥٠٣** کە درێژەی تێلگرافی رەمزداری کارگێڕی کرماشانی لەخۆ گرتبوو، گەیشت[1]. چارەسەری ئەم پرسەیان خستۆتە ئەستۆی وەزارەتی ناوخۆ و ویستویانە بەهۆی راکێشانی سەرۆك عەشیرەتەکان، رێگە لەو هەولانە بگرن، بە پێویستمان زانی بە جەنابتانی رابگەیەنین، کە رەئی وەزارەتی ناوخۆش هەر ئەوەیە، کە ئەم پرسانە بە گفتگۆی سیاسی و هەوڵی نەرم و نیانی ئەو وەزارەتە پایە بەرزە چارەسەر بکرێ و رێگە لەمجۆرە دەسدرێژی و زیادەرەویانەی داگیرکاران بگیرێ، دەنا گەڕاندنەوەی **حوسێن بەگ** و یاوەرانی، کە ژمارەیەکی کەمن و لەم ماوەیەدا کارێکی نابەجێ و رەفتارێکی خراپیان بەرامبەر سامان و گیان و ئابڕووی هاوڵاتیانی ئێرانی ئەنجام نەداوە، کارێکی قورس و هەڵە نییە و رەنگە بەهۆی یەکێك لەو عەشیرەتانەوە، کە ئەو دەیەوێ بە هەڕەشە و تەماح و ئامرازی تر رایانبکێشێ، خۆی و هاوەڵەکانی تەنگەتاو بکەن نەتوانن بۆ تەنیا یەك رۆژ لەو سنوورەدا بمێننەوە و دوورنییە تەنیا ئیشارەیەکی وەزارەتی ناوخۆ، تێکڕای ئەم دڕکانە لەسەر رێگا لابەرێ, وەلێ هەموو چاوەڕوانییەکەی وەزارەتی ناوخۆ ئەوەیە کە لە سنووری نەرم و نیانی دەرنەچێ و ئەو سەرکەوتنە بە هۆی هەوڵەکانی ئەو وەزراەتە پایەبەرزەوە دەستەبەر بکرێ. ئەگەر ئەو وەزارەتە بەڕێزە مۆڵەت دەدات و بەباشی دەزانێ، راشکاوانە بۆمان بنووسێ لە ماوەی یەك دوو رۆژدا هەر بە هەمان ئامرازی عەشایری، تێکڕای ئەم کێشانە بنبڕ دەکەین، ئەگینا عەشیرەتەکانی

---

[1] - بگەڕێوە بۆ بەڵگەنامەی ژمارە ١٣١ و ١٣٢.

ئەو دەڤەرە، لەگەڵ ئەوەشدا ملکەچن بۆ فەرمان و ڕێنماییەکانی دەوڵەت، باوەڕناکەم ئەم هەرەشە و پلانانە بێ کاریگەر بن (*). بەتایبەتی کە ڕۆژانە هەمووجۆرە ڕێنماییەکیان پێدەدرێ. بۆ زانیاری زیاتری ئەو وەزارەتە بەڕێزە تێکرای تێلگرافەکەی **سەردار ئیجلال** نایب ئەلحکومەی کرماشانتان بۆ دەنێرین[1]. (ک٨١/٤٠٨٥)

## (١٣٤)

**(لە سەرۆکایەتی ژاندارمری کرماشانەوە بۆ ژاندارمری ناوەند، ٢ ی شەعبانی ١٣٣٣)**

**تێلگرافی کرماشان بەرواری ١٥ژوئین (٢ی شەعبانی ١٣٣٣)**

**مێجەر ئەدوال، تاران**

ڕەئوف ئێستا دەیەوێ بڕوا، وەلێ بە دوو مەرج، **یەکەم:** ئەوەیە کە نوێنەرێك لەلایەن ئەنجومەنی نیشتمانپەروەرانەوە داوای لێبکات بڕوات. **دووەم:** لەلای ئەو بەڵێن بدەن **کەڵهوڕ** کە هاوپەیمانی ئەون، لە کاتی ڕۆیشتنیدا هێرش نەکەنە سەری. بە کورتی مەفرەزەیەکمان پێبدەن، کە تاسەر سنوور یاوەری ڕەئوف بن، هەروەها دەستەیەکی مەشق پێکراوی بەڕێوەبەرایەتی پۆلیسیش پێویستە بۆ پاراستنی پۆستەکان بە درێژایی ڕێگا.

واژۆ: سۆنسۆن[2]

نامەکان لەگەڵ دەقە سەرەکییەکان یەکن

(**ئیدوال**) کەفیلی سەرۆکایەتی مەشق لە بەڕێوەبەرایەتی پۆلیسی دەوڵەتی.

(ک٥١٤٩)

---

١- لەم بەڵگەنامانەدا بەدی نەکرا.

٢- سەرۆکی هێزی پۆلیسی کرماشان بووە. Sonesson

## (١٣٥)

**(لە وەزارەتی کاروباری دەرەوە بۆ وەزارەت ناوخۆ، ١٥ ی شەعبانی ١٣٣٣)**

**وەزارەتی کاروباری دەرەوە، بەرواری ١٥ ی شەعبانی ١٣٣٣، ژمارە ٤، زۆر بەپەلەیە.**

وەزارەتی پایە بەرزی دەرەوە. هەواڵێکی تێلگرافی گەیشتووە، کە خەڵکی کرماشان دەیانەوێ، هێزی رووس بۆ کرماشان بێن و خۆشیان چەکی دەوڵەتیان تۆمار کردووە، تا هێرش بەرنە سەر ئۆردووی عوسمانی. بۆ پێشگرتن لەم کارە، پێویستە فەرمانی مسۆگەر دەربکەن بە تایبەتی بۆ بەڕێوەبەرایەتی پۆلیس، کە بەپەلە رێگە لەو کردەوانە بگرێ. چاوەڕوانی هەنگاوی کاریگەر و بەپەلەی ئەو وەزارتە پایەبەرزەم. **بەشی یەکەمی** ئەم هەواڵە، لە سەرچاوەیەکی دەرەکییەوە هاتووە، کە **پێویست** بوو بەو وەزارەتە پایەبەرزە رابگەیەنرێ. وەلێ **بەشی دووەمی**، کە تۆمارکردنی چەك و هێرش کردن بوو، لە سەرچاوەکانی ناوخۆوە وەرگیراوە، هەنگاوی پێویستیش بە تایبەتی لەو بارەیەوە دەنرێ، تا هیچ شتێك روو نەدات.

(لە پەراوێزەکەدا نووسراوە:) تێلگرافی رەمزدرار بۆ **سەردار جەلال** بنێردرێ کە ئەگەر ئەم هەواڵە راست بێت بەپەلە دەسبەکار بێ تا رووداوی ئاوا روونەدات.

(ك٨٥٠٤/٥٥)

## (١٣٦)

**(پەیماننامەی خوسرەو ئاباد، ١٦ ی شەعبانی ١٣٣٣)**[1]

**وەزارەتی ناوخۆ ژمارەی نووسراو- لقی نووسراوەکانی دارالانشاء**

**وەرگێڕدراوی پەیماننامەی خوسرەو ئاباد**

لە بەرواری **١٦** ی شەعبان ولموعەزەم **١٣٣٣**، لە ئاوایی **خوسرەوئاباد،** کە دەکەوێتە نزیك کرماشان، بۆ کۆتایی هێنان بە ناکۆکی نێوان سوپای دەوڵەتی پایەبەرز و سەرۆك عەشیرەتەکانی کرماشان و ئەو رووداوانەی دژی ئیتحادی ئیسلامی روویاندابوو، پەیوەندی دۆستانەی هەردوو دەوڵەتی تێکدەدا و ئاژاوەی گشتی لە کرماشان لێکەوتبۆوە و زیانی بە پەیوەندی دۆستانە و یەکییەتی موسوڵمانانی ئەم شارە گەیاندبوو، لیژنەیەك لە نوێنەرانی دەوڵەتی عوسمانی، ئەڵمان و ئێران و پیاوماقولانی شار پێکهێنرا و، بڕیارە هەموویان ئەم پەیماننامەیە واژۆ بکەن و لەم کۆمیسیۆنەدا بۆ دامرکاندنەوەی ئەو ئاژاوە گشتییە و کۆتایی هێنان بە رووداوی ناخۆشی هەردوو دەوڵەت، لەگەڵ **رەوشەنی بەگ**[2] نوێنەری **رەئوف بەگ** فەرماندەی سوپای عوسمانی، گفتوگۆ بکەن.

جەنابی **رەوشەنی**[3] بەگ یەکسەر سوپای دەوڵەتی عوسمانی لە کرندەوە دەبات بۆ **سەرپوڵی زەهاو،** بۆ ئەوەی خەڵکی کرند بتوانن بە ئاسوودەیی بچنە ناو ماڵەکانی خۆیان و ژیان بەسەر بەرن. پیاوماقولانی شاریش هەوڵ بدەن هەستێکی دۆستانەیان هەبێت، بەرامبەر برایانی دینی خۆیان واتە عوسمانییەکان. تێکڕای خەڵکی **کرند** و **زەهاو** و **قەسر** دەتوانن هەر لە سبەینێوە بە

---

١ - دەقی سەرەکی ئەم پەیماننامەیە بە فەرەنسییە (ك١٨/٤٠٨٥)، لێرەدا وەرگێردراوە فارسیەکەی کە هەر ئەوکاتە کراوە، دەخەینە روو. هەروەك لەم بەڵگەنامەیە و بەڵگەنامەی هاوشێوەی تردا دەبینرێ، وەرگێردراوەکە پوختە نییە.

٢- لە دەقەکەدا رشن نووسراوە.

٣ - لە دەقەکەدا رشین نووسراوە.

ئاسوودەیی تەواوەوە خەریکی کۆکردنەوەی ئەو بەروبوومەی خۆیان بن، کە ماوە و بۆ چۆڵ کردنی سەرسنوورەکان، داوا دەکەن سوپای دەوڵەت دژی عوسمانی بەپەلە وەرێکەوێ و کونسوڵی عوسمانیش بە پێی بڕیار و فەرمانی وەزیرموختاری دەوڵەتی خۆی لە سوپای عوسمانیدا، لە ئێران بڕوات.

جەنابی فەرماندەش هەوڵ دەدا بۆ پتەو کردنی بنەماکانی دۆستایەتی و یەکییەتی، زووتر فەرمانی گەڕانەوە لەسەر سنوورەکان دەربکا، بۆ ئەوەی ناکۆکییەکان روو نەدەنەوە و ئاژاوە لەسەر سنوورەکان دووبارە نەبێتەوە و تا چۆڵ کردنی سەرسنوورەکان، سەربازەکانی دەوڵەتی عوسمانی بۆ بەرژەوەندی رەعییەتەکانی ئەو ناوچەیە لە کاروباری ئیداریدا نەبن. ئەم پەیماننامەیە بە دوو نوسخە نووسراوە و واژۆکرا.

**محەمەد باقر- سالار نیزام- مەعازید ولمومالکی کارگێر- کونسولگەری عوسمانی- رەوشەنی بەگ نوێنەر رەئوف بەگ - نیزام دیوان - صمصام و لمومەمالك- سلیمان - سەردار ناصر- مسیۆ شونمان- مسیۆ کاپیتان سەنسۆن- مسیۆ کۆنت دوکانتیس — سەردار جەلال- سەردار موقتەدر- سالار مەنصور** و هیتر و هیتر.

لەگەڵ دەقەکەدا یەکە.

(ك٤٠٨٥/١٩: دەقە فەرەنسییەکە: ك٤٠٨٥/١٨)

## (١٣٧)

**(له صمصام و لمه‌مالكی سنجابییه‌وه بۆ ئه‌نجومه‌نی شۆرای میللی)**[1]

**ئه‌نجومه‌نی شۆرای میللی، تێكڕای نووسراوی صمصام و لمه‌مالكی سنجابی، چوار لاپه‌ڕه‌یه.**

له رێگای وه‌كیلانی بەڕێز و پایه بەرزی كرماشان. خزمه‌ت جه‌نابی موباره‌كی سه‌رۆكی ئه‌نجومه‌نی شۆرای میللی و سه‌رۆك وه‌زیران و تێكڕای نوێنه‌رانی خه‌ڵك و مه‌قامی پیرۆزی كابینه‌ی وه‌زیران، خوا پایه‌دارییان بكات. ئه‌م نۆكه‌ره پیره به‌سته‌زمانه‌تان جه‌ساره‌ت ده‌كات، شه‌ست و پێنج ساڵ له‌ته‌مه‌نم رۆیشتووه، بیست ساڵ له ماڵی باوانم بووم و چل ساڵه خزمه‌تگوزار و گیانفیدای ده‌وڵه‌ت و میلله‌ت بووم و یه‌ك زه‌ڕه خیانه‌تم نه‌كردووه، ئه‌وه‌ندی توانیبێتم خزمه‌تم كردووه. ئه‌گه‌ر نه‌شمتوانیبێ وازم هێناوه و خیانه‌تم نه‌كردووه. ئه‌مساڵ **حوسێن ره‌ئوف به‌گ** هاته ئه‌م سه‌ر سنووره و جارێك **شێخ حه‌سه‌ن كوردستانی** و چه‌ند جارێكیش خه‌ڵكی تری ناردووه، كه پاره‌ت پێ ده‌ده‌ین و له ده‌وڵه‌تی عوسمانی موچه‌ی زیادت بۆ وه‌رده‌گرم، ده‌وڵه‌ت به هه‌موو شێوه‌یه‌ك ئاوڕت لێده‌داته‌وه، له‌گه‌ڵمانبه تا ده‌چینه هه‌مه‌دان و و له‌وێ مۆڵه‌ت پێده‌ده‌ین بڕۆی. نۆكه‌رتان فریوی نه‌خوارد و نیشتمان فرۆشیم نه‌كرد. بۆ ئه‌وه‌ی ده‌وڵه‌ت و میلله‌تی ئێران ئینشائه‌ڵلا له پێشكه‌وتن[2] دابن نیشتمان فرۆشیم نه‌كرد. **ئیسماعیل حه‌قی به‌گی** والێكرد ده‌ست بداته ئاژاوه‌گێڕیی. له‌گه‌ڵ چه‌ند سوارێك هێرشی كرده سه‌ر تایفه‌ی سنجابییه‌كان، گوندێكی سوتاند كه به **چشم شیرین** به ناوبانگه. كوێخای ئه‌و

---

١ - ئه‌نجومه‌نی شۆرای میللی له نامه‌ی ژماره ٢٠٦٢ به‌رواری ٣ ی شه‌والی ١٣٣٣، ئه‌م نامه‌یه‌ی ناردووه بۆ ه‌زاره‌تی ناوخۆ. له نامه‌ی ئه‌نجومه‌ندا هاتووه كه صمصام ولمه‌مالك عه‌ریزه‌كه‌ی له رێگه‌ی حاجی عیزولمه‌مالك، كه ئه‌ندامی ئه‌نجومه‌ن بووه پێشكه‌ش كردووه. ئه‌نجومه‌نی شۆرای میللی دادای كرد (... دوای سه‌رنجدانی چۆن به باشی ده‌زانن وابكه‌ن و ئه‌نجامه‌كه‌شمان پێ رابگه‌یه‌ننه‌وه) (ك١٤/٤٠٧٥)

٢- له ده‌قه‌كه‌دا له بری ترقی، گرقی نووسراوه كه دیاره له ریساكه‌دا هه‌ڵه‌كراوه بۆیه به پێشكه‌وتن لێكرداریه‌وه.

لادێیە و سێ جوتیار و دوو ژنی کوشت، مەڕو ماڵاتی ئەو لادێیەی لەگەڵ سێ مێگەل مەڕی عەشیرەتەکانی سنجابی بە تاڵان برد. دە تا یازدە سواری عەشیرەتەکانی سنجابی بۆ بەرگری و بەداداچونی تالانکراوەکانیان دوایان دەکەون و دەگەنە سەریان. لێیان دەبێ بەشەڕ و **ئیسماعیل حەقی** شکست دەخوات. مەڕ و ماڵاتە تاڵانکراوەکە وەردەگرنەوە کەبەشێکی برابوو. سنجابییەکان نۆزدە ئەسپ لە شەرفرۆشانی عوسمانی و **ئیسماعیل بەگیش** بە دیل دەگرن. چەند نووسراو و نەخشە لە توربێنەکەیدا هەبووە و گوایە گرنگن. لەبەر گرنگی نەخشەکە و نووسراوەکان، خۆی دەکوژێ. حوسێن بەگیش پێدادەگرێ دەڵێ ئەسپەکان و تفەنگەکان و بکوژی ئیسماعیل بەگم دەوێت. نۆکەرتان هەم نووسراوەکان و هەم نەخشەکەم دایە دەست جەنابی موبارەکی موفەخەم تا بۆ دەوڵەتی بنێرێ، ئیتر نازانم ناردوویەتی، یان نەی ناردووە. هەواڵیان داوە بە نۆکەرتان کە حوسێن رئوف بەگ بە هەموو لەشکرەکەیەوە دێتە سەرتان. نۆکەرتان، بە ویلایەتی راگەیاندووە و داوام کردووە چی بکەین. وەڵامی نۆکەریان داوەتەوە: فەرموویانە دەوڵەت و میللەت بێ لایەنن و شەڕ مەکەن. ئەو شەوە ئەوان هاتن بۆ قەسر، جێگاتان چۆڵ بوو. وەرن بۆ **سەرپوڵ، ئەمیر موجاهیدی بەختیاری** و **موختار ولسەڵتەنە** سەرلەشکری کرماشان میوانی نۆکەرتان بوون. شەو لە خزمەتیان دابووم، بەیانیەکەی هەواڵیان دا بە نۆکەرتان، کە ئۆردوی عوسمانی هاتۆتە ناو قەسر. یەکسەر، سوار بووم بە شاهیدی ئەمیر موجاهید و موختار ولسەڵتەنە و هیچ شتێکم لەگەڵ خۆم هەڵنەگرت، بە سێسەت سوارەوە رووم کردە سەرپوڵ. دارونەداری نۆکەرتیان تاڵان کرد. ئەوەی **سالار موقتەدر** و نەوەی نۆکەرتان کە بەرپرسی **قەڵاسەوزە** بوو، لە ماڵی نۆکەرتان ماڵی رەعییەتی قەسریان دانابوو، هەموویان تاڵان کرد. نزیکەی **سی هەزار** تمەن پارەی نەقد وماڵی نۆکەرتان و نەوەکەیان بە تاڵان برد. تەنیا بۆ ملکەچی فەرمانی دەوڵەت و رووبەروو نەبوونەوەی لە ئیسلامدا، بێ شەڕ وازم لەو هەموو تاڵانکراوە هێنا و هاتم بۆ سەرپوڵ. لە سەر پول لە حزور والی دا وتیان لەبەر ئەوەی شەڕت نەکردووە، دەوڵەت و میللەت هەقی تۆ دەستێنن. نۆکەرتان ئومێدی پەیدا کرد. کەچی بینیم، حەزرەتی والی شەو یەکسەر رایکردووە لە سەر پولەوە هاتووە بۆ کرند. ئیتر نۆکەرتان هەقی ئەوەی نییە بەدرێژی باسی والیتان پێ رابگەیەنێ، دیارە پێیان راگەیاندوون. دوو سێ شەو لەکرند مایەوە و هات بۆ شار. نۆکەرتان، هاتە ناوشار و رۆیشتم بۆ لای کونسوڵی ئەڵمان واستەم بۆ بکات، کە حوسێن رەئوف بەگ بێ هۆ دوژمنایەتیم دەکات و باشترە ئەوەی تاڵانی

کردووە بمداتەوە. با حوسێن بەگیش بینیێ کەس پێشی پێناگرێ، وردە وردە هات و ماوەیەك لە کرند مایەوە، وەلێ بەو ڕێگایەی پێدا هاتبوو هیچ شتێکی لە دوای خۆی بەجێ نەهێشت، هەرچی بەردەستی کەوت تالآنی کرد، خەڵکی کوشت، خنکاند، لە سیدارەی دان، یا گوللەبارانی کردن. **خەیروڵلا خانیان خنکاند** کە ئاژانسی ڕاگەیاندنی رووس بوو لە قەسر. **حەمید خانی** برای مەجید خانی باجەلانی لەگەڵ شەش پیاوی خۆی لە سێدارەدا. لە کرند فەرانبەرێکی دانا، دەیەویست چوارسەت سەرباز بنێرێ بۆ بەسرە، دەیگوت کرند دارگیرکراو و رەعییەتی تورکە. کوڕی **ئیحتشامولمەمالیکی** بردووە زیندانی کردووە. **حاجی سەید حاتەمی** بەساڵاچووی لەگەڵ دوازدە کەسی تر گرتووە و گوللەبارانی کردوون، خەڵکی کرند لەگەڵ کەس و کاری کوژراوەکان ڕاپەڕیبوون، ویستوویانە شەڕ بکەن. کرندیان دابۆ بەر تۆپ و رەشاشی مەترالۆز. نزیکەی سەت و پەنجا پتر یا کەمتر ژن و پیاو و منداڵیان کوشتووە. نیوە ئاواییەکیان تالآن کردووە، قاسیدی کرندییەکانیش هاوار و فریاد دەگەیەنێتە هەموو شوێنێك. سبەینی دیسان کرندییە بەدبەختەکان شەڕ دەکەن. خەڵکی **کرماشان** و **گواران** و **سنجابی** لە **(بێوەنیج)**[1] کۆببونەوە، یەکسەر ژن و ژپیاو و منداڵی کرندی تۆپباران کراو، دەبەنە ناو ئەو کۆبونەوەیە و ئەوانیش تۆپباران دەکەن. گواران و سنجابییەکانیش دەکەونە ناو شەڕەوە. عوسمانییەکان پێشرەوییان زۆر کردبوو. خەڵکی عەشایریش هێز دێنن و پاشەکشە دەکەن تا دەوروبەری کرند. کە شەو دادێت هەریەکە لە شوێنی خۆی ئارام دەگرێ. بەیانی لەگەڵ دەرکەوتنی خۆر شەڕ دەسپێدەکاتەوە، بۆ ماوەی دوو کاتژمێر **گۆران** لە چادرەکانی ئوردو نزیك دەکەونەوە، بۆمبی فتیلەدار لە نزیك چادرەکان دادەنێن، بە یەکجاری بۆمبەکان[2] ئاگر دەدەن، گۆرانەکان دەدەنە بەر بۆمب و رەشاشی مەترالۆز. برازای جەنابی **سەید ڕۆستەم** لەگەڵ سەد کەسی گۆران دەکوژرێ. گۆرانەکان ڕادەکەن. **سنجابییەکان** تێکراکی سەنگەرەکانی چیاکان لە عوسمانییەکان دەگرن، تێکیان دەشکێنن و حەواڵەی ناو ئاوایی **کرندیان** دەکەنەوە. چیاکانی دەوروبەر و دەرودەشتی کرند دەگرن، عوسمانییەکان گەمارۆ دەدەن. بە تەما بوون کەم کەم شەڕبکەن تا شەو دادێ، بەسەریان دادەن، **مەرترالیۆز**[3] و تۆپەکانی تریان لێبگرن و تەسلیمیان

---

١- لە دەقەکەدا رووشاوە و لە (بێوەنیج) دەچێت.

٢- لە دەقەکەدا (بوم) نووسراوە.

٣- مەترالیۆز: جۆرێك چەکی رەشاشە، کە پتر لە جەنگی یەکەمی جیهانی دا بەکارهاتووە.

بکەن. لەو کاتەدا **مسیۆ شونمان** و کاپیتان سەن سۆن سەرۆکی بەڕێبەرایەتی پولیس دەگەن و ئالآی سپی هەڵدەکەن. داوای ئاشتی دەکەن. **رۆشن بەگ** فەرماندەی جەنگی عوسمانی لەگەڵ مسیۆ شونمان و کاپیتان سەن سۆن هاتبوون، بڕیایراندا هەرچی بە تالآن براوە بیگێڕنەوە و بچنە ناو خاکی دەولەتی پایە بەرزی عوسمانی. بڕیاردرا بۆ ئاشتەوایی و گێڕانەوەی تالآنەکە و گەڕانەوەی ئۆردووی عوسمانی بۆ ناو خاکی خۆی، کۆمسیۆنێك لە **خەسرەو ئاباد** دروست بکەن. دوای سێ رۆژ **شازادە محەمەد باقر میرزا** و **شازادە سالار نیزام** و جەنابی **سەید حەسەن**[1] لەگەڵ کۆمەلێك پیاوماقولآنی کرماشان، **مسیۆ شونمان** و کاپیتان **سەن سۆن** و شابەندەر و **معازید** و لەمالیکی کارگێڕ، لەگەڵ **ئیحتشام و لەمالیك** و نۆکەرتان و سەرکردەکانی کەڵهوڕ و سەرکردەکانی سنجابییەکان، لەگەڵ **سالار مەنسور**[2] گۆران لە **خەسرەو ئاباد** کۆبوونەوە و، بڕیاری ئاشتی درا و لەسەر ئەوە رێککەوتن، کە ئۆردووی عوسمانی ئاسایشی تەواوە بڕوا بۆ **سەرپوڵ** و هیچ کەس سەغڵەتیان نەکات و کرندییەکانیش بێن کۆمسیۆنێکی تر لە کەرەن دروست بکەن. بۆ وەرگرتنەوەی تالآنەکە، بڕۆنە ناوخاکی دەولەتی پایە بەرزی عوسمانی. ئەوە ماوەیەك بەسەر کۆبوونەوەی دووەمدا تێپەڕیوە، **عوسمانییەکان** هیچ هەنگاوێکیان لەمەڕ گەڕاندنەوەی تالآنەکە نەناوە و لەبیری ئەوەش دانین بگەڕێنەوە ناو خاکی عوسمانی. ئەو هەموو کوشتار و تالآنەیان لە خەڵکی دولەتی پایە بەرزی ئێران کرد و خەیاڵی داگیر کردنی خاکی پیرۆز و وێرانکراوی و خەڵکیشیان لەسەر دایە. ناوی خۆشیان ناوە ئیتحادی ئیسلامی. ئیسلام دەبێ بەزەیی هەبێت. ئەوانە لە هەرچی کافر هەیە بێ بەزەییترن. رەعییەتەکانی **سنجابی** و **کرند** و هێندێك لە گۆران، هێزی رەعیەتییان نەماوە، ئەگەر زستان بێت زۆربەیان لە سەرمان و لە برسان دەمرن. ئەوەی کە ئۆردووی عوسمانی لە نۆکەرتان و نەوەکەم و رەعییەتی سنجابی بە تالآنی بردووە ئەمانەن:

لە نۆکەرتان و **سالار موقتەدر** سی هەزار تمەن کەلوپەلی ناوماڵ و تفەنگ و پارەی نەقدیان بردووە. پانزە دیهاتیان بە مەڕ و ماڵات و کەلوپەلی ناوماڵەوە تالآن کردووە. هێندێك لەو دیهاتانەیان سوتاندووە. سەرکردەکانی سنجابی **غولامزادەن** سەت و سی خەروار بنەتۆوی

---

١- شازادە محەمەد باقری خوسرەوی ئەدیبی ناوداری کرماشانی و خزمی صەصام و لەمالکە، شازادە سالار نیزام پۆستی جێگری حکومەتی لە ئەستۆدابوو. جەنابی سەید وەجاخیش لە پیاوە ناسراوەکانی شارە.

٢- لە شوێنی تر بە (غولآم عەلی سالار مەنسوری گۆرانی) ناوی هاتووە

گەنم و جۆیان لە سەرپول چاندووە. نۆکەرتان و **سالار موقتەدر** لە قەسر و قەڵاسەوزە پەنجا خەروار بنەتۆوی گەنم و جۆمان چاندبوو، هەموویان کردووە بە لەوەڕگا و ئەوەی درووارەتەوە دەنا بردوویانە. بنەتۆوی چێنراوی پانزە دێهات کە بەسەریەکەوە دوو جووتە، دەبێتە سەت و پەنجا جووت ئەگەر لە هەرجووتێك سێ خەروار تۆو چێنرابێ دەبێتە چوارسەت و پەنجا خەروار، یەك دەنکیان هەڵنەگرتۆتەوە. هەشت نۆ خەروار دانەوێڵەی دانراویشیان خراپ کردووە. چ نۆکەرتان و چ رەعییەتی سنجابی داوای هەقی خۆمان دەکەین. ئومێدەوارین داوەری بکەن و بۆمان دیاری بکەن چی بکەین. ئەو هەموو کوشتار و تالآنە لە دەوڵەتی پایەبەرز بکرێ و داوەری نەکرێ (واتە هەقیان نەسێندرێ/ وەرگێر). خەڵك بە چ دڵخۆشییەکەوە خزمەت بکەن و باج بدەن. ئومێدەوارم بە تەواوی بیخوێننەوە و رەئی موبارەکتان هەرچییەك بێ وەڵامەکەمان بۆ بنووسن. جەسارەتم کرد بە خزمەتتانی رابگەیەنم.

نۆکەری خانەزاد **شیر موحەمەد صمصامولمەمالیکی سنجابی**.

## (١٣٨)

**(لە حکومەتی گەڕووس بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ٢٥ ی رەمەزانی ١٣٣٣)**

**بەڕێوەبەرایەتی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، لە گەڕووسەوە بۆ تاران، ژمارەی تێلگراف ١٤، بەرواری ناردن شەوی ١٦، بەرواری گەیشتن ١٧ ی شێر ١٣٣٣.**

مەقامی پیرۆزی سەرۆك وەزیران، چەند رۆژێکە بەردەوام هەواڵمان پێدەگات، کە شازادە **سالار ولدەولە** هاتۆتە نێوان گوڵباغی و مەندمی و دیدەنی ماڵی **سەید نەجمەدین** و **شەهابەدینی** کردووە، بۆ راستی و درۆی ئەو پرسە، کەسێکم نارد بە پێی ئەو نامەیەی لە یەکێك لە سەرۆکەکانەوە گەیشتووە، دەرکەوتووە شتێك هەیە. بەو پێیە دوای جەژنی قوربان دەست بە چالاکی دەکەن. دوای گەڕانەوەی قاسیدەکە بە درێژی بە خزمەتتانی رادەگەیەنم، هەر ئەوەندە دەڵێم بەم بارودۆخە سیاسییەی ئەم ناوچەیە و کارو کرداری **گوڵباغی مەندمی** و هۆزەکانی **جاف**، پێویست ناکا کوردستان بێ حاکم بێت و پێویستە تا جەژنی قوربان حکومەتی کوردستان هەرچییەك بێ لە **سنە** بێت. **١٥** شێر، ژمارە **٢٩٢**، **موشیرولسوڵتان**.

(٢٩٠٠٠١٢٨٩)

## (١٣٩)

**(لە وەزارەتی دەرەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ٤ ی شەوال ١٣٣٣)**

**وەزارەتی کاروباری دەرەوە، بەڕێوەبەرایەتی عوسمانی، بەرواری ٤ ی مانگی شەوال ١٣٣٣، ژمارە ٨٤١٧/٨٩٠**

وەزارەتی پایە بەرزی ناوخۆ، کارگێڕی کرماشان بە تێلگراف هەواڵی ناردووە، **کەریم خان** برای **سەردار نوسرەتی** (کەڵهوڕ)، کە لە ئۆردوی عوسمانییەکان بووە، سەرەتای ئەم مانگە رایکردووە و خۆی گەیاندۆتە کۆمەڵەی کەڵهوڕەکان و سەرداری کەڵهوڕیش پانتایی دەسەڵاتی خۆی لە **هارون ئاباد**ەوە گەیاندۆتە ناوەندی کوێستان. تەنیا بۆ ئاگاداری ئەو وەزارەتە پایەبەرزە بوینە ئەزییەت.

(واژۆ) **عەلی قولی**

مۆری وەزارەتی پایەبەرزی کاروباری دەرەوە

## (١٤٠)

**(لە وەزارەتی دەرەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ١٠ ی شەوالی ١٣٣٣)**

**وەزارەتی کاروباری دەرەوە، بەڕێوەبەرایەتی دەوڵەتانی نادراوسێ، بەرواری ١٠ ی شەوالی ١٣٣٣، ژمارە ٨٥٦٦/٢٦٣٥، بەپەلە.**

وەزارەتی پایە بەرزی ناوخۆ، بەو پێیەی کە لە کارگێڕی کرماشان بە تێلگراف راپۆرتی ناردووە، پلەدارێکی ئەڵمانی بە **١٢** بار جبەخانە لە بەغداوە هاتووە بۆ کرماشان. تەنیا بۆ ئاگاداریتان ئەزیەتمان دان تا لەو بارەیەوە بڕیاری خێرا بدەن.

(مۆری) وەزارەتی پایە بەرزی کاروباری دەرەوە.

لە پەراوێزدا لەلایەن وەزارەتی ناوخۆوە نووسراوە: بەڕێوەبەرایەتی رۆژئاوا: بە رەمز تێلگراف بۆ یاریدەدەری حکومەتی کرماشان بکەن، کە هەواڵەکە ئاوا گەیشتووە، لێکۆلینەوەی راست ئەنجام بدەن و زوو دەرئەنجامەکەیان پێرابگەیەنن.

(ك١٥/٤٣٣٨)

## (١٤١)

**(راپۆرتی جێگری حکومەتی کرماشان، ١٨ ی شەوالی ١٣٣٣)**

**وەزارەتی ناوخۆ، دەقی تێلگرافی رەمزداری جێگری حکومەتی کرماشان، بەرواری ١٨ ی شەوالی١٣٣٣، ژمارە ٥٩٦.**

مەقامی پایە بەرزی وەزارەتی ناوخۆ. تێلگرافی رەمزداری ژمارەی **٥٩١** مان زیارەت کرد. ئەم بابەتەم لە رێگەی پۆستەوە بە درێژی بە خزمەتی جەنابی ئەشرەف **ئیقبالولدەولە** راگەیانددووە. بەردەوام کەسانی جۆراوجۆر بە جل و بەرگی ئەڵمانی هیترەوە دێن و دەڕۆن بۆ ئۆردوی ئەڵمانییەکان. کەسانێکی زۆریش کۆڵ و بار دەبەنە ناو کونسوڵی ئەڵمانی، کە باری پارە و جبەخانەیە. وەلێ چییە و چۆنە دیار نییە. بڕوای هێندێك کەس ئەوەیە کە لەلایەن عوسمانییەکانەوە هاتوون جل و بەرگیان گۆڕیوە و دێنە ناو وڵات. ئەمڕۆش نامەیەك لە سنجابییەکانەوە گەیشتووە کە عەشایریش لەم بابەتە نیگەرانن. **مسیۆ شونمان**یش دوێ شەو هاتۆتە ناوشار و لەشکرەکەشی لە دەرەوە و **بێستونن**.

١٦ شەوال[١]، ژمارە ١٧٠ **ئاغاخان غەفاری**

لە پەراوێز نووسراوە: بنێردرێ بۆ وەزترەتی کاروباری دەرەوە.

(ك١٦/٤٣٣٨)

## (١٤٢)

**(راپۆرتی کارگێڕی کرماشان، ٢١ ی شەوالی ١٣٣٣)**

**وەزارەتی کاروباری دەرەوە، دەقی تێلگرافی رەمزداری کارگێڕی کرماشان، بەرواری ٢١ ی شەوالی ١٣٣٣)**

**عەبدوڵڵاخانی کەڵهوڕ** کە تازە لە ئۆردوی **رەئوف کەڵهوڕەوە** گەڕاوەتەوە، لە سەر بانگهێشتی شونمان لەلایەن **سەردار ئیقبال**[١] حاکمی کەڵهوڕ هاتۆتە یەك فرسەخی کرماشان.

---

١- لە دەقەکەدا ٦١ ی شەوال نووسراوە.

دوێنێ شوئمان دیداری لەگەڵ کردووە و نزیکەی یەك کاتژمێر خەریکی گفتوگۆی نهێنی بوون. هەرچەندە ئەنجامی گفتوگۆکان هێشتا ئاشکرا نەبووە، وەلێ ئەوەی فیداکارتان لە دەرەوە و ناوەوە هەستی پێکردووە، پەیمانێك لە نێوان شوئمان و ناوبراو بەستراوە کە هەردوو تایفەی کەڵهوڕ لەگەڵ ئەودا یەکبگرن و لە گەڵیدا بن. ژمارە **١١٦٩**، **مەعازید ولمەمالك**. (١٨/٤٣٣٨)

نووسراوەکە لەگەڵ دەقەکە یەکە.

( مۆری) وەزارەتی کاروباری دەرەوە، بەرێوەبەرایەتی دەوڵەتانی نادراوسێ.

## (١٤٣)

**(راپۆرتی کارگێڕی کرماشان، ٢١ ی شەوال ١٣٣٣)**

**وەزارەتی کاروباری دەرەوە، بەڕێوەبەرایەتی دەوڵەتانی نادراوسێ، دەقی تێلگرافی ڕەمزداری کارگێڕی کرماشان، بەرواری ٢١ ی شەوال ١٣٣٣)**

راپۆرتێك لە سەر سنوورەوە گەیشتووە کەوەك خۆی دەینووسینەوە:

ماوەیەکە بە درێژایی چوار رۆژ، بە یەکجار سی چل بار جبەخانە، لەلایەن عوسمانییەکان و ئەڵمانییەکانەوە بەڕێخراوە و دەیبەن بۆ کرماشان. عوسمانییەکانیش بە هەمان شێوە لە **سەرپوڵی زەهاو** خۆیان قایم کردووە. عەشیرەتەکانی ئەم دەڤەرەش بە هۆی وێرانی و سوتانی مەزرا و لەوەڕگاکان، وێڵ و سەرگەردانن.

ژمارە ١١٦١، **مەعازید و لمەمالك**

نووسراوەکە لەگەڵ دەقەکە یەکە.

(مۆری) وەزارەتی کاروباری دەرەوە، بەڕێوەبەرایەتی دەوڵەتانی نادراوسێ، ١٣٢٨ (ك١٩/٤٣٣٨)

---

١- لە شوێنی تر بە عەباس سەردار ئیقبالی کەڵهوڕ ناوی هاتووە.

## (١٤٤)

**(راپۆرتی ژاندارمری کرماشان، شەوالی ١٣٣٣)**

**وەزارەتی ناوخۆ بەڕێوەبەرایەتی ناوەندی ژاندارمری دەوڵەتی ئێران، بەرواری ١٠ ی بورج سونبولە(٢١ ی شەوال) ی ١٣٣٣، ژمارە ٢٥٩٨.**

مەقامی پایەبەرز و باڵای سەرۆکایەتی بەڕێزی وەزیران، شکۆیان هەر بەردەوام بێ. دەقی ئەو راپۆرتەی لە کرماشانەوە گەیشتووە وا پێشکەشمان کردن. رێزو حورمەتمان قبوڵ بفەرمون.

**ئەدوال** کەفیلی سەرۆکایەتی رێنوێنی بەڕێوەبەرایەتی پۆلیسی دەوڵەتی.

## (١٤٥)

**(راپۆرتی کاپیتان سەنسۆن، سەبارەت بە پرسی رەئوف بەگ)**

**ژمارە ١١٠, بی بەروار**[١]

سەرۆکی بەڕێوەبەرایەتی پۆلیسی دەوڵەتی. زۆربەی دانیشتوانی ئەمبەر و ئەوبەری رێگەی کرماشان تا بەغدا لە لایەن ئەو تایفانەوە تالاّن کراون، کە لە هەردوو دیوی سنوور نیشتەجێن و زۆرکات لە نێوان خۆشیاندا کێشە و شەڕی تایبەت روودەدات. جاری وا هەیە بە شێك لەو خێڵانە لەگەڵ تیرە و تایفەکانی سەر سنوور یەکدەگرن و لەگەڵ عەشیرەتەکانی ئێرانی بەشەڕ دێن. وەلێ تێکڕای عەشیرەتەکانی ئێرانی لە لایەك و عەشیرەتەکانی عوسمانی لەلایەکەی تر، خێڵە ئێرانییەکان دەکەنە لایەنگری خۆیان، یا دووبەرەکیان لە نێواندا دەنێنەوە. لەم ساڵانەی دواییدا هەرگیز هێزێکی تۆکمەی دەوڵەتی لە لایەن ئێرانەوە لەو سەر سنوورانە بوونی نەبووە، کە نەزم جێگیر و کێشە و ئاژاوە بنبڕ بکات و چەتە و تلاّنکەران تەمێ بکات.

هێندێك جار چەند حاکمێکی کرماشانیش هەموو هێزەکانی خۆیان کۆکردۆتەوە و لەگەڵ یەك دوو خێڵ یەکیان گرتووە، رایانکێشاون بۆ لای خۆیان و باجیان لێوەرگرتوون، وەلێ

---

١ - دەقی وەرگێڕدراوە فارسییەکەی ئەم بەڵگەنامەیە هیچ ناونیشانێکی نییە. نیشانەکانی ناو ( ) لە دەقی راپۆرتە فەرەنسییەکەی وەرگیراوە.

دەوڵەتی ئێران هەرگیز سوودی لەم کارە نەبینیوە، تەنیا ئەوە نەبێ هێندێك جار بگرە هەمیشە، بڕێکی زۆر دارایی لەم لایە وەرگرتووە و حەواڵەی لایەکەی تری کردووە.

بەهۆی ئەم ئاژاوەیەی ئێستاوە، دەتوانین پەی بەم خاڵە بەرین، کە کونسوڵەکانی رووس و ئینگلیز دەیانتوانی شتێك بڵێن: بۆ نموونە بڵێن رێگە نادەین کونسوڵی ئەڵمان بێتە ئێرە و ئەگەر کونسوڵی ئەڵمان بەم شێوازە بێت ئەوا رێگەی لێدەگرین. بەڵێ بەم شێوەیە کونسوڵی ئاڵمان هاتە ناو کرماشان و پێشنیازی بۆ کونسوڵی عوسمانی کرد و داوای لێکرد، ژمارەیەك پاسەوان لە لەشکری عوسمانی بۆ کرماشان وەربگرێ. بە پێی پێشنیازی ئەو، خاوەن پلەیەکی عوسمانی، بەناوی **ئیسماعیل حەقی بەگ**[1]، لەگەڵ دەستەیەکی بچووکی سەرباز لە خاکی عوسمانییەوە، هاتوون و دوای هاتنیان بۆ ناوخاکی ئێران و دەڤەری سنجابییەکان، کێشە لەگەڵ ئەوان و خەڵکی لادێیەك دەستی پێکرد و عوسمانییەکان هاوکاری خەڵکی سەرسنووری خۆیان کرد. لەم پێکدادانەدا خاوەن پلەی ناوبراو ئیسماعیل حەقی و حەوت سەربازی عوسمانی کوژران. دوای ئەم کارەساتە، ژمارەیەکی زۆرتر لە هێزەکانی عوسمانی لە ژێر سەرکردایەتی **حوسێن رەئوف بەگ**، لەلایەن عوسمانییەوە نێردراوە و لە رێکەوتی یازدەهەمی ئابریل **٢٥** جەمادی یەکەمی **١٩١٥**، هاتنە سەر سنوور.

لەو کاتەدا تایفەی سنجابی هاوڕێی فەرمادەیی ئەوسای **ئەمیر موفەخەم** بوون، کە باجی کەڵهوڕ وەردەگرن، تایفەی کەڵهوڕیش بڕێکی زۆری داوە و فەرماندەش دەیەویست بڕێکی تریشیان لێ بستێنێ و خێڵکی کەڵهوڕیش رایکردووە و لە دەوروبەری لەشکری تازە هاتووی عوسمانی کۆبووەنەتەوە.

لەولاشەوە **ئەمیر موفەخەمی** فەرماندەش هەر لەو بەروارەدا واتە یازدەی ئابریل (**٢٥** جەمادی یەکەم)، رایکردووە و گەڕاوەتەوە بۆ دەوروبەری کرماشان. بۆ ئەوەی ئەو هەواڵانەی حوسێن بەگتان پێ رابگەیەنین، هاوپێچ نامە ئاڵوگۆڕکراوەکانی نێوان **ئیحتشام ولەمالك** و نووسینەکانی کوڕەکەی **سالار ئەفخەم**تان بە **رەجەب عەلی** دا بۆ دەنێرم، کە نوێنەری وەزارەتی کاروباری درەوەی ئێرانە لەسەر سنووری عوسمانی[2]، ئەم راپۆرتانەش هەر ئەو کەسانە بە ئارەزووی خۆیان، بە ئامادەبوونی ژمارەیەك رێزدارانی قەسر نووسیویانە، لە وەڵامی

---

١- لە دەقەکەدا (ئیسماعیل حاکم بەگ)ە، وەرگێڕەکە هەڵەی کردووە.

٢- بگەڕێوە بۆ بەڵگەنامەی ژمارە ١٤٦ و ١٤٨.

پرسیارێکدا کە لێم کردن، ئایا راپۆرتەکان زیادەرەوییان تێدا نییە، لە وەڵامدا وتیان نەخێر. بەڵام هێندێك شتی تریان تێدابووە، رەنگە ئیستا ئێمە لێیان ئاگادار نەبین.

بۆ تۆکمە کردنی زانیارییەکان، لە خوارەوە بەرواری هەریەکێکیان دەنووسم:

حوسێن رەئوف بەگ فەرماندەی لەشکری تورك، لە رێکەوتی یازدەهەمی ئابریل (**٢٥** جەمادی یەکەم) هاتۆتە ناو خاکی ئێران و **ئەمیر موفەخەم** لە هەمان بەروار لە سەر سنوور بەرەو کرماشان گەڕاوەتەوە.

**رەئوف بەگ** لە هەژدەهەمی ئابریل (**٢٧** ی جەمادی دووەم) لە قەسرەوە بەرەو سەرپوڵی زەهاو وەرێکەوتووە و، هەر ئەو رۆژە **کۆمیسار محی دین بەگ** لە لایەن رەئوف بەگەوە بە نوێنەر هاتە ناو کرماشان و، لە بەرواری دوازدەی مایس (**٢٧** ی جەمادی دووەم) رەئوف بەگ فەرماندەی سنوورپارێزی ئێرانی دەسگیر کردووە.

**١٢** ی مایس (**٢٧** ی جەمادی دووەم) حوسێن رەئوف بەگ گەیشتۆتە **سەرخە دیزە** و **١٧** ی مایس (٢ ی رەجەب) پاسەوانەکانی بە سەرپەرشتی **ئەدهەم بەگ** چوونە ناو **هارون ئاباد** و **١٩** ی مایس (**٤** ی رەجەب) حسێن رەئوف گەیشتە کرند و، **٣٠** ی مایس (**١٥** ی رەجەب) **محی دین بەگ** لە کرماشانەوە گەڕاوەتەوە و **٧** ی حوزەیران (**٢٢** ی رەجەب) **سالار ئەفخەم**[1]، کوڕی حاکمی کەرند رەئوف بەگی دەسگیر و بەند کردووە و، **١٣** حوزەیران (**٢٨** رەجەب) شەڕ لە نێوان سەربازەکانی عوسمانی و دانیشتوانی کرند رووی دا و **١٧** ی حوزەیران (**٤** ی شەعبان) تا **٢٢** ی حوزەیران (**٩** ی شەعبان) شەڕی کرند لە نێوان سەربازەکانی **سنجابی** و **گۆران**، لەگەڵ سەربازەکانی تورك لە ئارا دابوو.

بە پێی فەرمانی ئێوە، **مێجەر نیسترم** سەرۆکی گروهی حەوتەم فەرمانی پێدام، دوو دەستە پۆلیس لە شاری کرماشان دابنێم تا بانك و کونسوڵخانەکانی بیانی بپارێزن و رێگە لەو هەوڵانە بگرم کە بێلایەنی پوچەڵ دەکەنەوە.

لە ٦ ی مایس (٢٢ ی رەجەب) لە **خەلیل ئاباد** نێردراوێکی **دەوڵەت ئاباد**، دیداری لەگەڵ **ئەمیر موفەخەمی** فەرمانڕەوەدا کردووە، کە چۆن لە بارودۆخێکی ئاوادا خەریکی رایکردن بووە لە کاتێکدا کرماشان پتر لە هەر کاتێك پێویستی بە فەرمانڕەوا هەبووە.

---

١- لە شوێنی تر بە (ئیسماعیل سالار ئەفخەمی کرندی) ناوی هاتووە

ئەمیر موفەخەم، هەموو ئەو سامانەی لە کاتی حکومەت و فەرمانڕەوایی کرماشاندا لە خەڵکی وەرگرتووە، هەڵیگرتووە لەگەڵ خۆی بیبا و خەڵکی ویلایەتی کرماشان لە رەفتاری خۆی و سوارەکانی وەتەنگ هاتوون و کەوتونەتە جموجوڵ و نزیك بوونەوەی سەربازەکانی عوسمانیش جموجوڵی ئەوانی پتر کردووە.

هاتنی پۆلیس (١٠ ی مایس /**٢٦** ی رەجەب) بۆ ناوشار بۆتە هۆی ئاسوودەبوونی خەڵك، دووکانەکانی بازار دوای ئەوەی خاوەنەکانیان لە شتومەك بەتاڵیان کردبوون، دووبارە کراونەتەوە، ئەو کاڵا بازرگانیانەی لە ترسی سەربازەکانی عوسمانی شاردبوویاننەوە، دووبارە هێناویانەتەوە ناو بازار.

بەڵام ئەم چاوەروانییە تارادەیەك بە رواڵەت و پەرێشانی خەڵك بە تەواوی کۆتایی نەهاتبوو، لە **١٢** ی مایس دا (**٢٨**ی رەجەب) بوو بەقاو، کە فەوجەکانی عوسمانی خەریکی هاتنن. گەیشتنی ئەم هەواڵە بۆتە هۆی وروژانی هەڵك و نائاسوودیی دانیشتوان و ئەشرافی شاریش دەستوپێوەندەکانی خۆیان چەکدار کردووە و بەشێکی سەرەکی بازار داخراوە. خەڵك لە مەیدانی تۆپخانە و تێلگرافخانەن، تا لەگەڵ شاندی وەزیرانی تاران گفتوگۆ بکەن و مۆڵەت وەربگرن، بە زەبری زۆر پێش بە هاتنی سەربازکانی عوسمانی بگرن.

بە درێژایی ئەو رۆژە بەندە لەگەڵ ئەشرافی شار خەریکی گفتوگۆ بووم، تا لەگەڵم دابن بتوانین پەرێشانی خەڵك هێورِ بکەینەوە. لە کۆبوونەوەیەکدا کە پیاوماقوڵانی شار ئامادەی بوون و منیش لەوێ بووم، ویستیان بۆ ئاسوودەبوونی خەڵك سەرکردەی لەشکر بێنن و لە سەر بورجەکانی شار سەرباز دابنێن، وەلێ سەرلەشکر قبوڵی نەکرد و وتی وەزیری جەنگ فەرمانی پێداوە بێلایەنی خۆی بپارێزێ. لەو کۆبوونەوەیەدا ئامادەبووان داوای یارمەتی و رەئی منیان کرد. لەبەر ئەوەی دەمزان ئەگەر سەربازەکانی عوسمانی شار داگیر بکەن، ئەوەی پێش هەمووان رادەکات سەربازەکانن، ئەوەش کاریگەر نابێ لەسەر بێلایەنی و، ئەرکی من لەم رۆژەدا ئەوە دەبێ کە هەرچۆنێك بێ خەڵك هێورِ بکەمەوە و کۆتایی بە ئاڵۆزی روو لەزیاد بوونی شار بهێنم. من لێرەدا باسێکم کرد و وتم: بە راستی بۆ پاراستنی بێلایەنی هیچ کارێك لەوە باشتر نییە کە سەرباز و خەڵك لە بورجەکانی شار دابنێین و ئەم کەمتەرخەمییەش رووبەڕووی سەرکردەی لەشکر دەبێتەوە، کە کەسی بۆ ئەم شوێنانە نەناردووە، پێویستە ئەم

کاره بەپەلە ئەنجام بدەین، هەروەها پێموت کە من دەمەوێ ئەم نیازەم بە کونسوڵی عوسمانی و ئاڵمانی و نوێنەری **حوسێن ڕەئوف بەگ** ڕابگەیەنم.

دوای تەواو بوونی وتارەکەی من ئەندامانی ئەنجومەن و ئامادەبوان، ناوەرۆکی وتارەکەیان بە خەڵکی شار ڕاگەیاند و بوو بەهۆی ئاسوودە بوونیان، ئەم جارەش ئەمن و ئاسایش بەرقەرار بۆوە. بە پێی ئەو بڕیارانەی بە بەندە گەیشتووە، ئەرکی ئەوەم پێ سپێردرابوو کە بێلایەنی لە نێوان ئێرانی و عوسمانییەکاندا بپارێزم و بۆ سەرکەوتنیش پێویست بوو هەوڵبدەم دژایەتی نەکەوێتە نێوان خەڵك و فەوجەکانی عوسمانی.

لە کۆبوونەوەیەکی فراواندا کە ئەو کونسولانە بانگهێشت کرابوون، **محی دین بەگ** نوێنەری **ڕەئوف بەگ** لەوێ ئامادە بوو، پێ ڕاگەیاند کە ئەم ڕەفتار و کردەوانەی ڕەئوف بەگ لە ئێراندا لەگەڵ ئەقڵ و خۆپاراستن نایەتەوە و جموجوڵەکانی لە کۆتاییدا دەبنە هۆی ئەوەی بێ لایەنی بکەوێتە مەترسییەوە و پێشێل بکرێ. خەڵك ئەوەندە لە جموجوڵی عوسمانییەکان بێزار بوون، تەنیا مۆڵەتیان لە دەوڵەت دەویست تا سوپای تورك ڕامالن وەدەرینێن، من دڵنیا بووم کە ئەگەر بارودۆخەکە ئاوا بمێنێتەوە، بێ مۆڵەتی دەوڵەتیش ئەو کارە دەکەن.

هاوکات من بە کونسوڵی عوسمانیم ڕاگەیاند، کە دوور نییە عوسمانییەکان لە ناو شار بکەونە بەر مەترسییەوە و منیش ئەوەندە پولیسم بەدەستەوە نییە، کاتێك کە خەڵك لێیان ڕاپەڕێ بتوانم بیانپارێزم. کونسوڵی ئەڵمان کە پتر لە هەمووان هەستی بە مەترسی باودۆخەکە کردبوو، لە گفتوگۆمدا لەگەڵ عوسمانییەکان هاوڕام بوو، وەلێ هەموو هەوڵەکانمان بێ ئاکام مانەوە و دواتر دەرکەوت کە بۆچوونەکانم لەمەڕ ڕووداو و شەڕی **کرماشان** ڕاست بووە.

دوای ئەوی **ڕەئوف بەگ** گەیشتە کرند، ناکۆکییەکان دەستیان پێکرد و سوپایەکەی لای سنجانییەکان  بوو، لایەنگرەکانی واتە کەڵهوڕەکان دوودڵ بوون لەوەی پشتیوانی بکەن. بەرپرسی سەربازی ئەڵمانی کۆنت کۆنتیس، ڕۆیشتبوو لە رئوف بەگ بپرسێ، کە مەرجەکانی کشانەوەی ئەو چییە؟ و بەڵێنی دابوو کە ئەو لێرە دەڕوات ئەگەر پرسی **حەقی بەگ**[1] یەکلا بکرێتەوە و دەوڵەتی عوسمانی ئابڕووی نەبرێ و پۆلیس ئاسایشی ڕێگەی کرماشان تا سەر سنوور وەئەستۆ بگرێت، هەروەها داواشی دەکرد صمصامولمەمالك سەرۆکی خێڵی سنجابی

---

١- لە دەقەکەدا حەکیم بەگە.

بچێتە لای و داوای لێبووردنی لێبکات، بەڵام لەو ڕووەوە کێشە و گرفتەکانی بە بیانوو دەهێنایەوە.

لە کۆبوونەوەی پیاوماقوڵاندا، من پێشنیازم کرد لەگەڵ صمصامولمەمالك بڕۆم بۆ لای ڕەئوف بەگ و کۆتایی بەم کێشەیە بهێنم. هەموویان دەسخۆشی ئەو پێشنیارەیان لێکردم. دیدارم لەگەڵ کونسوڵی ئەڵمان و **صمصام ولمەمالك** دا کرد و بە هۆی ئەو نامانەوە، کە دۆستەکانی بۆیان ناردبوو، قەناعەتم پێی کرد کە پێویستە لە ڕووی نیشتمانپەروەرییەوە بچینە لای **ڕەئوف بەگ** و کۆتایی بە کێشەکە بهێنین، ئەمەش زۆر ئەستەم بوو، چونکە ئەو پێشتر بە هۆی فەرمانداری کرندەوە چەند هەنگاوێکی نابوو.

ڕۆژی دواتر (یەکەمی حوزەیران/ **١٧** ڕەجەب) چوومە لای سنجابییەکان، وەلێ پێش ڕۆیشتنی من **صمصام ولمەمالك**، لەلایەن جێگری حکومەتی کرماشانەوە **سەردار ئیجلال**، بە تیلگرافێکی ڕەمزداری وەزیری ناوخۆ شازادە **فەرمانفەرما**وە نامەیەکی بۆ هاتبوو، دەیگوت پێویست ناکات بڕۆن بۆ لای ڕەئوف بەگ و داوای لێبووردنی لێبکەن، ئەم جۆرە زانیارییانە بۆ تۆش هاتوون، وەلێ تا ئێستا من لێیان بێ ئاگام. دوای ئەوەی گەڕامەوە بۆشار، هەواڵیان پێدام کە چەند خراپکارێك دەیانەوێ دژی من پیلان بگێڕن، گوایە من ڕۆیشتووم بۆ لای سنجابییەکان تا لەگەڵ **ڕەئوف بەگ** یەکبگرن، تا ڕەئوف بەگ بتوانێ بە ئاسانی بێتە ناو کرماشان.

کورتییەکەی ئەوەبوو، کە من سەرۆکی پۆلیسم دەمەوێ ڕێگە بدەم بێگانە بێنە ناو وڵات. وەك هەمیشە خۆشباوەڕانە چەند کەس لە پیاوماقوڵان چوونەتە تێلگرافخانە و تێلگرافیان بۆ وەزیری ناوخۆ کردووە، لە ئەنجامی ئەم تێلگرافەدا لە کۆبوونەوەیەکی خەڵکی شاردا ڕاستی مەسەلەکەم بۆ خەڵکی ڕوونکردەوە و دڵنیام کردنەوە کە تێکڕای هەوڵەکانی من بۆ ئەوە بووە، ڕێگە نەدەم بێگانە بێنە ناوەوە و پرسەکە بە خۆشی چارەسەر بکەم، ئەگەر دەرئەنجامێکی باشیشی لێنەکەوتەوە، ئەوا خەتای خۆتانبووە. دواتر کەسێکیان نارد بۆ لام و داوای لێبووردنی لێکردم و پێی وتم: بە هۆی ئەو ڕوونکردنەوەیەی من خستومەتە ڕوو، خەڵکی کرماشان ئامادەن لەگەڵمدابن و کۆتایی بە پرسەکە بهێنین.

دوای چەند ڕۆژێك خێڵی سنجابی و کەڵهوڕ ئاشتبوونەوە و ڕەئوف گوتبووی پێویستە چەند کسێك لە پیاوماقوڵانی بڕۆن و سەبارەت بە و کارە داوای لێبووردن لە حەقی بەگ بکەن، بەڵام

ئەوەش ئەوندە ئاسان نەبوو چەند کەس پەیدا بکاو بینرێتە لای، چونکە خەڵکی شار داستانی زۆریان لە بارەی رەوشتی خراپ و رەفتاری رەقی تورکانەوە بیستبوو، رەئوف بەگ دەیەویست ئاسایش وەدەست بینیٚ، بەو مەرجەی هوزەکان هێرش نەکەنە سەری.

رۆژی **١٧** ی حوزەیران (**٤** ی شەعبان) شەڕ لە نێوان کرندییەکان و سوپای دەوڵەتی عوسمانی دەستی پێکرد. کرندییەکان هەڵاتن (**سەیری نامەی ئیحتشام ولمەمالك فەرمانداری کرند بکە**)[١].

ئەم هەواڵە بە هەموو شاردا بڵاوبۆوە و **سەردار جەلالی** کارگێڕ، کونسوڵی ئەڵمان و عوسمانی و **کۆنت دوکانتیس** و منیان بانگهێشت کرد و لە کۆبوونەوەیەکدا دەستمان کرد بە ئاڵوگۆڕی بیر و را، کە چۆن رێگە لەو شەڕە بگرین.

مسیۆ شونمان پێشنیازی کرد کە نوێنەرانی خەڵك، نوێنەرانی کارگێڕی، هەردوو کونسوڵەکان و کۆنت دوکانتێس و من، دەبیٚ بڕۆین **رە ئوف بەگ** و عەشیرەتکان ئاشت بکەینەوە.

رۆژی **٢٠** ی حوزەیران ( **٧** ی شەعبان) هەموومان وەڕێکەوتین، تەنیا کونسوڵی عوسمانی نەبیٚ، کە چاوەڕوانی فەرمانی راستەوخۆی وەزیر موختاری تاران بوو. چەند نامەمان بۆ سەرۆك عەشیرەتەکان و **رەئوف بەگ** نووسی و وتمان کە لە **هارون ئاباد** چاوەڕوانیان دەکەین. سەرلەبەیانی رۆژی **٢٢** ی حوزەیران (**٩**ی شەعبان دەنگی تۆپباران دەهات، بە دڵنیاییەوە دیار بوو عەشیرەتەکان و رەووف بەگ کەوتوونەتە شەڕ. مسیۆ شونمان بۆ گفتوگۆ بەروە لای عەشیرەتەکان رۆیشت، من و **کۆنت کانتیس** بۆ لای **رەئوف بەگ** رۆیشتین. شاری کرند کەوتۆتە ناو **دەربەندی کیۆ** و لە باکوور و باشوورەوە درێژ دەبێتەوە و بەشی باشووری کەوتۆتە دەشتی کرند.

باکوور و باشووری شار، باغ و باغاتی زۆر فراوانی لێیە، کە بە دیواری بەرد شوورەیان بۆ کراوە. سوپای دەوڵەتی عوسمانی لەسەر تەپۆلکەیەکی رۆژئاوای شار نیشتەجیٚ بوو. عەشیرەتی سنجابی و عەشیرەتی گۆران، شەو سوپای دەوڵەتی عوسمانیان گەمارۆ دابوو. تا بەردەم چادرەکانی تورکان پیشرەویان کرد و گەمارۆیان دان. یەکسەر وەك نەریتی خۆیان ( عەشیرەتەکان) دەستیان کرد بە تاڵان کردن. تورکەکانیش بە هەلیان زانی، کۆبوونەوە و بە

١- بگەرێوە بۆ بەڵگەنامەی ژمارە ١٤٨.

گولله باران و دواتر تۆبباران، پاشەکشەیان بە عەشیرەتەکان کرد. کاتژمێر پێنجی دوای نیوەڕۆ کاتێك ئێمە گەیشتین باردۆخەکە هەر بە و جۆرە بوو کەباسمان کرد و بەرای من زیانەکان بەم شێوەی خوارەوە بوو:

گۆرانەکان (**١٠٠**تا**٢٠٠**) کەس ، سنجابیەکان **١٥** تا **٢٠** کەس و لە تورکەکانیش کۆژرابوو، لە هەردوو لا نزیکەی (**٣٠٠**) کەس کوژرابوو. مسیۆ شونمان لەلای عەشیرەتەکان گەڕایەوە و گوتی ئەوان بەمەرجێك کۆتایی بە شەڕ دەهێنن، کە دوای شەڕ **رەئوف بەگ** بگەڕێتەوە. رەئوف بەگیش بەمە رازی بوو بەو مەرجەی لە لایەن عەشیرەتەکانەوە دەسدرێژی نەگرێتە سەر و ئەو لیژنەیەی بۆ ئاشتەوایی بانگهێشت دەکرێ کۆتایی بە کێشەکە بهێنێ. ناوبراو دڵنیا کرایەوە و بڕیار درا، لەگەڵ نوێنەرەکانی شار لە **خەسرەوئاباد** کۆببینەوە، تێکڕای سەرۆك عەشیرەتەکان و تەنیا نوێنەرێکی رەئوف بەگ لەوێ ئامادە بوو.

فەرمان درا بە سەربازەکانی عوسمانی کە دەست لە شەڕ هەڵگرن و لە ماوەی دوو کاتژمێردا بێدەنگی و ئارامی هاتە ئاراوە و عەشیرەتەکانی ئێرانیش لە سەنگەر و پێگەکانیان کشانەوە.

**٢٩** ی حوزەیران (**١٦**شەعبان) کۆبوونەوەی ئاشتەوایی لە **خوسرەوە ئاباد** ئەنجام درا، بڕیارنامە یا پەیماننامەی هاوپێچ[١] سەر لە بەیانی رۆژی **٣٠** حوزەیران (١٧ ی شەعبان) و واژۆ کرا و سوپای عوسمانی بەرەو سەپول گەڕانەوە و تائێستاش هەر لەوێ نیشتەجێن.

**سەن سۆن** سەرۆکی پۆلیسی کرماشان

(ك٤٠٨٥/٢٣تا ٣٢)

---

١ - بگەڕێوە بۆ بەڵگەنامەی ژمارە ١٣٦.

## (١٤٦)

**(نامەکانی سالار ئەفخەم)**

**دەقی نامەی سالار ئەفخەم**

گرتیانم و بردیانم بۆ لای رەئوف بەگ و لەبەردەم کونسولّی عوسمانی دا فەرمانیان پێکردم (بە خەتی خۆت بنووسە کە سوپای عوسمان تۆپبارانی کرندی نەکردووە و دەستدرێژی نەکردۆتە سەر ژنان و کیژانی کرندی).

من وتم خوێندەواریم نییە و لە ترسی ئەوەی نەکو بمکوژن وتم: سکرتێرەکەتان بینووسێ و منیش واژۆی دەکەم، ناوبراو نووسی و منیش بە ناچاری واژۆم کرد.

**سالار ئەفخەم**

دەقی نامەیەکی تری (**سالار ئەفخەم**)

دوو رۆژ پێش شەڕ، هەولّیان دەدا بەهانە بەدەست بێنن، ناردیان مەزرایەکی کرندیان تالاّن کرد، بە تاوانی ئەوەی سەربازەکانی عوسمانی رویشتوون بۆ ئەوێ و بە باشی پێشوازی لێنەکردوون، چوار کەسیان کوشتووە و گوللەبارانیان کردوون. دەیانگوت هەموو شوێنێك وێران دەکەین.

**(ك٤٠٨٥/٢٢)**

**سالار ئەفخەم**

## (١٤٧)

**(راپۆرتی سنوور پارێزی زهاو)[1]**

**وەزارەتی ناوخۆ**

**دەقی نێردراوی سنوورپارێز ٢٠ ی شێر (١٢ رەمەزان) ی ١٣٣٣**

جەنابی سنوورپارێز. لەسەر داوای من باسێکت لەسەر سەلامەتی خۆتان و رووداوەکانی ئەوێ نووسیوە، سوپاستان دەکەم، لەو رۆژەوە تا ئێستا کە سەربازەکانی عوسمانی هاتوونەتە ناو خاکی ئێران، لوتف بکەن وەڵامی ئەم پرسیارانەی خوارەوەم بۆ بنووسن.

ئایا بیستووتە حوسێن رەئوف بەگ فەرمانی تاڵان کردنی داوەو و لەو تاڵانەش بەشێکی بۆخۆی هەڵگرتووە و بڕێکیشی بەسەر ئەوانی تردا دابەش کردووە؟

## وەڵامی سنوورپارێز

جەنابی کاپیتان سەن سۆن، لە وەڵامی پرسیارەکانی بەرێزتاندا، **یەکەم:** هەموو ئەو زیانە گەورانەی بە هۆی سوپای عوسمانییەوە بەر من و دانیشتووان کەوتوون، راستەوخۆ بە خزمەتتانم راگەیاندووە، **دووەم:** پێویست بەروونکردنەوە و وەبیرهێنانەوە ناکات.

(١) سەبارەت بەم پرسیارە، کە من بینیومە یا بیستوومە، کە رەئوف بەگ فەرمانی تاڵان کردنی کرندی داوە. سەربازەکانی عوسمانی بە ئاشکرا و بە رۆژی رووناك، موڵك وماڵی ئەوێیان تالانکردووە و بەشێك لە و تاڵانەیان لە چادری **حوسین رەئوف بەگ** دا کۆکردۆتەوە و دواتر ناوبراو فەرمانی داوە بە **تۆفیق بەگ،** کە بەسەر کاربەدەستە پلەدارەکاندا دابەشی بکات و ئەو تاڵانەی بردووە بۆ خانەقین و شوێنەکانی تر، تەنانەت لەو تاڵانە بەشی پیاوانی کونسوڵگەری عوسمانیشی داوە.

---

١- دەقە فەرەنسیەکەی بە ژمارەی (٢٠/٤٠٨٥).

سەبارەت بە پرسیارەکەت لەمەڕ تالآن کردن سەرم سوڕماوە. چونکە من هاواری ئەو ژنە کرندییانەم دەبیست کە لە لایەن عوسمانییەکانەوە دەسدرێژییان دەکرایە سەر. سوپای عوسمانی درێغی نەکردووە لە تالآن و کوشت و بڕ و ئابڕووبردن و ماوەی چواردە رۆژە کرند لەبەردەم تالآن و دەستدرێژی ئابڕووبردن دایە. ئەمەش شتێکی شاراوە و نهێنی نەبووە و جەنابتان هاتوون بۆ ئەوێ و خانووە وێرانکراوەکانت بە چاوی خۆتان بینیوە. کرند ئیتر وا بە ئاسانی ئاوەدان ناکرێتەوە. **سەرۆکی سنوورپارێزی**

(ك ٢١/٤٠٨٥)

## (١٤٨)

**(راپۆرتی ئیحتشامولمەمالك کرندی بۆ کاپیتان سەن سۆن)[١]**

**وەزارەتی ناوخۆ دەقی نووسراو**

لەو کاتەوە کە عوسمانییەکان هاتوونە ناو **قەسر**، چواردە ئاوایی دەوروبەری **قەلاسەوزە**یان وێران کردووە و، سەربازی عەشیرەتەکانیش تالآنی ئەو لادێیانەیان لە ناو خۆیاندا بەشکردووە. دواتر کوێخاکانی قەسریان دەسگیر کردووە و چوار هەزار تمەنیان وەك سزا لە خەڵکی ئەوێ وەرگرتووە. ژمارەیەکی زۆر لە بازرگانان لێرە هەڵاتوون و هێشتا نەگەڕاونەتەوە, چونکە هەموو ماڵ و سامانیان بە تالآن بردوون. چەند کەس کە لەوێن دەڵێن تەنیا تالانێکیان ١٣٩٠ فەردە قەند بووە و تایفەکانی عوسمانی لەگەڵ رەئوف بەگ شەش گوندی **ئیحتشام ولمەمالك** و **نەصیر ئاباد**یان تالآن کردووە. کە گەیشتوونەتە سەرپوڵ، ئەوێ و دەوروبەریان تالآن کردووە، لە بەروبوومی تەڕو وشك لەوەڕاون و ئەویتریان سووتاندووە.

لە **پاتاق** شانزە ئاوایی **پاتاق** و **میان تاقیان** تالآن کردووە، هەر شتێکیان بەرچاو کەوتووە بردوویانە، ئەو بەرووبومەی هێشتا کامڵ نەببوو سوتاندووە.

هەمان بەڵایان بەسەر **سورخەدیزە** دا هێناوە، کە بە چاوی خۆت بینیوتە، سەرەڕای ئەوە چەند کەسێکیشان لە دانیشتوانەکەی کوشتووە و، **٣٥** تفەنگیان لێ ستاندوون و دواتر

---

١ - دەقە فەرەنسییەکەی هەیە بە ژمارەی ١٦/٤٠٨٥ و ١٧ و ١٨.

هاتووونەتە **سەرمیل** و مەڕو ماڵاتیان بەناو دەغڵ و دان وەرکردووە، هەموویان وێران و هەندێك خانوویان خراپ کردووە، وەلێ نەیانسوتاندوون.

دوای ئەوە بە (٤٠٠) سەربازەوە هاتوون بۆ **کرند** و داوای (٤٠٠) سەربازیشیان لە **ئیحتشامولمەمالك** کردووە و پێشنیازیان پێکردووە، پەیمانێکیان لەگەڵ ببەستێ. ئیحتشام ولمەمالك، وەڵامی داوەتەوە کە (٣٠٠) ساڵە باوباپیرانی بە راستی و راستگۆیی خزمەتی ئێرانیان کردووە و بە بێ مۆڵەتی دەوڵەتی ئێران، ناتوانێ ئەو کارە بکات و باشترە ئەو پێشنیازە بۆ دەوڵەتی ئێران بکەن و دەوڵەتی ناوندی چی بەباش زانی و هەر دەستوورێك لەلای ئەوەوە دەربچی جێبەجێی دەکەم. دوای ئەوە عوسمانییەکان دەستیان کرد بە بیانوو گرتن و پێیان گوت دەبێ پەیوەندیت لەگەڵ عەشیرەتەکان بپچڕی و ئەگەر کەسێك لە لایەن ئەوانەوە بێ دەبی رادەستی ئێمەی بکەی.

دوای ئەو رووداوە من خۆم چووم بۆلای **حوسێن رەئوف بەگ** تا چارەسەری واقعەکە بکەم، دوای ئەوەی گەیشتمە لای و باسی ئەو وێرانیانەم بۆ ناوبراو کرد کە لەسەر رێگا ئەنجامیان دابوو، **رەوشەنی بەگ** لە وتەکانم تووڕەبوو رووی دەمانچەکەی تێکردم، وەلێ **محی دین بەگ** دەستی گرت و نەیهێشت، دوای ئەوەی سووکایەتییەکی زۆریان پێکردم، گەڕامەوە. دوای نیوەڕۆی هەمان رۆژ **مەحموود پاشای عەشیرەتی موردای** هاتە لام و، وتی **رەئوف بەگ** منی ناردۆتە لات کە تۆ و **سالار ئەفخەم** ببەم بۆ لای کە لە هەڵەکانتان ببورێ. من یەکسەر کوڕەکەم نارد و دوای گەیشتنی، رەئوف زیندانیی کردبوو و ماوەی (٢١) رۆژ مایەوە تا ئێوە خۆتان رزگارتان کرد.

دوای ئەوە، **عوسمانییەکان** پەیوەندی هاتوچۆیان لەگەڵ **کرند** دامەزراند و من پەیامم بۆ رەئوف بەگ نارد، کە هاتوچۆی ئەوان رەنگە ببێتە هۆی ناکۆکی و پێکدادان و باشترە فەرمان بە داورودەستەی خۆی بدات، واز لەو هاتوچۆیە بێنن و ئەگەر شتێکیان پێویست بوو، من خۆم بۆیان دەنێرم.

چوند رۆژێك دوای دەسگیر کردنی کوڕەکەم، دەستیان کرد بە کوشتاری خەڵك، **حاجی سەید حاتەم** کە یەکێك بوو لە پیاوە بەڕێزەکانی کەرند، لەگەڵ چواردە کەسی تر گوللە بارانیان کرد. دواتر داوایان لێکردم کاروانسەرای **زەوارنشین** چۆڵ بکەم و چەند ژنێك لەوێ دابنێم نانیان بۆ بکات.

لەبەرئەوەی ئەم پرسە تەنیا دەستریژی بوو بۆ سەر ژنان، خەڵکی کرندی هەژاند و دوای ئەوە **سالار ئەفخەم** داوای کرد، بۆ ماوەی بیست و چوار کاتژمێر، شاری کرند رادەستی ئەوان بکەین (ئەمەش داوای رەوشنی بەگ بوو) و دوای ئەوە دەڤەری **زەردە رشیو**[1] یان داگیر کرد و خەریکی وێران کردن و دەسدرێژی بوون بۆ سەر ژنان و خەڵکی بێچارەی ئەوێ و تەنانەت چوار خزمی ئێمەیان لەبەر دەرگای ماڵەکیاندا کوشتبوو، هەر ئەم رەفتارە خراپەی عوسمانییەکان، بوو بەهۆی هەڵگیرسانی شەڕ و پێکدادان و دوای دوو رۆژ **عەبدولسەلامی** نارد بۆ لام و داوای رێککەوتن و ئاشتەوایی کرد، منیش بە پێی پەیوەندی ئیسلامی و دینی ئیسلام، ئامادەبووم بچم بۆ لایان و رێکەوتین. لە کاتی گەڕانەوەمدا ویستیان بمکوژن، بەڵام بۆیان نەکرا. دوای ئاشتەواییش، زۆر کردەوەی خراپیان ئەنجامدا و دەستیان کرد بە کوشتنی تاك تاکی خەڵك. عەشیرەتەکانی دەوروبەر کە ئەم رووداو تاڵانەیان بینی، هاتن بۆ یارمەتیدانی خەڵکی **کرند** و شەڕ دەستی پێکرد و ماوەی دوانزە کاتژمێری خایاند، ژن و پیاو ناچار بوون رابکەن و ئێمەش کرندمان چۆڵ کرد و عوسمانییەکانیش دەستیان کرد بە کوشتار و تاڵان کردن، وێرانییەکە بە شێوەیەکە، کە ئێوە دەتوانن بە چاوی خۆتان ببینن.

دوای پەیمانی **خەسرەو ئاباد**، بڕیار بوو سوپای عوسمانی بگەڕێتەوە بۆ سەرپوڵ و بە پێی ئەو زانیارییانەی پێمان گەیشتووە، لە سەر رێگا چل و چوار کەسیان کوشتووە و چەند تەرمێکیشیان سوتاندووە.

بە پێی لێکۆڵینەوەی ورد، ژمارەیەکی زۆر ژن و پیاو و منداڵی کرند و دەوروبەر بە هیلاك چوون و کوژراون و (٥٠٠) کەسیش لە عەشیرەتەکان کوژراون.

واژۆ: **ئیحتشامولملك** – **سالار ئەفخەم**- رەجەب عەلی سنوورپارێز.

(١٤/٤٠٨٥ و ١٥)

---

١- لە دەقە سەرەکییەکەدا کە بە فەرەنسییە Zardeh Reechvee نووسراوە.

## (١٤٩)

**(وەزارەتی ناوخۆی بۆ وەزارەتی دەرەوە، کۆتایی شەوالی ١٣٣٣)**

**وەزارەتی ناوخۆ، ژمارەی تۆمارکراوی نووسراو١١٤٢١/١٨٥٤، تاران بەرواری کۆتایی شەوال ١٣٣٣**

وەزارەتی پایە بەرزی کاروباری دەرەوە، نامەی بەرێزتانمان پێگەیشت، کە بە ژمارەی **٨٩٨٩/٢٧٦٨** سەبارەت بە دیداری مسیۆ شونمانی ئەڵمانی لەگەڵ **عەبدوڵلا خانی کەڵهوڕ**[١] و تێلگرافی رەمزدار، کە لە کارگێڕی ئەوێوە گەیشتووە. سەبارەت بە بارکردنی جبەخانە، لە تێلگرافی ژمارە **١١٦١**ی کارگێڕیدا ئاماژەی پێکرابوو و تێلگرافێکیش لە **نایب لحکومەی** کرماشانەوە گەیشتبوو[٢]. بەڵام سەبارەت بە دیداری **عەبدوڵلاخانی کەڵهوڕ** لەگەڵ **مسیۆ شونمان**، هێشتا هیچ زانیارییەك بە وەزارەتی ناوخۆ نەگەیشتووە و چونییەتی ئەو کارەم بەتایبەتی لە یاریدەدەری حکومەتی کرماشان وەرگرتوو و ئەنجامەکەی بە وەزارەتی پایەبەرزتان رادەگەیەنم.

(ك ٤٣٣٨)

---

١- بگەڕێوە بەڵگەنامەی ژمارە ١٤٢.

٢- بگەڕێوە بۆ بەڵگەنامەی ژمارە ١٤١.

## (١٥٠)

**(راپۆرتی کارگێڕی کرماشان، یەکەمی زیقەعدەی ١٣٣٣)**[1]

**وەزارەتی کاروباری دەرەوە، بەڕێوەبەرایەتی وڵاتانی نادراوسێ، دەقی وەرگێڕاوی ڕەمزداری کرماشان، بەرواری ژمارەی زیقەعدە ١٣٣٣، ژمارە ١٢٢٩**

ئەمڕۆ **نایب لحکومە،** بەنهێنی پەیامێکی بۆ بەندە نارد، کە دوێنێ چل و شەش بار ئازوقە، کە دووباریان تۆپ بووە، لەگەڵ سی و هەشت کەسی سوارە، کە چواریان نیشانی ئەڵمانیان پێوە بووە و ئەوانی تر بە جل و بەرگی عوسمانییەوە هاتوونە کرماشان. **شوێنمان** ویستی خانوویەکی بەرزی ئێرە، کە بەسەر هەموو شادرا دەڕوانێ، بە نرخێکی گران بەکرێ بگرێ، وەلێ خاوەن ماڵەکە رازی نەبوو. کۆتایی شەوال. لەگەڵ دەقەکە یەکە.

(واژۆی) وەزارەتی کاروباری دەرەوە، بەڕێوەبەرایەتی نووسراوەکانی وڵاتانی نادراوسێ **١٣٢٨.**

(ك ٤٣٤٨)

---

١ - وەزارەتی کاروباری دەرەوە لە نامەی ژمارە٩٢٥٨/٢٨٢٨، بەرواری ٤ ی زیقەعدەی ١٣٣٣ دەقی ئەم نامەیەی ناردووە بۆ وەزارەتی ناخۆ.(ك٤٣٣٨).

## (١٥١)

**(لە سەرۆك عەشیرەتەکانی کرماشانەوە بۆ ئەنجومەنی شۆرای میللی)**[1]

**ئەنجومەنی شۆرای میللی، ژمارە ٢٣٦٠**

**دەقی تێلگرافی گەیشتوو لە کرماشانەوە، ژمارە ١٠٩**

لە ڕێگەی وەزارەتی پایە بەرزو نوێنەرانی بەڕێزی کرماشان، بارەگای پیرۆزی **دارلشۆرای میللی** خوا پایەداری کات، ئەنجومەنی بەرێزی وەزیرانی پایەبەرز هەرشکۆدار بێ. کۆپی **نەوبەهار و شوری** و **ستارەی** ئێران، لە بارودۆخی داگیرکردنی ئەم سەرسنوورە و ئەو ڕووداوە وێرانکارییانەی، لەم ماوەیەدا بەسەر نۆکەرتان و عەشیرەتە بەدبەختەکانی کرماشاندا هاتووە، ئاگادارن و هەرچەند بە هۆی تێلگرافەوە، بەردەوام بە کاربەدەستانی بالاّ و نوێنەرانی دەوڵەت راگەیەنراوە، بێ سوود بووە. بە تەواوی بێ هیواو ناچارین کە باسی گرفتاری و بێ چارەیی خۆمان دووبارە بکەینەوە، یا ئەوەتا مەرحەمەت بفەرموون ئەم سەرسنوورە رزگار بکەن، یا وەڵامی یەکلایی کەرەوەمان بدەنەوە، کە بێ هیواو بە ناچاری رازی بین بە لەناوبردنی خۆمان و تا دوایین هەناسەی مردن هەوڵ بدەین. حاڵ و ئەحواڵی عەشیرەتەکان، تا ئەمڕۆ بە هۆی ئەوەی لە کوێستانەکان نیشتەجێن و لە شوێنێکی بەربلاّو دان، هەرچەندە لە لایەن دراوسێکانەوە تووشی کوشتار و تالاّنێکی زۆر بوون، بەلاّم بە ئەندازەیەك شەپرێو نەبوون داوای وەلاّمی یەکلاکەرەوە و هێندێك هەنگاوی بوێرانە بکەن، هەروەها بە هۆی قەیرانی کابینەوە دەرفەت نەبوو. لە ئەنجومەنی **خەسرەو ئاباد**، بە ئامادەبوونی **مەعازید ولمەمالیکی** کارگێڕ و جەنابی **کاپیتان سەن سۆن** و نوێنەرانی وڵاتە گەورەکان، لەگەڵ سەرۆك عەشیرەتەکان کۆبوونەوە و دوای گفتوگۆ و گرێبەست کە **حوسێن رەئوف بەگ** لە کرند گەڕایەوە، بڕیار درا هەرکاتێك دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران پەسەندی کرد و لەلایەن سەفارەتی گەورەی عوسمانی فەرمانی

---

١ - ئەنجومەنی شۆرای میللی لە نامەیەکدا بە ژمارە ٢٣٦٠ بەرواری کۆتایی زیقەعدەی ١٣٣٣، کە دەقی تێلگرافی گەیشتووی سەرۆك غەشیرەتەکانی کرماشانی ناردووە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، داوای کردووە: (سەبارەت بە داواکامی ئەوان خێرا بکەونە کار ئەنجامەکەشی بە ئەنجومەن رابگەیەنن کە وەڵامەکەی بە تێلگراف بنێرن) (ك٤٠٨٥).

دەرکردنی **حوسێن رەئوف بەگ** درا، یەکسەر ئۆردوو وەخۆکەوێ و سەرسنوور چۆڵ بکات. پێمان وابوو کاربەدەستانی باڵای دەوڵەت و نوێنەرانی خەڵك، خێرا ئەم هەنگاوە دەنێن و ئەم خڵکە بەدبەختە رزگار دەکەن. هەمووان چاوەڕوان بوون، جگەلەوە تێلگرافێکمان ناردە خزمەتتان و هەرگیز ئەنجامی نەبوو، تا ئەم ماوەیەش **رەئوف حوسێن** هەر لە **پاتاقەوە** تا **قەسر و قەڵاسەوزە** دایکوتاوە و لە هەموو شوێنێك سەربازی داناوە و ناوەندی ئۆردووەکەشی سەرپوڵە و، بە چەندین شێواز خەریکی وێران کردنی ئەم سەرسنوورەیە. **یەکەم** هەرکەسێك بگرن،لە پلەدار و پلە نزمی عەشیرەتەکان و رێبوارانی ئێرانی، مسۆگەرە گوللەبارانی دەکەن. **دووهەم** هەرچی مەزرا و لەوەرگای دەوڵەت و عەشایرە، هەموویان سوتاند. رابردووشیان سەبارەت بە گیان و ماڵ و ناموسی **قەڵاسەوزە** و **قەسر** و **سەرپوڵ** و **پاتاق** و **سورخە زەردە** و **کرند**، تا دەگاتە خاکی **هاڕون ئاباد**، روون و ئاشکرایە. لەمڕۆ بەدواوە تێکڕای عەشیرەتەکان، مەڕومالاتی خۆیان لە هاوینە هەوارەکانەوە دەگوێزنەوە بۆ گەرمێن. بە بوونی **رەئوف حوسین بەگ،** لە هەموو خاڵە سنوورییەکان و ئەو زانیبارییانەی لە بارەی عەشیرەتەکانەوە هەیەتی، چار چییە و دەبێ چیبکەین؟ لە بەرئەوەی بە تەواوی دەستتان لەم سەر سنوور و عەشیرەتانە نەشۆریوە، وەڵامی ئازادکرنمان بۆ بنووسن تا بە ئارەزووی خۆمان رێگە چارەیەك بدۆزینەوە و ئەگەر ئێرانین و رۆڵەی ئێرانین، بیرێك لە حاڵی ئێمە بکەنەوە. لە کاتی نووسینی ئەم عەریزەیە، تێکڕای عەشیرەتەکان گەورە و بچوك لە **هاڕون ئاباد** کۆبوونەتەوە و چاوەڕوانی رزگاری بەپەلە، یا وەڵامێکی بێ ئومیدیی دەوڵەتی خۆمانین و هەر عەشیرەتێکیش نوێنەرێکی بۆ شار بۆ دارولدەولە ناردووە ، کە وەڵامی یەکجارەکی وەربگرنەوە و بۆ ئەوەی زیان بەر ماڵ و موڵکی **ماهیدەشت** نەکەوێ، ئەنجومەنی گشتی لە **هاڕون ئاباد** کۆبۆوە و بە حاڵی نائاسایی چاوەڕوانی وەڵامی بەپەلەین.

**حوسین سەردار موعەزەمی گۆران، شێر موحەممەد صمصامولمەمالکی سنجابی، عەلیموراد ئیحتشامولمەمالکی کرندی، سلێمان سەردار نوسرەتی کەڵهوڕ، قاسم سەردار ناسری سنجابی، عەلی ئەکبەر سەردار موقتەردی سنجابی، عەباس سەردار ئیقبالی کەڵهوڕ، مەجید سالار سوڵتانی باجەلان، ئیسماعیل سالار ئەفخەمی کرندی، غولام عەلی سالار مەنسوری گۆران.**

(ك٤٠٨٥/٣ و٤ و٥)

## (١٥٢)

**(لە حکومەتی هەمەدانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، یەکەمی زیقەعدەی ١٣٣٣)**

**بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، لە هەمەدانەوە بۆ تاران، ژمارەی تێلگراف ٣٥١، بەرواری ناردن ٢٠، بەرواری گەیشتن ٢١ ی سونبولەی ١٣٣٣.**

مەقامی پایە بەرزی وەرزارەتی ناوخۆ، هەر شکۆدار بێ. بە پێی ئەرکی خۆم، بە پێویستم زانی جەنابی مویارەکتان لە بارودۆخی شاری هەمەدان ئاگادار بکەمەوە و پێشوەخت سەرنجی پێویستی ئەو وەزراەتە پایەبەرزە بۆ ئەم بابەتانەی خوارەوە رابکێشم، هەستی گشتی لە وروژاندایە و کونسوڵی رووس و ئینگلیس زۆر پێی سەغڵەتن و رەنگە هەڵچوونی خەڵك ببێتە هۆی چەکدار بوونی ژمارەیەك. لەبەرئەوە داواکارین بە پەلە رێنمایی پێویست بدرێ بە بەڕێوەربەرایەتی پۆلیس و ئێستاش دوور نییە لێرە ئاژاوەیەکی گەورە دروست بێت. غەرەی زیقەعدە، ژمارە ٣٠، **عەباس**.

(٢٩٠٠٠٤١٩)

## (١٥٣)

**(لە حکومەتی هەمەدانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ٣ ی زیقەعدەی ١٣٣٣)**

**بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، لە هەمەدانەوە بۆ تاران، ژمارەی تێلگراف ٢٨٤، بەرواری ناردن ٢٠، بەرواری گەیشتن شەوی ٢١ ی میزانی ١٣٣٣.**

مەقامی پایەبەرزی سەرۆك وەزیران و وەزارەتی ناوخۆ، هەر شکۆدار بن. دەسنووسی رەمزداری تێلگرافەکەتانمان زیارەت کرد[١]، **ڤیسی**[٢] کونسوڵ رۆیشتووە بۆ **مەلایەر**، دوو رۆژی تر دەگەڕێتەوە و دەست بە دانووسان دەکەم. دیدارم لەگەڵ جێگرەکەیدا کرد. رایگەیاند کە لە سەفارەتەکەیانەوە تێلگرافیان پێگەیشتووە. ئومێدەوارم بە روحمی حەزرەتی ئەشرەف و

---

١- لەم کۆمەڵە بەڵگەنامەیەدا بەدی نەکرا.

٢- مەبەست ڤیبەر ڤیس کونسوڵی ئەڵمانە.

بایەخپێدانی تایبەتی جەنابتان، هەموو کاروبارەکانی ئەم ناوچەیە بە زووترین کات باش ببێت، شار و دەوروبەریشی لە نەزمی تەواو دایە. ژمارەی **٤٩**، **٣ ی زیحەجە**. **عەباس**.

(٢٩٠٠٠٥٤٨)

## (١٥٤)

**(لە حکومەتی هەمەدانەوە بۆ سەرۆك وەزیران، ٧ ی زیقەعدەی ١٣٣٣)**

**بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، لە هەمەدانەوە بۆ تاران، ژمارەی تێلگراف ٣١٩، بەرواری ناردن ٢٤ ی، بەرواری شەوی ٢٥ ی میزانی ١٣٣٣.**

تاران، مەقامی پایە بەرزی سەرۆك وەزیران، هەرشکۆدار بێ. بۆ بەدواداچوونی دەسنووسی تێلگرافی راستەوخۆ. هەر کە **ڤیبەر ڤیس** کونسوڵی ئەڵمان بۆ هەمەدان گەڕایەوە، دیدارم لەگەڵدا کرد. دوای گفتوگۆی زۆر بۆ چاکسازی کاروبارەکان، تەنیا بەیەك مەرج رازییە کە لە خوارەوەدا بە خزمەتتانی رادەگەیەنم، ئەویش ئەوەیە دڵنیا بکرێتەوە. **یەکەم:** دڵنیا بن لەلایەن دەوڵەتەوە، سوپای رووس بەرەو هەمەدان نەبرێ، **دووەم:** چل و پێنج سواری رووس، کە لێرەن بگەڕێنەوە و کونسوڵەکانی رووس و ئینگلیز قەناعەت بە قۆزاقەکانی ئێرانی بکەن. **سێیەم:** دووسەت پۆلیس بۆ هەمەدان بنێردرێ. لەم رووەوە جەنابتان گفتوگۆ بکەن، تا دڵنیایی تەواو لە رووسەکان وەربگیرێ، کە سوپا نەهێنن بۆ هەمەدان و ئەوانی کە لێرەشن بگەڕێنرێنەوە و ئەو کاتە گفتوگۆ دەسپێبکات، کە کونسوڵی ئەڵمانیش سوارە بەکرێ نەگرێ. پۆلیسش زۆر پێویستە و ئەگەر فەرمان دەربکەن **مێجەر محەمەد تەقی خان** لەگەڵ چەند پۆلیسێك بگەڕێنەوە ئێرە. لەم کاتە مەترسیدارەدا، پێویستە هەرچی زووە گفتوگۆی پێویست ئەنجام بدرێ، تا بە یارمەتی خوداوەند و مەرحەمەتی حەزرەتی ئەشرەف، رووداوێکی خراپ روونەدات. لەم کاتەدا ئەوپەڕی ئاگاداری و یەکگرتوویی پێویستە و هەرچی زووە هەوڵ بدرێ ئەم ئاسایشە بکرێتە هەمیشەیی. ٧ ی زی حەجە، ژمارە ٥٠ **عەباس**.

(لە پەراوێزدا) ژمارە ٢٩١، بێ بەروار.

تێلگراف بۆ **سالار لەشکر** بکرێت، لەبارەی قۆزاقەکانی رووس، گفتوگۆ لەگەڵ لایەنی پەیوەندیدار بکرێ

دڵنیام بەم زوانە بگەڕێنەوە. (واژۆی **فەرمانفەرما**).

(٢٩٠٠٠٥٧٩٨)

## (١٥٥)

**(بەیاننامەی یەکگرتنی دەستە سیاسییەکانی کرماشان)**

**وەزارەتی کاروباری دەرەوە، بەڕێوەبەرایەتی نووسراوەکانی عوسمانی، بەرواری ٨ ی مانگی زیقەعدەی ١٣٣٣، ژمارە١١٢٤/٩٣٥٩، هاوپێچ لەگەڵ بڕگەیەکی دەقەکە.**

وەزارەتی پایە بەرزی ناوخۆ، بە پێی ئەو رەمزەی لە کارگێڕی کرماشانەوە گەیشتووە، سەرکردەکانی دەستە وتاقمە سیاسییەکان بەم دواییانە کۆبوونەتەوە، لە نێوان خۆیاندا گرێبەستێکی یەکگرتنیان واژۆ کردووە، کە وا بۆ ئاگاداری ئەو وەزارەتە پایە بەرزە، دەقی بڕگەکانی دەنێرین.

(مۆر) وەزارەتی پایە بەرزی کاروباری دەرەوە.

## وەزارەتی کاروباری دەرەوە

دەقی رێککەوتنی دەستە سیاسییەکانی کرماشان کە بە رەمز لە کارگێری ئەوێوە گەیشتووە.

١- ئێمە ئامادەبووان خەڵکی کرماشان و هیتر کە ئێرانی و موسوڵمانین، ئامادە بووین بۆ پاراستنی وڵاتی ئێران و وەدیهێنانی ئەو فاکتەرانەی بەرژەوەندی گشتی خەڵکی ئێران لەخۆ دەگرن، دڵسۆزانە یەکبگرین و رێککەوین.

٢- یەکگرتنی تێکڕای خەڵك، لە رووی حەقیقەت و یاسا بۆ رێگرتن لە بێگانان بێ جیاوازی، تا نەتوانن وەك خاوەن موڵك لە ئاو و خاکی ئێمەدا بجوڵێنەوە و بەرژەوەندی ئێمە بۆ مەبەستەکانی خۆیان پێشێل بکەن.

٣- پاراستنی بنەماکانی بێلایەنی دەوڵەت و نەشکانەوە بەلای هیچکام لە دەوڵەتەکانی دژیێکدا، بە پێی پێویستی کات.

٤- رێگرتن و لابردنی ئەو کەسانە، کە دەربکەوێ بە پێچەوانەی بەرژەوەندییەکان دەجولێنەوە و کەموکوڕی لەم پەیمانەدا وەدیدێنن.

(ك ٦٢٦٧)

## (١٥٦)

**(لەوەزارەتی ناوخۆوە بۆ حکومەتی هەمەدان، ٦ ی زیحەجەی ١٣٣٣)**

**وەزارەتی ناوخۆ، ژمارە ٧٥٦، بەرواری ٦ ی زیحەجەی ١٣٣٣**

حکومەتی پایە بەرزی هەمەدان، لە بەدواداچوونی تێلگرافی ژمارە ٢٢١١[١]، ناچارم بنووسم، کە بە پێی وتەکانی کونسوڵی رووس بۆ وەزارەتی کاروباری دەرەوە، ئەم کەسانەی خوارەوە بزوێنەری فیتنە و گەندەڵین و خەڵك ناچار دەکەن کردەوەی پێچەوانەی بێلایەنی بنوێنن، **فەریدولدەولە، زەهیر دەفتەر، جەلالولمەمالك، رەزاخان بورهانولمتکلمین، ئیحسانوڵلاخان**، پێویستە راپۆرتەکە وەبیر ئەوان بهێنرێتەوە و تێبگەیەنرێن، کە ئەگەر ئەو هەواڵە راست بێت، جگە لەوەی کردەوەیەکی نابەجێیە و پێچەوانی رێبازی بێلایەنی دەوڵەتە، دەرئەنجامی خراپی دەگەڕێتەوە بۆ خۆیان. ئاشکرایە ئەو کەسەی بێ هێچ قازانجێك خۆی بە ملکەچی فەرمانەکانی دەوڵەت دادەنێ، نابێتە هۆی دەردەسەری خۆی و زەحمەت بۆ کاربەدەستانی باڵای دەوڵەت، ئەگەر راست بێت دەبێ شێوازی رەفتاری خۆیان بگۆڕن و رێگە نەدەن لە لایەن دەوڵەتەوە رەفتاری زبریان بەرامبەر بکرێ و ئەگەر دوور بوو لە راستییەوە، بە ئامرازی ئاقڵانە ئەم تۆمەتە لەخۆیان دوور بخەنەوە و تۆ ناچار بکەن کە بە ئامرازی پێویست بێ تاوانییان دەربکەوێ.

(٢٩٠٠٠٥٨٤٦)

## (١٥٧)

**(راپۆرتی تێلگرافی کرند، ١٢ی زی حەججەی ١٣٣٣)**

**بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، ٣٠ ی میزانی ١٣٣٣**

راپۆرتی کرند بەرواری **٢٩** (**١٢** زی حەجە) میزان. دیارە پێرێ کاپیتان سەن سۆن و ئەفسەرێکی ئەڵمانی لە کرند بوون. بە پێی گرێبەستێك کە بیست رۆژ پێش ئێستا، لە **ماهیدەشت** لە نێوان کاپیتان و سەرۆك عەشیرەتەکانی سەر سنوور بەسترا، **کەڵهوڕ** سێسەت

---

١- لەم بەڵگەنامانەدا بەدی نەکرا.

سوار و **سنجابی** سێسەت سوار، **قەڵخانی** دووسەت سوار و دووسەت پیادە، **کرند** سەت سوار و پەنجا پیادە یان هەبێ، مووچەی سوارە مانگی سی تمەن بە ئالیکی ئەسپەوە، پیادە ڕۆژی دوو قران وەربگرن. ئەو سوارانە لە کرند کۆبوونەوە، نۆسەت سوار و دووسەت و پەنجا پیادەیان دیوە و مووچەی بیست و دوو ڕۆژی پێشووی ئەوانە، دراوە بە سەرۆك عەشیرەتەکان و پسولەیان لێ وەرگرتوون.

**سەید محەمەدی تێلگرافچی.**

(ك١١/٤٣٤٤)

## (١٥٨)

**(نامەی سەفارەتی ئەڵمان بۆ وەزارەتی دەرەوە، ١٤ ی زیحەجەی ١٣٣٣)**[١]

**وەزارەتی کاروباری دەرەوە، بەڕێوەبەرایەتی ولاتانانی نادراوسێ، دەقی نامەی ئەڵمان بەرواری ١٤ ی زیحەجە (٢٤ ئوکتۆبەر ١٩١٥)، ژمارە ٥٥٤.**

بە پێی ئەو زانیارییانەی بە **دۆستدار** گەیشتووە، دووسەت قۆزاق بە دوو تۆپەوە بەرەو **هەمەدان** بە بەرێگای ناو شاخەکاندا تێپەڕیون. لەبەرئەوەی ئەو قۆزاقانە لە ژێر فەرماندەیی رووسەکان دان و دەوڵەتی پایەبەرز، هێشتا هێزی تەواوی لە پۆلیس بە فەرماندەیەکی بێلایەن بۆ ئەوێ نەناردووە، ئێستا سەرنجی جەنابتان بۆ ئەوگرفتانە رادەکێشین، کە لە ناردنی ئەو سوپایە بە سەرپەرشتی رووسەکان دروست دەبن.

تا لە هەر کردەوەیەکی هاندان دوور کەونەوە. کونسوڵی ئیمپراتۆریش هەروای کردووە و بە تێکڕای خەڵکی راگەیاندووە، لەبەر ئەوەی دوژمنان دەیانەوێ هێرش بکەنە سەری، ئەویش لە ڕووبەڕووبونەوە و دنەدان خۆی بە دوور دەگرێت.

---

١ - وەرزارەتی کاروباری دەرەوە لە نامەی ژمارە ١٠٤٢٣/٣٠٩٨ بەرواری ٢٢ ی زی حەجەی ١٣٣٣، ئەم نامەیە (بەڵگەنامەی ژمارە ١٥٨) ی ناردووە بۆ وەزارەتی ناوخۆ و نووسیویە (...تکا دەکەین بەرنامەی کار بدەن بە حکومەتی هەمەدان، کە ڕێگە لە ڕەفتاری دوژمنکارانەی قۆزاقەکان بگرن سەبارەت بە کاربەدەستانی ئەڵمان و لەم رووەوە حکومەت چاودێرییان بکات.) (ك١/٤٣٤٣)

به رەئی دۆستدار نەك پێویستە بەڵكو دەبێ دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، بە جیدی فەرمان بۆ دەستەكانی قۆزاق دەربكا، كە ئەوانیش لە جموجوڵی شەرخوازانە و وروژاندن خۆیان بە دوور بگرن. بەم شێوەیە دۆستدار بە هیوایە رێگە لە و گرفتانە بگرێ كە رەنگە لە هەمەدان سەرهەڵبدەن. ریزو حورمەتی دووبارەم. لەگەڵ دەقەكەدا یەكن.

(مۆر) وەزارەت كاروباری دەرەوە، بەڕێوەبەرایەتی نووسراوەكانی وڵاتانی نادراوسێ.

(ك٣/٤٣٤٣)

## (١٥٩)

**(لە حكومەتی هەمەدانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ١٦ ی زی قەعدەی ١٣٣٣)**

**بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، لە هەمەدانەوە بۆ تاران، ژمارەی تێلگراف ١٨٦، بەرواری ناردن ١٤، بەرواری گەیشتن شەوی ١٥ی میزان ١٣٣٣.**

مەقامی پایە بەرزی حەزرەتی ئەشرەف سەرۆك وەزیران، هەر شكۆدار بێ. جگە لەو كارانەی ناوشار، كە جەنابی موبارەكتان ئاگادارن، بە پێی ئەو راپۆرتانەی گەیشتوون، ژمارەیەك لە كرماشانەوە دێن و دوێنێ شەویش پلەدارێكی ئەڵمانی لەگەڵ چەند كەس هات بۆ **حاجی ناڵبەند** و چەند موجاهیدی پێشووشی لەگەڵدابوو. هەرچی زووە كارێك بكەن ئەگینا كێشە درووست دەبێت. حكومەتی كرماشانیش تا زووتر بكەوێتە كار بە قازانجی ئەم ناوچەیە دەبێت. **١٦** زیقەعدە، ژمارە **٤٨**، **عەباس**.

(٢٩٠٠٠٥٦٩٧)

## (١٦٠)

**(وەزارەتی ناوخۆ بۆ حکومەتی هەمەدان، بێ بەروار)**

**(بێ سەربەرگ) ژمارە ٦٨٦، بی بەروار.**

حکومەتی پایە بەرزی هەمەدان، تێلگرافی رەمزداری جەنابی پایە بەرزتان ژمارە **٤٤** ی، گەیشت[١].

چەند تفەنگ و پێداویستی قۆرخانەتان پێویستە، ئاگادارمان بکەنەوە. هەریەك لە کاربەدستانی بیانی دەیانەوێ هێزی خۆیان هەبێت، دەبێ تا ئەو جێگایەی دەکرێ بەپێی پێویستی بارودۆخەکە رێگەیان لێبگیردرێ، بەڵام بۆ ئەم کارەش پێویستە ئاسایشیان بە تەواوی دابین بکرێ و لە مەترسی بپارێرزرێن.

(٢٩٠٠٠٥٨٠٧)

(واژۆ)

(لە پەراوێزدا نووسراوە: بکرێتە رەمز)

## (١٦١)

**(لەحکومەتی هەمەدانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ١٦ زیقەعدەی ١٣٣٣)**

**بەرێوەبەرایەتی تێلگرافی پایە بەرزی دەوڵەتی ئێران، لە هەمەدانەوە بۆ تاران، ژمارەی تێلگراف ٣٧، بەرواری ناردن ٤، بەرواری گەیشتن شەوی ٥ی میزان ١٣٣٣.**

تاران، مەقامی سەرۆك وەزیران، وەزارەتی پایە بەرزی ناوخۆ، سایەی هەر بەردەوام بێت. سوپاس بۆ خوا شار و دەوروبەری لەوپەڕی ئاسایش دان، وەلێ کارەکانی پێشو و کۆکردنەوەی سوارەکان هەرماوە. چەند ئەڵمانییەك کە هاتوون ئەمانەن ( **مسیۆ هۆرتس، سوقمایر ویق — یەك- نایب ویق- یەك- سیرجنت)**[٢] ئەفسەرە نەمساوییەکە لە سوارەکانی چوار دەوڵەت وەردەگیرێتەوە، وەك چۆن پێشتر پێتانم راگەیاندبوو, دەبێ لە رێگەی سەفارەتەوە بکرێ. **١٦** ی زیقەعدە، ژمارە **٤٥**، **عەباس.**

---

١- لەم بەڵگەنامانەدا بەدی نەکرا.

٢- لە کردنەوی رەمزی ناوەکانی ناو کەوانەکەدا، لە سوقمایر= زوگمایر بەولاوە ناوەکانی تر روون نین.

(ك٢٩٠٠٠٥٧٩٥).

## (١٦٢)

**( له حکومەتی گەڕووسەوە بۆ سەرۆك وەزیران، ٢٠ زیقەعدەی ١٣٣٣)**

**بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، له گەڕووسەوە بۆ تاران، ژمارەی تێلگراف ١٢، بەرواری ناردن ١٧، بەرواری گەیشتن شەوی ١٣٣٣.**

مەقامی پیرۆزی بەندەکانی حەزرەتی ئەشرەف، جەنابی سەرۆك وەزیران و وەزیری ناوخۆ، هەر شکۆدار بن. لێبڕاوانە داواکارم پرسی ئەم ماوەیە بەسەر بکەنەوە، بە تایبەتی لەم کاتەدا کە جەنابی **سەردار محی** هاتۆتە تاران و سەری ئێوەی داوە، تا کار لە کار نەترازاوە و دەوڵەت و میللەت تووشی ئەزییەت و زیانگەلی پۆلیتیکی ئەوتو نەبوون کە چارەسە نەکرێن، بفەرموون بایەخی تایبەتی و بەپەلەی پێ بدەن. کورتەی راپۆرتی گەیشتوو ئەوەیە، کە **مەحمود خانی مەریوانی** بە هێزێکی زۆر و سوارەوە، هاتۆتە **دیواندەرە** و بە یاوەری خراپکارانی ئەو سنوورە، بەو ناوەی کە دەبێ بەرەو **زنجان** و خاکی **خەمسە** بڕۆین، بە ئیشارە و رێنوێنی سیاسەتی دەرەکی کە پێویست بە باس کردن ناکات، دەیانەوێ بەرەو **گەرووس** بێن و هێرش بکەنە سەر **بیجاڕ**. داواکارم هەر ئێستا ئەگەر دەوڵەت لەبەر هۆکاری سیاسی، ناتوانێ قۆزاق بۆ کوردستان بنێرێ ، لانی کەم بە پەلە سەت یاسەت و پەنجا پۆلیس و یەك دوو تۆپ، لە هەمەدان یا زنجانەوە لە ماوەی چوار پێنج رۆژدا لە گەڕووس ئامادە بن، کە ئەگەر بکرێ سی چل رۆژێك لەم دەڤەرەدا بمێننەوە، هەروەها بە پەلە فەرمان بە وەزارەتی پایە بەرزی دارایی بکەن، کە فەرمانی جیدی بۆ بەڕێوەبەرایەتی دارایی گەڕووس دەربکا، تا پۆلیس دەگات لە فکر و چارەسەریی ئەم سنووره دابێ، مووچەو دەرماڵەی سەت و پەنجا سەرباز و بەرپرسێك ئامادە بکات، بەڵکو بتوانم لەم رێگەیەوە تا هێزی تەواو دەگات رێگەیان لێبگرین و چارەسەری کێشەکە بکەین، دەنا بەندە هیچ رێگەیەکی تر شك نابەم. راشکاوانە بە خزمەتتان رادەگەیەنم، ئەگەر سەرکردایەتی دەوڵەت یەك تۆز کەمتەرخەمی بکات، بەندە خۆم بە بەرپرسی هیچ شتێکی ئەم ویلایەتە نازانم. بۆ تەواو کردنی زانیارییەکانی سەرکردایەتی دەوڵەت، دەقی نامەی **حاجی فەتحولمولکم** هەر ئەمرۆ بە پۆستادا بۆ ناردن. ٧ی میزان، ژمارە ٤٠٠، **موشیر ولسولتان**.

(٢٩٠٠٠١٢٦٠)

## (١٦٣)

**(لە حکومەتی هەمەدانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ٢٠ی زیقەعدەی ١٣٣٣)**

**بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، لە هەمەدانەوە بۆ تاران، ژمارەی تێلگراف ١٠٥، بەرواری ناردن ٨، بەرواری گەیشتن ٩ ی میزانی ١٣٣٣.**

تاران، مەقامی پایە بەرزی سەرۆکایەتی وەزیران و وەزیری ناوخۆ سایەیان هەر بەردەوام بێ. بە پشتیوانی خوا شار و دەوروبەری لە هەر روویەکەوە رێك و پێك و خەڵك لە ئاسایشی تەواو دان، شتێکمان بەدەستەوەیە بە ویستی خوا دوای کۆتایی جێبەجێ کردنی بە خزمەتتانی رادەگەیەنین، بە پێی گرێبەستێکی فەرمی رەنگە کونسوڵی رووس سی سواری رووسی کە ماوەیەك لەمەوبەر هێناونی مۆڵەتیان بدات بڕۆن و کونسوڵی ئەڵمانیش واز لە بەکرێ گرتنی سەربازی سوارە بێنێ. هەر ئەوەشم بۆ کونسوڵی رووس نووسیوە، پەسەندی کردووە و بە جەنابی **شەریعەتمەداری** دا کە رێکخەری گفتوگۆکانن، پەیامی ناردووە لە بەدواداچوون و تەواو کردنی ئەم پەیمانە غافڵ نییە، تا ئینشائەڵڵا ئەنجام بدرێ. ئەگەر لەلایەن وەزارەتی کاروباری دەرەوە لە ناوەندەوە جەخت لەسەر ئەم گفتوگۆیانە بکرێتەوە، کە سی قۆزاقی رووسی بڕۆن و ئەڵمانییەکان سوارە بەکرێ نەگرن، رەنگە زووتر ئەنجامی هەبێت، ئەگەر بەپێویستی دەزانن بەدواداچوون بۆ ئەم گفتوگۆیانە بکەن، تا جێگەیەك بۆ نیگەرانی نەمینێتەوە. ٢٠ ی **زیقەعدە**، ژمارە **٤٦**، عەباس.

(٢٩٠٠٠٥٧٧٩).

## (١٦٤)

**(لە حکومەتی هەمەدانەوە بۆ وەزارەتی دەرەوە، ٢٧ی زیقەعدەی ١٣٣٣)**[١]

**بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، لە هەمەدانەوە بۆ تاران، ژمارەی تێلگراف ٤٢، بەرواری ناردن ٣، بەرواری گەیشتن ٣ ی عقرەب ١٣٣٣.**

مەقامی پایە بەرزی وەزارەتی کاروباری دەرەوە، هەر شکۆدار بێ. بە کلیلی وەزارەتی پایە بەرزی ناوخۆ رەمزەکان بکەنەوە. تێلگرافی موبارەکی ژمارە **٥٥٦** ی کارگێڕیمان زیارەت[١]

١- بەرواری تێلگرافەکە زی حەججەیە، بەڵام ژمارەکەی لە تێلگرافخانە زی قەعدەیە.

کرد، سوپاس بۆ خوا بارودۆخی هەمەدان رووی لە باشتر بوونە، بە پێی فەرمانی دەوڵەت سەت سوار ئامادە کراون و بە جیدی نەزمی شار و دەوروبەریان پاراستووە، ژمارەیەکیش دەیانەوێ لە **تەورێز**ەوە بێن و هەشتا پۆلیسیش هاتوون. ئەو سوارانەی بەکرێگیراوی ئەڵمان بوون، نیوەیان بڵاوەیان لێ کردووە، هەروەها سەرنجی موبارەکتان بۆ تێلگرافی رەمزداری ژمارە **٥٠** ی نێردراو بۆ وەزارەتی پایە بەرزی ناوخۆ[٢] رادەکێشین. ١٧ ی زی حەججە، ژمارە **٥١**، **عەباس سالار لەشکر**.

(ك٢٩٠٠٠٥٥٢)

## (١٦٥)

**(لە حکومەتی هەمەدانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ١١ی موحەڕەم ١٣٣٤)**

**بەرێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، لە هەمەدانەوە بۆ تاران، ژمارەی تێلگراف ٣٥٩، بەرواری ناردن ٢٧، بەرواری گەیشتن ٢٨ ی عقرەب ١٣٣٣.**[٣]

مەقامی پایە بەرزی وەزارەتی کاروباری ناوخۆ، سایەی هەر بەردەوام بێ. سوپاس بۆ خوا ئاسایش بەرقەرارەو راپۆرتێکمان نییە شایانی پێڕاگەیاندن بێ، تەنیا ئەوە نەبێ بە پێی راپۆرتێکی تێلگرافی، نزیکەی دوو هەزار سواری کراماشانی و هیتر کە بەکرێگیراوی ئەڵمانین، چوونەتە ناو **کەنگاوەر** دەیانەوێ بەرەو **هەمەدان** بڕۆن. **١١** ی موحەڕەم، **ژمارە ٥٤**، عەباس.

(ك٢٩٠٠٠١٠١)

---

١- لەم بەڵگەنامانەدا بەدی نەکرا.

٢ - بەڵگەنامەی ژمارە ١٥٥.

٣- بەرواری چاپکردن هێشتا لەسەر فۆڕمی تێلگرافخانە، ١٣٣٣ یە.

## (١٦٦)

**(لە حکومەتی هەمەدانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ١٢ی موحەڕەمی ١٣٣٤)**

**بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، لە هەمەدانەوە بۆ تاران، ژمارەی تێلگراف ٣٦١، بەرواری ناردن ٢٧، بەرواری گەیشتن ٢٨ ی عقرەب ١٣٣٣.**

مەقامی پایە بەرزی وەزارەتی ناوخۆ، سایەی هەر بەردەوام بێ. سوپاس بۆ خوا، شار و دەوروبەری لە ئاسایش دان، وەلێ بەپێی ئەو زانیارییانەی یەك بەدوای یەكدا پێمان دەگەن و بەردەوام هێز لە هەموو لایەكەوە روو لە هەمدان دەكەن، لەوانە ئەو دوو هەزار كەسەی دوێنێ بە راپۆرت بە خزمەتتانمان راگەیاند، هاتنە ناو **كەنگاوەر** و، **عەبدوڵڵاخانی سەنقەری** بە بیست سوار و چەند باری قۆڕخانەوە، لە رێگەی تەورێزەوە هاتنە ناو **خۆشاب** و بەروەو **هەمەدان** دێن و پێویستە داوا بكەم لەبەرئەوەی بارودۆخەكە رێكار و بەرنامەیەكی گرنگی هێناوەتە ئاراوە، سەقامگیری و بەردەوامی ئاسایشی ئێرە، پەیوەستە بە هەوڵەكانی ناوەندەوە. **مێجەر چلیسترم** و سەرۆكی دامەزراوەی دارۆغای **قەزوین**، چەند رۆژێكە هاتووە بۆ هەمەدان، هەموو ئەو پۆلیسانەی لە خاڵەكانی رێگادابوون گشتیانی لابردووە. تكا دەكەین لە ناوەندەوە بەپەلە هەر هەنگاوێك بنێن، كە بەباش و كاریگەری دەزانن، تا پێچەوانەكەی روو نەدات و جەخت لە بەڕێوەبەرایەتی پۆلیس بكەنەوە، كە بە تەواوی چاودێری رێكخستنەوە و پاراستنی نەزم بن. ژمارەیەكیش پۆلیس بەرەو هەمەدان وەرێكەوتوون و دوور نییە ئەمڕۆ بگەن. ١٢ موحەڕەم، ژمارەی **٥٥**، **عەباس**.

(٢٩٠٠٠٨٧)

## (١٦٧)

**(لە حکومەتی هەمەدانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ١٣ی موحەڕەمی ١٣٣٤)**

**بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، لە هەمەدانەوە بۆ تاران، ژمارەی تێلگراف ٣٨١، بەرواری ناردن ٢٨، بەرواری گەیشتن ٢٩ ی عقرەب ١٣٣٣.**

مەقامی پایە بەرزی وەزارەتی ناوخۆ، سایەی هەر بەردەوام بێ. لە راپۆرتی پێشوودا پێمان راگەیاندن، کە ئەم دوو سێ رۆژەی عاشورا زۆر بەخۆشی و نەزمەوە تێپەڕی، لە کاتێکدا کونسوڵەکان بەردەوام نیگەرانی خۆیان دەردەبڕی و نامەیان دەنووسی، تا رووداوێکی ناخۆش روو نەدات. لەگەڵ ئەوەشدا **مسیۆ کۆدار**، سەرۆکی بانکی قەرز، ئەمڕۆ بێ ئاگادارکردنەوە وەرێکەوتووە. وەرێکەوتنی ناوبراو هاوکاتە لەگەڵ دەنگۆی خەستی وەرێکەوتنی سوپای رووس بەرەو هەمەدان و چەند سواری ئەڵمانیش لە **کەنگاوەر** کۆبوونەتەوە، ئەمەش گرنگە و خەڵکی نیگەران کردووە و زانایان و چین و توێژەکان بەردەوام رای خۆیان بۆ دەوڵەت دەردەبڕن. کونسوڵەکانی رووس و ئینگلیزیش، نامەی فەرمیان بۆ حکومەت ناردووە و داوایان کردووە هەنگاو بنێ، کە کورتییەکەی ئەوەیە: بە پشتیوانی قۆزاق و پۆلیس جگە لە هێزەکانی دەوڵەت، کەس چەکدار نەبێ. لەبەرئەوە **مێجەر چلیسترم** بانگ کردوو، لەبارەی تێکڕای ئەم بابەتانەوە گفتوگۆی زارەکیمان کرد، ناوبراو بیر و رای خۆی لەم رووەوە خستە روو و دەڵێ: ئەگەر دڵنیا بێت سوپای رووس لە قەزوینەوە بەرەو هەمەدان نایات، بەرپرسی تێکڕای بەرپرسانی دەرەکی هەمەدان وەئەستۆ دەگرم و بەڵێنیش دەدەم لەگەڵ کونسوڵی ئەڵمان قسەم بکەم، کە سوارە بەکریگیراوەکانی ئەڵمانی بە چەکەوە لە ناوشاردا نەگەڕێن. ئیستاش لەم بارەیەوە لەگەڵ کونسوڵخانەی رووس گفتوگۆ دەکەم، وەلێ لەبەرئەوەی کات لەدەسدان بە باش نازانم، بە پێویستم زانی بارودۆخەکەتان پێڕا بگەیەنم و تکا بکەم بە پەلە بێ دواکەوتن لەگەڵ سەفارەتی رووس گفتوگۆی پێویست ئەنجام بدەن و، دڵنیا بن کە سوپای رووس بەرەو هەمەدان نایەت و، فەرمان بە سەرۆکی گشتی پۆلیس بکرێ کە **مێجەر چلیسترم** ئاگادار بکەن کە سوپاری رووس بۆ هەمەدان نایەت، تا مێجەر ئەو هەنگاوانە لە سەرەوە پێمان راگەیاندن جێبەجێیان بکات. لە لایەن سەفارەتی ئەڵمانەوە بە تێلگراف جەخت لە کونسوڵی هەمەدان بکرێتەوە تا بڵاوە بە کۆبوونەوەی کەنگاوەر و هیتر بکات و ئەگەر بەپەلە ئەم هەنگاوان نەنرێن، بە دڵنیاییەوە ئەو کێشانەی لە رادەبەدەر قورسن، دروست دەبن. **١٣** موحەرەم، ژمارە **٥٤**، عەباس.

(٢٩٠٠٠١٠٤)

## (١٦٨)

**(لە حکومەتی هەمەدانەوە بۆ سەرۆك وەزیران، ١٤ی موحەڕەم ١٣٣٤)**

**بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران، لە هەمەدانەوە بۆ تاران (بێ ژمارەی تێلگراف و بەرواری ناردن)، بەرواری گەیشتن ٣٠ی عقرەب ١٣٣٣.**

مەقامی پایە بەرزی سەرۆکایەتی وەزیران، سایەی هەر بەردەوام بێ. زیارەتی تێلگرافی موبارەکتانمان کرد[1]. هەرچەندە، چەند جارە جەنابتانمان ئاگادار کردۆتەوە، بۆچوون و پێداویستییەکانی خۆمانمان بە خزمەتتان ڕاگەیاندووە و ئێستاش زاتی ئەوە دەکەین، کە لەلایەك بڵاوبوونەوەی سوپای ڕووس ڕابگەیەنین و لە لایەکی تر، کۆبوونەوەی سوارە بەربڵاو و بەکرێگیراوەکانی ئەڵمان، کە لە ناو شار ژمارەیان دەگاتە هەزار سوار و پەیتا پەیتا لە **تویسرکان** و **کەنگاوەر**ەوە دێن. لە ڕای گشتیش جەنابتان ئاگادارن و ئەم هێزە دژپێکانە، کە گوێ لە حکومەتی محەلی ناگرن، ڕووداوەکەی دوێنێ شەویش کە-[2] بووە، بە جیدی دەبێ کارێکی وا بکرێ، کە لە ناوەندەوە هەوڵ بدرێ سەفارەتی ئەڵمان، جەخت لە کەنسولخانەکەی بکاتەوە و سوپای ڕووسیش بەرەوە هەمەدان نەیەت، ببێتە هۆی ئاڵۆزی پتر، کە بە تێپەڕینی کات ئەم ڕووداوە چارەسەر دەکرێ و دڵان ئاسوودە دەبن و نێوبژیوانی قۆزاق و پۆلیسیش بکرێ و ملکەچی بن، ئەوپەڕی هەوڵ بدرێ چارەسەر بکرێ. تکا دەکەین چارەسەرێك بکەن ئەگینا دەبێ چاوەڕوانی گرفت و زەحمەتی زۆرتر بین و کار لەکار دەترازێ. بەندە ڕاشکاوانە دەڵێم چارەسەرەکە بە مسۆگەری بەم دوو برگەیەوە بەستراوەتەوە: یەکێکیان تێلگراف کردنی سەفارەتی ئەڵمان بۆ کونسوڵی هەمەدان و ئەویتر بە نەهاتنی سوپاری ڕووس بۆ هەمەدان. ئینجا سەقامگیری نەزم و ئاسایشی هەمیشەیی دەستەبەر دەبێ.

١٤ موحەڕەم، ژمارە ٥٨، **عەباس**.

(٢٩٠٠٠٥٧٩٢).

---

١- لەم بەڵگەنامانەدا بەدی نەکرا.

٢- دوو وشەی نەخوێندرایەوە.

(١٦٩)

**(راپۆرتی تێلگرافیی هەمەدان، ٢٥ ی موحەڕەمی ١٣٣٤)**
**٣٠ عەقرەب (٢٥موحەڕەم)، هەواڵەکانی ناوخۆ.**

هەمەدان، پاش نیوەڕۆ **مێجەر چلیسترم**، سەرۆکی پۆلیس و **ئەریکسۆن**، سەرۆکی دارۆغای **قەزوین** لە تێلگرافخانە ئامادە بوون و، دوای تەواو بوونی تێلگراف لە حاڵەتی دەست لە کارکێشانەوەدا رۆیشتن. چەند کەسێك کە ئاگایان لەو رووداوە بوو، خەڵکیان ئاگادار کردەوە و شادی و خۆشییەکی زۆر لە ناو خەڵکدا پەیدابوو، چەند قۆزاقێك لە ماڵی میرزا سەید **محەممەدی** تەباتەباییـ ۆ ژمارەیەکیش لە پۆلیسخانە و هێندێکیش بڵاوەیان لێکردووە و سەت و چل کەسیشیان لە کاروانسەرا دەسگیر کراون. چەند کەس لە زانایانی دینی و ئەشراف لەمبارەیەوە گفتوگۆیان لەگەڵ حکومەت کردووە. لە کۆتاییدا بڕیاردرا ئەم چەند کەسە لەبەر ئەوەی گیانیان پارێزراو نییە، چەکەکانیان بە ئاگاداری حکومەت لە دارایی دابنێن و ئازادن. ئەمشەو جەعفەر قولی خان پلەداری قۆزاق، وەك میوان بۆ ماڵی **میرزا عەبدولوەهاب** رۆیشتووە، کە یەکێکە لە زانایانی دینی هەمەدان، قۆزاقەکان ترساون و بڵاوەیان لێکردووە.. دووسەت سوار و سێسەت پیادە بە ناوی موجاهید و پیاوانی کونسوڵی ئەڵمان دوای نیوەڕۆ، لە **تویسەرکانەوە** هاتن بۆ **هەمەدان** گوایە چوارسەت کەسی تریش دواتر هاتوون. هەر رۆژە ژمارەی سوارەکانی ئەڵمانی و موجاهید پتر دەبێت. کونسوڵەکانی رووس: **چرکاسۆف** و **کیرسانۆف** و بەشەکانی بانکی رووسیا، بە ئەمانەتنامە و پێنج پۆلیس و قۆزاقەکانی رووسەوە، بێ ئەوەی چەك بکرێن پاش نیوەڕۆ بەرەوە **قەزوین** وەڕێکەوتن. بڕیار درا کونسوڵەکانی ئینگلیزیش سبەینێ بڕۆن. رووس و ئینگلیزەکان گوشاریان لەسەر نییە.

**ئەحمەد شیبانی.** (ك١/٥٣٠٦)

## (١٧٠)

**(راپۆرتی هەمەدان)**

هەمەدان، دوێنیٚ شەو کاتژمێر شەش، سەت و سی تفەنگی قۆزاق و یەك مەترالیۆز، رادەستی **سدیق** نووسینگەی سەرۆکی پشکێنەری دارایی کرا. **مێجەر چلسترم** لەگەڵ چەند سوار و پیادە رۆیشتوون بۆ ناشتنی تەرمی پۆلیسە کوژراوەکە. **ئەحمەدی شیبانی**

(ك٦٠٤٥/٦)

## (١٧١)

**(راپۆتی هەمەدان)**

هەمەدان، **سالار لەشکر** حاکمی هەمەدان، تێلگرافێکی ناردووە، کە لەبەر گرنگی پێویستی بە روون کردنەوەیە. ئەگەر جەنابی **فەرمانفەرما** سبەینیٚ رۆژی هەینی ئامادە نەبێت، دەبێتە هۆی پەشیمانی. قوزاقەکان مۆڵەتیان پێدراوە و ئەمڕۆ لە ژێر چاودێری بەرێوەبەرایەتی پۆلیس، رەوانەی **تاران** کران. خەڵکی هەمەدان بە خۆشی و شادییەوە بیٚ دوا کەوتن خەریکی ئامادەبوون و نیشتمان پەروەرین، کاتی نیوەڕۆ وەك بە خزمەتتانم راگەیاندبوو کە هەزار پۆلیس دێن، بەڵام دەرکەوت ئەوانە هەزار و حەوسەت کەس و هەشت تۆپ و نزیکەی چوارسەت باری قۆرخانەن. خەڵك بە خۆسەویستی لەرادە بەدەر پێشوازییان لێکردن، بە شکۆوە لە ژێر فەرماندەیی **مێجەر دومارە،** هاتنە ناوشار و خەڵك پیرۆزباییان لێکردن.

**ئەحمەد شیبانی**

(ك٦٠٣٥/٢)

## (١٧٢)

**(راپۆرتی هەمەدان، ٢٧ ی موحەڕەمی ١٣٣٤)**

راپۆرتی هەمەدان، **٢**ی قەوس (٢٧ ی موحەڕەم) خەڵك **ئەمیر ئەفخەم**[١] یان لە شار راگرتووە، تا هێزەکەی ئامادە بکات بۆ بەرەنگاری رووسەکان، کە گوایە بەرەو هەمەدان کەوتوونەتە رێ. لە بەیانییەوە خەریکی گفتوگۆن. هەزار کەس.

(ك٥٣٠٦/٥)

## (١٧٣)

**(راپۆرتی هەمەدان، ٢٨ ی موحەڕەمی ١٣٣٤)**

**بەرێوە بەرایەتی تێلگرافی دەوڵەت پایە بەرزی ئێران، رپۆرتی هەمەدان ٣ ی قەوس (٢٨ موحەرەم)**

دوێنێ شەو سالار لە شکری فەرمانڕەوا، زۆر بە پەلە داوای دەکرد بە تێلگراف قسە بکات و لەگەڵ مێجەر دومارە لە تێلگرافخانە ئامادە بوو تا لەگەڵ تاران گفتوگۆ بکات. وەك دوێنێ شەو بە خزمەتتانم راگەیاند و دووبارەی دەکەمەوە، ئەگەر ئەم گفتوگۆیە نەکرێ و چارەیەك دیاری نەکرێ، پەشیمانیی بەدواوە دەبێ. شار لە ئەمن و ئەمان دایە. بەردەوام هێز بۆ **هەمەدان** دێت. بەردەوامیش هێز رەوانەی **قەزوین** دەکرێ بۆ بەرەنگاری سوپای رووس. خەڵکی هەمەدان کە باوڕ نەدەکرا ئەوەندە گەرموگوەڕ بن، بە شەوق و شادییەوە کۆدەبنەوە و خەڵك هان دەدەن. هەورە و کەمێك باران دەبارێ. **ئەحمەد شیبانی**.

(٥٣٠٦/٤)

---

١ - مەبەست ئەمیر ئەفخەمی قراگوزلوی هەمەدانی یە.

(١٧٤)

**(راپۆرتە تێلگرافی ئەراك: ربیعولسانی ١٣٣٤)**

**بەڕێوەبەرایەتی تێلگرافی دەوڵەتی پایە بەرزی ئێران. راپۆرتی هەمەدان بەیانی ٣ ی قەوس (٢٨موحەڕەم)**

(یەکەمی حوت/ ١٦ی رەبیعولسانی) عێراق: لای ئێوارە نزیکی پێنسەت قوزاق بە چوار تۆپەوە لە رێگەی **مەلایەر** و **هەمەدانەوە** هاتن. پەنجا شەست کەسیش بە جلوبەرگی رەعییەتەوە، کە چەند ولاغیان پێبوو گەیشتن، دەرکەوت کە کێن و لە کوێوە دێن. **فەتحوللا**.

٧ ی حوت (٢٢ ی رەبیعو لسانی) عێراق: ئۆردووی رووس لەسەر رێگەی هەمەدانە تا دەگاتە **بروجەرد** و **مەلایەر** و **نەهاوەند**، وەك دەڵێن لە دەوروبەری شاری بروجەرد، یەك دووجار بە گۆپاڵ شەڕێکی سەخت روویداوە. موجاهیدەکانیش پێش هاتنیان بۆ بروجەرد، بە رێگەی **خوڕەم ئاباد**دا رۆیشتوون بۆ **هەرسین** و **کرماشان**. **هەژیر و لسەڵتەنە** و سوارەکەی، **سالار موعەزەم** کوڕی **ئەمیر موفەخەمی** بانگهێشت کردووە بۆ ماڵی خۆی و، گوایە **یەدوڵلاخان** کوڕی **ئەمیر موفەخەم** لەگەڵ دووسەت سوار بەرەو کرماشان رۆیشتوون. سەرۆکی ئۆردوو ماوەیەك لە مەوبەر لە عێڕاقەوە بەرەو کەمەرە رۆیشتووە.

(١٠ ی حوت) عێڕاق: سەرۆکی ئۆردوو لەگەڵ ئەوانەی رۆیشتبوون ئەمڕۆ گەرانەوە و هاتنە ناو شار. فەتحوللا.

(ك٥٠٩٤/ ١و ٢ و ٣)

## (١٧٥)

**(له حکومەتی کوردستانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ٢١ جەمادی دووەمی ١٣٣٤)**

**حکومەتی کرماشان و دەوروبەری، ژمارەی ٦٣، بەرواری ٢١ ی جەمادی ئاخر ١٣٣٤.**

مەقامی پایە بەرزی وەزارەتی ناوخۆ، هەرشکۆدار بێ. ئەو عەریزیەی کەسوکاری دیلەکانی کوردستان نووسیویانە، وەك خۆی پێشکەش بە جەنابی موبارەکتانم کرد. ئەگەر رەئی موبارەکتانی لەسەر بێ ئاورێکیان لێبدەنەوە، کە بەرەئی موبارەکتانەوە بەندە. **حاجی ئەبولحەسەن**.

مەقامی پایە بەرزی وەزارەتی ناوخۆ، هەر شکۆ دار بێ. دوو مانگ لەمەوبەر، دوو کەس بە ناوی ئەوەی کە ئەڵمانین هاتن بۆ کوردستان و چەند کەسێکی کوردستانیان فریودا و ئەوانیش بە سواڵکردن و وەدەستهێنانی پارووە نانێك بوونە نۆکەر، ئەوانەیان نارد بۆ **بیجار**. دوو هەفتە لەمەوبەر لە رۆژنامەی **رەعد**، مژدەی ئازاد بوونی بەندکراوەکانیان[1] دا، کە بوو بەهۆی سوپاس و دوعاگۆی هەمیشە بۆ مەرحەمەتی حەزرەتی ئەشرەف، چاو لەرێ بوون، وەلێ تا ئێستا هەواڵی ئازاد کردنی گیراوەکان نییە، بۆ رەزایەتی خوای زانا و پێغەبەر (د. خ) و دڵ شکاوی ئەسیرانی کەربەلا، روحمێك بەم کۆمەڵە بێکەسانە بکەن و گیراوەکان بە دایکە بێ کەسەکانیان شاد بکەنەوە، بەڵکو ببێتە هۆکاری پارووە نانێکی ئێمەی بێوەژن و لە برسان نەمرین، پەنامان بۆ دەرباری موبارەکتان هێناوە و بۆ خاتری رەزایەتی خوا، بفەرموون ببنە هۆکاری رزگار بوونی گیراوەکان، تا بۆ هەمیشە دوعاگۆی دەوڵەت و دەباری موبارەك بین. بنەماڵەی گیراوەکان چاولەرێن:

**کار بر بیوه زنان گشته است سخت    اگر ترحم میکنی وقت است و وقت.**

فەرمان، فەرمانی جەنابی موبارەکتانە.

(ك ٦/١٩٦٢ و ٨)

---

١ - لە دەقەکەدا ئوسرا نووسراوە.

## (١٧٦)

**(له وەزارەتی ناوخۆوە بۆ حکومەتی کوردستان، کۆتایی جەمادی ئەلسانی ١٣٣٤)**

**وەزارەتی ناوخۆ، ژمارەی تۆماری نووسراو٤٢٣/ ٢٢٥٦: لەتارانەوە بۆ کوردستان، کۆتایی مانگی جەمادی ئاخ ١٣٣٤.**

حکومەتی پایە بەرزی کوردستان، نامەی جەنابتان بە ژمارەی (**٦٣**)[١]، کە عەریزەی ئەو گیراوانەی کوردستانە کە لە **قەزوین** زیندانی کراون، گەیشت و لەبەر چاو گیرا و وەڵامەکەشتان پێ رادەگەیەنین. بە بایەخ پێدان و روحمی حەزرەتی ئەشرەف جەنابی سەرۆك وەزیران، شکۆی بەرزی هەر پایەداربێ، گیراوەکان بەربوون و ئازاد کراون، دیارە ئێستا کەسوکاریان ئاگادارن و پێشتر پێیان راگەیەنراوە.

(ك١٩٦٢/٢٠)

## (١٧٧)

**(له وەزارەتی ناوخۆوە بۆ حکومەتی قەزوین، کۆتایی جەمادی ئاخر ١٣٣٤)**

**وەزارەتی ناوخۆ، ژمارە تۆماری نووسراو ٢٣١٠/٤٤١ لە تارانەوە بۆ قەزوین، بەرواری کۆتایی مانگی جەمادی ئاخر ١٣٣٤.**

حکومەتی شکۆمەندی قەزوین. دە دوانزە کەسی خەڵکی کوردستان کە بە یاخی و خراپکار لەقەڵەم درابوون، لە دەوروبەری قەزوین دەسگیر و ماوەیەکە بەند کراون و ماوەیەك لەمەوبەر بە پێی گفتوگۆی حەزرەتی ئەشرەف جەنابی سەرۆك وەزیران، سایەی هەر بەردەوام بێ، ئەو گیراوانە بەرەڵڵا و ئازاد کراون، پێویست بوو ئەوانە بگەڕێنرێنەوە بۆ ویلایەتەکانی خۆیان. بەڵام بەو پێیەی لە کوردستان کەس و کاری ئەو گیراوانە لە نامەیەکدا رایان گەیاندووە هەواڵی ئازادبوونی ئەوانە بەوێ نەگەیشتووە. ژن و منداڵی ئەوانە پەرێشان و ترسیان هەیە،

---

١ - بگەڕێوە بۆ بەڵگەنامەی ژمارە ١٧٥.

جەخت لە حکومەتی شکۆمەند دەکەنەوە، کە بە خێرایی لێکۆڵینەوە لە حاڵی ئەو گیراوانە بکرێ و ئەنجامەکەشی بە وەزارەتی ناوخۆ رابگەیەنن.
(ك٢١/١٩٦٢)

## (١٧٨)

**(لە حکومەتی قەزوینەوە بۆ وەزارەتی ناتوخۆ، ٦ی رەجەبی ١٣٣٤)**

**حکومەتی قەزوین، ژمارە ٧٠١، بەرواری ١٧ ی بورجی گا (٦رەجەب) ١٣٣٤.**

مەقامی پایە بەرزی وەزارەتی ناوخۆ، هەر شکۆدار بێ. نامەی ژمارە (٢٣١٠/٤٤١)[١]، سەبارەت بە دوازدە کوردستانییە گیراوەکە، کە لە قەزوین بەسەرمان کردنەوە، بۆ روونکردنەوە بە خزمەتتان رادەگەیەنین، ئەو گیراوانەی پێشوو کە بە فەرمانی حەزرەتی ئەشرەف ئەقدەس سەرۆك وەزیران، گەورەیی هەر بەردەوام بێ، ئازاد بوون، چەند پۆلیس و چەند کەسێکیان خەڵکی **مەلایەر و تویسەرکان** بوون، خەڵکی کوردستانیان لە ناودا نەبوون. چەند رۆژ دوای ئازاد کردنی بەند کراوەکانی پێشوو، شەست کەسیان هێنا بۆ **قەزوین**، کە زۆربەیان کوردستانین و رووسەکان دەیانەوێ سبەینێ رەوانەی **بادکۆبە**یان بکەن. (مۆر) حکومەتی قەزوین.
(ك١٧/١٩٦٢)

---

١- بگەڕێوە بۆ بەڵگەنامەی ژمارە ١٧٧.

